# گەنجینەیا زمانێ کوردی

## ٢

بەرهەمێن کوردێن یەکیتییا سۆڤیەتێ

ب سەرپەرشتییا:
تۆسنێ رەشید

# گەنجینەیا زمانێ کوردی

## بەرهەمێن کوردێن یەکیتییا سوٚڤیەتێ

**بەرگی دووەم**

ب سەرپەرشتیيا:

تۆسنێ ڕەشید

گەنجینەیا زمانێ کوردی - بەرگی دووەم
ب سەرپەرشتییا: تۆسنێ ڕەشید
کتێبی ئاراس ژمارە: ١٢٨١
چاپی یەکەم ٢٠١٢
تیرێژ: ٦٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ٥٦٣ - ٢٠١٢
نەخشاندنی ناوەوە و رازاندنەوەی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: عەلی شێخۆ

ژینک:
ژمارەی پێوانەییی ناودەوڵەتیی کتێب
ISBN: 978-9966-487-48-5

## سەرهەڤا پەرتووکان

خوەندەڤانێد کورد شێر ێد تاهارێ برۆڕا ناسن. عەفراندنێد وی بەرهەڤۆکێد نڤیسکارێد کوردێد سۆڤێتیێیە باشقە-باشقەدا و ئوسا ژی ڕووپێلێد گازێتا دا ب زمانێ کوردی، ئووروسی، ئەرمەنی و گورجی هاتنە چاپکرنێ.

ئەڤا جارا ئەولن ئە، کو شێر ێد تاهارێ برۆ ب زمانێ کوردی ب کتێبەکە باشقە ڤا ڕۆنکایی دبینن. ڤرا هیملی شێر ێد وەتەنحزیێ و حوب-حزکرنێ هاتنە جیوارکرنێ.

## ڕیا لێنین

شەمۆیێ کورمانج بیرا خوە ئانی
جاهلتیا خوە و ڕۆژێ بوهوری:
باش تێ بیرا من ئەو ڕۆژێ چوویی،
سالا هڤدایە چەتن، خەلایی
پالە و گوندی دەست دان دەستێ هەڤ،
سمۆلنێ ڕێڤۆلیووسیا داخستن تەڤ.
ژ هەڤ ڤەژاندن مژ و دوومان،
و دەورا خەزەڤە دانە هلدان.
عەزمانێ عەورایی پێدا بوو سایی،
هەوا بوو جنەت، گەشی و خوەشی،
سەر سینگێ عەردێ شەوق دا عەدلایی،
ئۆکتیابرێ ئانی سەربەستی، ئازایی؛
ئونداکر قورنا ئاغا، بەگایێ جەنگ،
تەمزکر دۆر-بەرا خوبار و زەنگ.
شەوقا تەعڤێ پر دا ڕووێ عەردێ،
هلانی پەردا ڕەش، وەکە شەڤێ.
بوو خول-خولا ئاڤێد بەلەکیا،
دەنگ کەتە ئاڤێ چەما و کشیا،
تیبوونا خوە شکێناند چایر-چیمان،
خەملین مێرگ-زەڤی، باغ-بۆستان.
وەلاتێ مە بوو تاڕحانا چیان،
تەبیەت بوو حوبا شیرن دلێ جان.
و بلبل بوو ئاشقێ ڕۆژا ها شا،
عەمر گولدا، بوو چیچەکا دەڤکانییا،
شایا بوو خۆرت، قیزا بوو هەر دەما،

ڕیا ئوسا لێنین نیشانی مه دا.
نها ملەتێ منی کورد ئاوا،
دەنگەکی نازک دسترێ کلامێ خوەدا:
-بژی عەدلایی، ڕۆژا ئازایا دیندار،
شێنبە وەلاتێ سۆڤێتێ، ئەوە کاوە کوبار.

## وەلاتێ مە

بهار پر خوەش هات ئەڤ بهارا هان،
وەلاتێ مە جی-مەسکەنێ خوەش گولان.
ڕۆژا تەعف عەمرێ شا و بەختەوار،
ژ ئۆکتیابرا مەزن پێشدا هات.
پالە و گوندیا سەرێ خوە هلدان،
بەگلەر و پاشا ناڤ مەدا نەمان.
فکرا لێنینێ مەزن سەر مە شەمال دا،
عەمرێ تەزە دانی، عەمرێ کەڤن هلدا.
شۆپ و ڕێچ چارنکال بوونە لەیلان،
خەملین باغ-بۆستان، چیا و زۆزان،
مێرگ و زەڤی خوەکرن خێلیا هێشین،
بەر شەوقا ڕۆیێ ب حەواس نترین.
ئەڤە عەمرێ مە ل وەلاتێ سۆڤێتستان،
سەر پێدا بوویە ڕەز، سۆسن و ڕیحان.
ب کەڤرێ مەرمەر ئاڤابوون باژار،
شێنبوون گوند، گوندی بوون خایێ مال-حال.
و کەچێ دەلال، خۆرتێ دیندار
ئیرۆ ڕووگەشن، کەمال و نەدەر،
ئەو ژی بوونە خوەندی و دنێفەعم،

تەڤ دلشا، دەستێ خوە دانە دەستێ هەڤ،
ناهێلن شەرێ ئاتۆم بقەومە دنێ،
کاف و کوونبە کەد و ئەو هەبوونا لێ،
ژ عەردێ بگر حەتاعەرشێ عەزمان،
بڤە شەڤەرەش، بێ، برووسک و باران،
باڤێ ئاگرێ خەزمبیە تۆفان
و بڤە قیرین، هەوار و ئەمان،
ڕوو عەردێ خەزابە بەندێ ئام و تام.
نا ناهێلن ئەم ئەڤ یەکا بێ دنێ،
گەرە عەدلاییی حەمێزکە عەردێ،
چاوا دەرگووشا خوە حەمێز دکە دێ.

### هیڤیا تەیە، یازی مقەدەر

بهار ل عەردێ بوو مێڤان،
تەڤ دوشخولە عەرشێ عەزمان،
خولە-خولا ئاڤێد بەلەکیا
ب حەواس دەمەشە تێ ژ چیا.
دنێ گولڤەدایە، بوویە لەیلان،
ب نەخشە کەرگە، هەر تەرەفان.
ب کوبرا شیرن و دێمزەلال،
ب بەنگزێ کو هسون-شەمال،
ژ کوورایا دل، بێ قنیات،
بەر لاندکێ دایکا حەلال
شادبە زارا خومیە تفال،
شادبە ژ چەعڤێد ڕەشە نارین
ل دێمێ نازک، بەنگزێ شیرن:
- دنیا ڕۆن باشێ، ئەز هەیران،

عەمرێ درێژ بژی عەیسان.
ئەزێ تە فراخم، کورێ وەتەن،
خوەندنێ هینبە، ببە عەیان.
ببە فرندچییێ گەمیێ دۆرگەرێ،
پش پەڕدا عەزمین، عەرشێ ژۆرێ،
سورا تەبیەتێ بکە دیهار،
وێ سورێ بۆ عەدلایێ تێکە کار،
وەکی سەر سینگێ هیڤا زەرین،
تمێ ببە مێڤان مەری،
و هیڤێ وێدا، ب گومان
ڕێکەڤن گەمیێ وەتەن.
سدقێ قەنج سلاڤێ بدن مارس،
هەر تشتێ عەیسانڕا ببە ناس.

## هەوار داکەت

ڕۆژا
بیست یەکێ
یانڤارێ
هەوار
داکەتە دنیائێ:
-مریە لێنین
ل مۆسکڤایێ.
مە کو بهیست
مرنا لێنین،
کەتە ناڤ مە
شین و گری.
ئالاڤ بەزی

دل-هناڤه،
مريه دەرسدار،
مريه باڤه.
مريه علمدار،
مەريێ دەلال،
و نفووسدار،
مێرێ ناڤدار.

ب زاراڤێ مه
كورمانجى
خەبەرەک هەیه
برنجى:
- دنيا هەیه
خانا تژى،
بازرگانێ گران
ناڤ دا دژى،
مێر دمره،
لێ ناڤ دژى؛
دەرسدارێ مه،
تو نەمريى
حەتا هەنه
ل رِويێ عەزمین
تەعڤا گەرم
و هيڤا زەرين،
حەتا هەنه
ستەيركێ شەمال.
پێوەر و مێزين

باغ و بۆستان،
ئاڤێد بەرا،
عەمرێ شیرن،
عەمرێ ئازا،
بێن و نەفەس
ل بەر بەندا،
تو شەمدانی
ناڤا واندا...

## گورجستان

وەلاتێ شیرن، تو گورجستان،
کوردێ کۆچەر دلی بارستان،
سەر عەردێ تە کاوی-کوبار،
بن عەرشێ شین بوو بەختەوار.

بوونە سەردەست، بوون بنەلی،
ل تەبیەتا تە بوونە بەنگی،
بوونە خوەی ئێزن، خوەی ملک و مال،
سەر سینگێ تەی نازکی شەمال.

لێنین ئیسانرا ئازایی ئانی،
تارییا رەش سەر عەردێ هلانی،
تەرا ڤەکر رێکا شەمال،
عەرد و عەزمان تەرا کەمال.

ل هەر دەرێ شائی، حوب، عەدلایی،
بن تەعڤا تەیە گەرم، رۆناهی،
رووگەش، ملەتێ منی کوردا

بوو خوەندی، زانە، پاشلا تە دا.

و ناڤا حەمێزا عەزمانێ شین،
ل وەلاتێ مەی تێری ڕەنگین،
کێ نەبیە حەیر و مەتال،
ل ڕەوش و خەملا تە یا دەلال.

وەکی حوبو حزکرنا ئیسان،
تێ عەردێ تەی شیرن، گورجستان،
تێ تەبیەتا تە یە گول و نوور،
جی، مسکەنێ تە یە بێقوسوور.

ناڤا باغێ تەیە بینخوەش،
وا ئیرۆ بۆنا ژیینا باش
گەلە قیرێد چەعفرەشە ڕند
و خۆرتێد تەیلانە بلند،

زارێ بچووک، مەزن، ژن و کال،
دسترێن تە ڕا، وەلاتێ دەلال،
تە شادبن ب دل و جان،
وەلاتێ مێڤانحز، گورجستان.

## کۆمسۆمۆلا لێنین

دەرباز بوونە گەلە بهار و هاڤین،
بن پەنجێ تەعڤا شیرن و زێرین،
ب فێرزی گاڤددی تو، کۆمسۆمۆل،
کۆموونیزمێ تو چێدکی ل دنییا ڕۆن.

ناڤ دلێ تە دا و تامارێ ملێ زەغلا

تژی عەگیتی، خوەستن و مەرەم،
بن پەنجێ ڕۆیێ و بن بەیراقا سۆر
پێشدا هەرە، هەرە تو، کۆمسۆمۆل.

لێنین ب گۆتنێ خوە یە کەمال،
تە ڕا ڤەکر وی ڕێکە شەمال،
ب قەواتا ملێ تە بەدمو نتری
گەلە بازار، گوند، وارگێ حەزار گولی.

شێنایا وان نوورا بوویە نەخش، ڕوومەت،
تە ڕا بوویە حەزار نیشان و هورمەت.
ل سەر تە بلند بەیراقا لێنین ئال،
کو تە دبە بەرب ئاخرییا شەمال.

## دلۆ، شابە

دلۆ شابە مینا جارا،
گولان هاتیە ل وان وارا.

کەلا حوبێ تو خوە ڕاکە،
بەنگزێ گولانێ خوە شاکە.

عەیدا مە ئیرۆ گولانە،
شاهی کەت هەموو دەرانە.

پالە و گوندی ئیرۆ شانە،
بەنگزێ وان ژی ژ عەیدێ جانە.

دلێ مە ئەشقە و زەلال،
بن تەعڤا ومتەنە دەلال.

ئەم مینا گولەکە چەعڤکانییا،
پر شانە ژ عەمرێ خوە.

## کوردستان

سەر سینگێ تە مژ و دوومان،
خوونخور دیسا ڕابوونە، کوردستان!
شەری زۆرە، وەک ئاخریا دەوران،
تە ددن بەر گولان و تۆپان.
مینا گورێ دەڤ گەلیا، دەڤخوون، هار،
قەتلا گران درێژن ئەو نەیار.
خوونا مەرڤێ ئام و تام
درژە دەست قومسی نەمام.
وێران دکن لێ گوند و باژار،
خۆرت و قیزێ کەزی، ژن و زار،
ل سینگێ چیا، بەر زنارا مانە ستوخار،
ژ چەعڤێ نازک هێسر تێنە خار،
و چەعڤشل، کەزەب شەوات، دلبرین،
دگرین و دەنگ دچە عەرشێ عەزمین
گەلە چەلەنگ و فێرز و ئەرفان،
بۆنا تە، کوردستان، عەمرێ خوە دان.
نە جارەک، چاوا شرکێ ئاڤێ کانیا،
سەر شێمیکا تە خوونا سۆر درژیا.
ئیرۆ ئەولەدێ تە عەگیتن و پالەوان،
ب سەرکاریا مێرخاسێ تە بارزان،
دەستێ خوە دانە دەستێ هەڤ، چاوا برا،
ملێ خوە دانە ملێ هەڤ، وەک شێرا،

و بەر دژمن بوونە سوورا پۆلا،
بوونە سترینێ چەعقێ نەیارا.
هوون ناهێلن، وەکی باسیستێ دەڤخوون
ملەتێ کورد خوە ڕا تێکە قوول.
خوەستنا وە: کوردستان ببە ئازا،
کولا کەزەبێ گەلە وا کوورە،
ستەیرکێ ڕوو عەزمانا چقاس دوورە،
لێ نە کو وەک کوردستانا شیرن،
چیایێ بلند و ڕەوشا لێ ڕند
تەڤدا ببن یەک هەمبەری دژمن،
وەتەن دەستە باسیستا دەرینن،
چڤیک، چڤیکە، نابە بێ هێلوون،
چ ژ تە دخوەزە جەلاتێ دەڤخوون...
وەکی تە بوویە قان و قیپ-سیپ،
ژ خوە ناڤێژە لباسێ بێ پێسیر،
بەسە حەتانی کەنگێ کوردستان
ببە ئێتیم، برچی و تەنگەزار.
ببڕن زنجیرێ وان خوونخورا،
ڕێچا هوون تێدا زیارەتە وە ڕا.
ئازایی، گەشی و خوەشیا وەتەن
عەسەی وێ بێ، وە ببە مێڤان.
١٩٦٣

## بلبل

وەختەکێ بلبل
کرە چکە-چک،
ژ ناڤ بەلگێ دارێ

و هەوا هێنک:
– ئەز نادمە بەر خوە
تو ئەشقا دل،
وەکی ڕوونێم خوە ڕا
سەر باغێ بێ گول.
باغێ بێ گول
ئەشقێ ڤە ناینە،
وەکی دلێ جاهلا
سدقێ ب خاس،
ب دەنگێ منی شارووڕ
دبن حەواس،
ل ناڤا گولا
ژ گولێ نارین،
جنەت لێ دباری،
باغێ بێ گول،
بێ بلبل،
شڤێتا قرشا،
کولەشا زل.
تەنێ خەما
پێشدا تینە،
لێ گولێ نارین
ئیسانڕا مزگینە.

## قیزا کورد

مینانی شەوقا بهارێ
تێی، دەلال، دململی،
سەرێ تە ڤا ڕیشییێ شەعرێ،

هێدی-هێدی دفتلی.
ل بەر هەوێ گولیێ تە ڕەش.
چەعفێ تە ڕەش، لەوزێ تە خوەش،
مینانی گولێ چەعفکانیا،
بهارا من تەڕا کەنیا،
چاوا گولا دەرباهارێ
دبشکفی خالێ سۆر لێ،
موحبەتێ دکی دلێ مەریا،
کو ناف بژانگێ تە بارییە.
تەعفا وەتەنێ مە کوبار
دایە دێمێ تە قمەر،
دەلالیا مە، بەژن تاڕحان،
جان دبهێن، دبێژن جان.

## ل زۆزانا

بهارێ ڕۆ شەمال ددە عەزمانێ سایی،
پەنجێ وێ ڕادمووسە ئەو چیا و بانی،
جۆلێ کوردا ل زۆزانا هێورینە،
دنهێری، کۆنێ خاس-خانمی ڤەگرتینە.
فێزێ خولە-خولا ئاڤێد بەلەکیا،
ب حوب، حەواس دکشن ژ گاز-گەردەنا
چیا،
چڤانە ددن نۆلی تیرمەعرا،
لەز ژۆر دا دکشن ژ بن زنارا.
ڤی هەیامی دەر-دۆرا، مینا نەخشێ
تەڤنا،
مینا شرکێ ڕەختێ چیلان و بەدەوا،

کارێ خەملا خوە دکرن گول و سۆسنا
و موحبەت دکرن دلێ عەڤد-ئیسانا.
گاڤا کەو دکەتە بەربانگا سبێ،
جۆت ب جۆت ڤیزێد کوبار دمەشیان
ئاڤێ.
دهات دەنگێ لۆ-لۆ، دهات دەنگێ لێ-لێ.
بینا دوویێ کوچکا، یانێ نانێ سەر سێلێ.
بێریڤانێ بەشەرخوەش، چەعفرەش، دێم
کوبارا،
سەر کەدا حەلال، ب عەمرێ ئازا، دلێ شا،
نازکێ گەردەن شەبیب پەز ددۆتن،
پێرا کلامێ حوب-حزکرنێ دگۆتن.

## گۆزێ، ئەز نەخوەشم

(ب مقامێ جماعەتێ)

- گۆزێ لێ، ئەز نەخوەشێ حوبا دلم،
بۆنا تە شەڤ و ڕۆژ دفکرم.
پێشبەری من سەکنیە بەژنا تە
تەرمزێ،
دلێ من ل من ناسەکنە، بەرب تە تێ.
وەرە، لەحزەکێ ڕوونێ بال من عەڤدالی،
بۆنا چ تەیرەک ڤربە، وەردەک وی ئالی.
بەنگزێ من قولبیە، بوویە بەنگزێ مریا،
دەردێ تە ئەز نەخوەشم، نەخوەشێ ناڤ
جیبیا،
سەرێ من ئاگرە ناز بەلکیبا،
دل-هناڤێ من بوویە کوورا ئاگرا،

ئێشا من داڤێژە حەتاعەزمانی حەفتا،
دەرمانێ دلێ من تونە ل ڤان دەرا،
ل سەر دەستێ تە تاسەک ئاڤا زەلال
وێ منرا ببیا حەکیم و دەرمان.
–ئەز قوربا، کۆما باڤ و برا شەرم
دکم،
چەعڤێ خومیی بەلەک ل تە ڤەکم،
– وێ ڕۆ دەرکەتیە نیڤەکا عەزمانە،
ڕابە، ئەم هەرنە ناڤا باغێ دەلە،
گول–سۆسن شینبوونە، ئەمێ بچرپینن،
و سورا دلێ خوە ژ هەڤ ڕا ئەشکەلەکن.
– ئەڤا دنیا تو کەسی ڕا نەمایە،
دەلالۆ، وێ کو ل مە ڕا بمینە؟
لۆ، لۆ، لاوکۆ، دە تو ڕابە،
باغێ دەلە مە ڕا کەرەمە،
ئەمێ هەڤ ڕا شابن مرازێ خوە.
ژ حوبا پێشن شیرنتر تونە،
وەلە، بلە دەستێ من ژ تە نابە.

زەزێ

چ ئێڤارەکە لێ هیڤەرۆنە،
زەزێ کاو ژ مالێ دلەزینە،
ڕۆنایێ دایە سەر ڕەختێ زیڤە.

زەزێ چەعڤێ خوە کوبار هلانی،
بەژنا وێ بلند تا ڕیحانی،
باقێ ڕەشگولییا سەر خوە دا ئانی.

بن چەعڤا ڕا ئەوێ نهێری،
لاوکێ وێ ڕوونشتیە سەر کورسی،
سەری بەرژێر کریە، ئەوێ ژێ پرسی:

- خۆرتۆ، چما مرووزی، بێ ڕەنگی...
خەمگرانی، تو بەدرەنگی،
نۆلا بەرفا بەر تەعڤێ دحەلی؟

مینا کو شەڤێ-شەڤەرەشا،
ڕەنگێ تە نۆلی نەخوەشا،
چاوا هیڤ دخەیرە دەست عەورێ عەرشا.

نەکەڤە بن فکرا، وێ تە ژارکە،
دەلال، سەرێ خوە ل من هەڤرازکە،
ڕەوشا بهارێ تو مێزەکە.

بالا خوە بدێ عەنیا منە کەڤەر،
بهارە، شاییە، خەما بگوهەز،
بەژنا زراڤ تو وەرە حەمێز.

## سینۆرخوەیکرە سۆڤێتیە

بەرفا چیلە قەرقاش
گرتیە سەرێ چییا،
مژێ خوە کریە خەلەک
دەر و دۆرا.
عەورێ سپی پەی هەف
ڕێزبوونە ڕوو هەوا،
دلڤینن ژ شەرقێ

ئاليێ رۆئاڤا،
سينۆرخوەيكرێ مێرێ
كورێ مێرا،
هەم رۆستەمن، هەم زالن
بەر نەيارا،
خوەيدكن هەرتم
عەدلايا سينۆر.
يەك ژ وان عەلى يە،
كورێ كوردايى زۆر.
ب حەواس، دەنگەكى خوەش،
نۆلى سازا،
نەرمێ خوە، حوبا شيرن،
ب دلێ كوور دسترا:
– هاتيە دەوران، زەمان،
رۆژا ناڤوودەنگ،
وەلاتێ سوڤێتێ
ئەوە قاناتێ ملەت.
سەر دلێ نازكا تەمراند
كول–كەسەر،
دەوسێ ڤێخست ئيشقا سۆر،
ب نوور–نەدەر.
پێخەم زوو زولما رۆژێ بوهوريكەت،
زۆركەر نەمان سەر كەدا جماعەتێيە
هەق.
ئاگرێسۆر هاوژيا خوە تينن
ژيانا مە دەلال،

هەر کۆچک-سەرا دا تەڤا گەرمە،
شەوق-شەمال.
ڤیز، خۆرت دەڤکەنن،
بەژنا وانە حەواس،
ڕۆژێد وان دەرباس دبە
ب ستران و ساز،
ب خوەندن، خەبات
بوونە سەرفنیاز،
بوونە سەربەست، زانە،
خوەی بەخت-مراز.
ها دللاند دەنگێ نازک
ژ حوبا دل،
ب دلێ خوە بستری
شاروول و بلبل.
ڕۆ کارێ خوە دکر، دچوو ئاڤا،
تاری بەرە-بەرە دکەتە
چۆل و بانیا،
عەورێ سپی عەزمان
دخەیریا
ئاڤا ئەرمز نەرمێ خوە دکشیا.
دوومان و مژ ژ سەرێ چیا،
نۆتلا مەعرا،
دشوولکن سەر سینۆر و شاخێ
زنارا.
بەست، نەوال، کۆرت و کەندالێ
ڤان ئێرا

تەبیەتا زڤستانا سار
ڕادمووسا
جولعەت، بێ ترس هێدی–هێدی،
بەر چەم، بەر چەم... حافا گەلی
بەژنا بلندشنێلێ زەرین،
سمێلا قەیتان، چەعڤێ ڕەش،
لێڤێ نارین.
نۆتلا زارا دەڤکەن، شا،
چاپک–چەلەنگی
دچوو، دهات دگەریا،
سینۆرخومیکر عەلی.
ئەو عەسکەرێ ئۆردیا سۆرە
ڤی مسکەنی.
بێخۆفیا سینۆرە بۆرجێ
ویی زیارەتی.
سۆرە–سارە بانگزێ شەڤا تاری،
ساوێ دگرت مەرف
هەرچار ئالی.
دکشاند جەفاکی گران
کورد عەلی.
نە جارەک چاوا
پلنگێ نەستری،
ڕێ دگرت ل جەعسووسێ
کو زیان دانی.
دقەومی گەلە شەر
ل پێشییا نەیارا

هازر بوو عەمرێ خوە بدا
بۆنا وەتەن.
سینگێ خوە چاوا مەرتال،
ددا بەر دەربا
دژمنێ قان.
ئارخاین، تڤنگا خوە
ئەوی دگوڤاشت،
و دەنگێ گولا وی
بەلا دبوو عەرشێ عەزمان.
زڤستانە، ئۆرتا
خاچ–خدرنەڤی،
سار، سەرێ چیا بەرف
بوونە خێلی.
ڕوو عەزمانعەورا ژ شەرقێ
دلەزی،
ترێ بەرب کانییا
دمەشن زەری.
کولیێ بەرفێ دهاتن،
گومرەح دبارین.
وەختەکە شەڤێ چووبوو،
با–باگەر ئانی.
قەرەتووک نشکێ ڤا
هاتە بەر چەعڤێ عەلی،
و بەتا ڤەبوو بەر وی
جی ب جی...
عەلی سەکنی، فکری،

ل قەرمتو

شکبەربوو ئەوی:

- یا ڕەبی...

تەرەولە، یان مەری؟

دبە کو ڕەشە-پەش،

ڤێ شەڤا تاری

هاتە بەر چەعڤێ من،

زوو بهوری...

دقەومە ئەو جەعسووسە،

کەتیە سەر ڕیا نەناس،

نیڤێ شەڤێ، وا دەستێ خوە

داڤێژە ڕیا دەخەس.

خەم دکەڤە دلێ عەلی،

بێسەبر دبە،

سەر سینۆرێ قالێ ژۆرین،

هەڤراز دبە.

وان دەرا یەک-یەک

چەعڤێ خوە دگەرینە،

تو ڕوحبەرەکێ دۆر-بەرێ خوە

نابینە،

نە تەرەول بوو، نە جەعسووس بوو

ئەو قەرمتوو.

با-باگەرێ مژا شەڤێ،

پێ نەدا وی.

حەتا کەوا سبێ مابوو نەچار،

بەر هشکیێ، بەر تەعلدێ

تووم و زنار
گاڤا مژ-دوومان دکەڤە سینۆر،
هەر جی،
ڕێ-درب ناکەڤە
تو عەڤد-ئیسانی.
مرنێ ڕوح ڕا دلیست
ڤی هەیامی،
کێ دلێ قەلپ دەربازبە سینۆر،
وەی ل وی.
سۆند خار سینۆرخومیکرێ سۆڤێتێ عەلی
دەستێ خوە بەرنەدە
وی دژمنی.
سەر ڕیا چەتن و گران
ئەو سەکنی،
کیدەرێ کو جەعسووس
دخوەست خلازبیا ئەینی.
ئەو بەست و کۆرت،
ئەو نەوال و گەلی،
تۆیک، چیا، مێشێ سینۆر
هەرچار ئانی،
کەوا سبێ ددایێ و دسنجری،
نەشکێ ڤا سەر مەزیلا شەش گاڤا،
دژمن سەکنی، جی دا
بوو ڕوساس.
ڤێ بەربانگا سارە هشکی
پێشبەری خوە ئەوی دی

خومیکرێ سینۆر،
تفنگا دەستێ عەلی.
نەیار دەست برە چەکا ماویزەری،
عەلی سەر دا قووریا ب دەنگەکی هێرس:
- نەلەقە ژ جی!..
گلیێ مێرێ مێرخاس عەیانە،
کافا تێ ڕۆژێ ئۆغرمێ گرانە،
هەرکەس زانە، دەست
سەر دەستا ڕا نە.
عەلی دەنگەکی قوورییا سەر دژمن
و گۆ:
- تو ڤێ سبێ خوە مەکە ئەفسەنە،
- تەسلیمبە!
ڤی بەری دوومکا تە گەلەک کنە،

کال-بافا جێرباندنا
عەمر گۆتیە:
- جەعسووستی زولەکە ڕوو دنێ یە.
ل ڕۆهلاتێ ڕابوو
بینا بایێ سبێ،
ئێڤار دا جەعسووس بوویە
قەزییا دەورێ،
جەعسووس نێتا نەپاک قەدا سێری،
خوە زەفت نەکر ئەوی نەمەردی،
نۆتلا پشیکا
بانزدا سەر عەلی.

عەلی شاش نەبوو، بەر بانزدا،
فەسال دی،
زەریا خوە، وەکی بگرە نیشانا
ڤی بەرازی.
مەفا نەدایێ سەر چەقماقێ
تلی دانی،
پێ ڕا-پێ ڕا گولەکر
عەلی...
دژمن هەژییا و کەت،
ڕوهێ خوە دا،
عەمر لێ ڤێسییا...
برا بزانبە هەر دژمن
ڤر ها دا،
کێ کو بخوەزە دەربازبە
سینۆر-ڤر دا،
مرنێ وێ چۆکدە
ل بەر وی،
ب دەستێ مێرخاس،
سینۆر خوەیکرێ سۆڤێتێ.

ڕێداکتۆر و کۆرێکتۆرا: کۆنترۆل ئێ. ئوو. بەکۆئێڤا
شکلکێش: گ. ئا. گاسپاریان
ڕێداکتۆرێ بەدەوتیێ: ئا. ڤێ. گاسپاریان
ریداکتۆرێ تێخنیکیێ: ئۆ. س. پانیکیان

# پاییز

ئووسڤێ بەکۆ

---

هایاستان

یێرێڤان ١٩٧٠

# ئووسفێ بەکۆ

ئووسفێ بەکۆ زوو ڤا خوەندەڤانێد کوردرا ناسە و ناڤا ئەدەبییەتا کوردێد سۆڤێتییێ دا جیێ خوەیی لائیق گرتیە. شاییر ب کەمالا خوەیە پر ڤا ئۆکتیابرا مەزن سترا، تو کەس نەوەکلاند، ب مقامێ خوەیە خوخوەتیێ و ملەتیێ کلاما دلێ خوەیە تەزە لیلاند، ب تەمامییا دل و فراسەتێ خوە ڤا دەورا تەزە ڕا هاتە گرێدانێ. کلاما وی شبێتا کانیکە تەزە دەربوویوویە زەلال بەر ب دلێ مەرییا خولخولی.

ئووسفێ بەکۆ (بەکۆیێڤ) ١٥ ئێ گولانێ س. ١٩٠٩ـا گوندێ قووچێ دا ل نەهییا ئیغدرێ، قەزا سورمەلییێ دا (ڕۆم) مالا شێخێ شەمسا دا ژ دیا خوە بوویە. سالێ شەرێ ئیمپێریالیستیێیی ئەولن دا مالا وان دچە ئیغدرێ. باڤێ وی بەری شێر، لێ دیا وی پاشی شێر دچنە ڕەحمەتێ.

شاییر سەرهاتییا خوە دا دنڤیسە، وەکی ١٠ سالییا خوە دا دەربازی سەر خەباتێ بوویە". سالا ١٩١٩ دەولەتیێ کو ئەو مالا وی دا دخەبتی، ژ ئیغدرێ تێ یێرێڤانێ، ئەوی ژی خوەڕا تینە. ئووسف دەرهەقا وی وەختی دا دنڤیسە: "من ل بەر چەعڤێ خوە دیت ڕەڤ، کوشتن، خەلایی، قرا مەرییا، برچیبوون و بەلەنگازییا وانا..."

شاییر سالێد زارۆتییا خوە دا دچە مەکتەبێ. ئاها ئەو چ دنڤیسە: " سالێد مالا خەزێن دا دچوومە مەکتەبێ، ئالیکی ڤا خەیسەتێ خوە ڤا ب تەمامی هاتمە گوهاستنێ، ئالیێ دنێ ڤا ژی قەت ڕحەتیا من تونە بوو، چمکۆ هن خەباتا مالێ ستوێ من دا بوو، هن ژی گەرەکێ من دەرسێ خوە حازر کرانا..." بۆنا ئەم ب تەمامی حالێ شاییری زارۆتیێ و مەجالێد خوەندنا وی بحەسن، لازمە ئەم گوهـ بدنە گلییێ وی: "پەی ڕازانا نەفەرێ مالێ ڕا، کیلەرێ دا، یانێ سڤدەرێ دا حەتانی نیڤێ شەڤێ بن ڕۆنایا چرا نەفتێیە چووک من دخوەند... بۆنا وێ یەکێ ژی نەفەرێ مالێ سەر من هێرس دبوون، چرا ڤەدشارتن، نەدهیشتن شەڤێ بشخولینم، لێ من دیسا یا خوە دکر. من چڤاس کتێب دخوەندن، ئەوقاسی ژی ژێ حزدکر..."

ئەو خوەندنا خوە یە ئۆرتە بازارێ یێرێڤانێ دستینە. پێشییێ یێرێڤانێ دا فاکوولتێتا

پالایه سەر ناڤێ مێلیکیان دا دخوونە، لێ پاشێ لێنینگرادێ دا، ئینستیتووتا ڕۆهلاتێدا دخوونە. دوو وێ ڕا فاکوولتێتا ئوونیڤێرسیتێتا یێرێڤانێتە دەولەتێیە ئەختیارزانیێ خلاس دکە.

سالا ١٩٤١ ئێ ئوو. بەکۆ جێرگێ پارتیا کۆموونیستیێ دا تێ قەبوولکرن و ب ڕەزەدلییا خوە دچە شەرێ مقابلی زەڤتچیێد فاشیستیێ. ناڤا جێرگێ ئۆردیا سۆڤێتێدا ئەو دچە دگهیژە ماجارستانێ. وێ دەرێ سالا ١٩٤٤ ـا بناتارا بوودابێشتێدا گران بریندار دبە. بۆنا ئەفاتاتیا شەرێ مقابلی فاشیستا ئوسڤێ بەکۆ ب ئۆردێنا بەیراقا سۆر"، "شەرێ وەتەنیەیی دەرەجا دودا" و ب ئۆردێن و مێدالێن ماین ڤا هاتییە ڕەواکرن.

ژ سالا ١٩٣٨ـا دەستپێکری (خێن ژ سالێد شێر) حەتانی سالا ١٩٦٢ـا ئوو.بەکۆ سوودا ئەرمەنستانێیە تەورەبلند دا خەبتییە، چاوا ئوزڤێ کۆلێکیایێ و ئوسا ژی ئوزڤێ سەدرتییا وێ سوودێ بوویە.

عەفراندنێد ئوسڤێ بەکۆیە پێشن دەست خوە دا پەی شێر ڕا تێنە چاپکرنێ. عەفراندنێد شایر بەرەڤۆکێد نڤیسکارێد کوردایە سۆڤێتیێ، ڕۆژنەمە و کتێبێد دەرسا دا ڕۆنایی دبین و ب زمانێ ئوورسی، ئەرمەنی تێنە تەرجەمەکرن. وێڤرا تەڤایی گەلەک بەرەڤۆکێد عەفراندنێد وی تێنە چاپکرنێ.

هەر بەرەڤۆکەکە شایرە تەزە ڕا مەیدان ئو هودوودێ دیتنا شایر دها تێنە فرەکرن و مەزنکرن. ئەو تو جارا ژ پرۆزایزمێ ناترسە، چمکی قەوات و کەمالا شێرێد وی ناڤا فکرا وان دا نە. ئەو دەربازی شێرا ئازا-ڤێلیبرێ دبە و ئەو یەکا وی ڕا ڕند ل هەڤ هاتیە. سەرەجەما تەزە فۆرما شێرێیە تەزە ڕا ل هەڤ هاتییە قالبخستنێ.

ئاوازەکی عەفراندنێد شایر ئەو شێرێد ڤەکرینە، ئەد کو ب کەل و شەواتەکە گورڤا هاتنە نڤیسارێ. ئوسڤێ بەکۆ ب شێرێد خوە یە ڤەکری ڤا گەلەک و گەلەک ئاوازێد جوورە-جوورە ئانینە ناڤا ئەدەبیەتا کوردێد سۆڤێتیێ، هن ئالیێ سەرەجەما خوە ڤا، هن ئالیە فۆرمێد پۆئێتیێ دا.

٤ێ مەها ئۆکتیابرێ سالا ١٩٦٩ـا شایرێ مەیی حزکریی پرمەعریفەت چوو ڕەحمەتێ، عەدەبیەتا کوردایە سۆڤێتیێ زیانەکە مەزن کشاند، شایرەکی خومیی پرکەمال ئوندا کر. دەرهەڤا وێ زیانێ دا شایر ڕند گۆتییە:

بۆخچێ دلێ خوە ڤەکر،

چ ناف دا بوو، حەڤەک هشت،

پارا مەزن خومرا بر...

شاییر ئووسڤێ بەکۆ ب پۆیێزییا خومیە پرسەرمجەم ڤا ساخە. ئەوی لێنین، ئۆکتیابر، پارتییا و وەتەن سترایە و پەسناندییە، ب دەنگ و کوبرا خوە یە خومخومتییێ، ب مقامێ خومیی نەومکلاندی ڤا.

بەرهەڤۆکا ئووسڤێ بەکۆ "پاییز" پاشی وەفاتبوونا شاییر رۆنایی دبینە. وێ دا پایێ پر شێر و پۆیێمێد شاییر هاتنە چاپکرنێ، ئێد کو ئەوی سالێد عەمرێ خومیی پاشن ئەفراندنە. شاییر ناڤا وان ئەفراندنێد خوە دا دنڤیسە دەرهەقا وەتەنێ حزکری، نازکایا تەبیەتا وی دا، دەرهەقا فکر و متالێ مەرڤێ سادە دا و شەرکارییا مەرڤێد خەباتچی دا مقابلی زولمکارییا سۆسالیێ.

شکۆیێ حەسەن

## خەیسەتێ دلێ من

ئەز مەتەلم سەر خەیسەتێ خوە ڤی دلی،
جارنا وا قەی دبە برووسک و باگەر،
ئەو خوە سەرێ چیا و زنارا دخە،
دشکێنە دارێ قالم و کەڤرا،
ئاڤا چەمێد کوور گۆل دکە ل وان دەرا،
ئاڤێ لوولا دا زەفت دکە، ددە دەر
و قەواتا وێیە زۆر ژێ دەردخە،
ئەو پێ قەواتا قیمەتلوو و زەر
لامپێد گوند و باژارا ڤێدخە.
جارنا دبە سیمێنت، بێتۆن و هەسن،
دبە هیمێ وەتەنێ مەزن.
بەلێ، ژ خەیسەتێ دلێ خوە سەردەرییێ
قەت ژێ دەرناخم، لاپ مەتەلم.
وەختا ئۆغرمێ وەتەنە گران
دلێ من شەڤ و ڕۆژ ڕحەتییێ نادە،
ئەز چقاس زەفت دکم، لێ تو چار نابە.
دژمن کاڤا گۆڤەک دکرە-لێخە
ئەو دبە یەکی هار سەری لێ گەرم،
و بۆنا وی تونە باغشاندن و ڕەم.
شێر دا کاڤا ئەو دبوو ئیلاجبری،
وی وەعدەی دا-هێرسا وی ناکری.
نە کەڤر، کەڤرە، ئەو ژی دتەقە،
حەساب دکم هێرسا ئوسا هەقە.
تو سەرەدەری ناکم ژ ڤی دلی،
و مەتەل دمینم سەر خەیسەتێ وی،

چمکی جارنا ژ گولێ نازکترە،
ئەو بۆنا تشتێ قەنج قەت ناسترە.
دبە دەنگبێژ، سازبەند، ها زۆرێ ددە،
ئەو دبە ڕەحما دلێ دایکا،
مەخسووس ڕامووسانا سەر لێڤا وانا،
کاڤا دایک تێنە بەر دلێ زارا،
ئەو دبە قەی نازکایا بەلگێ گولا،
دبە عەینی نازداریا خۆرت و قیزا،
خوەستن، حوب و بینا بەر دلێ وانا.
ئەو دبە سیمێ زێڕین ل سەر سازا.
مەتالم سەر خەیسەتێ خوە ڤی دلی
و ناڤینم ئیدی تو پرس و گلی.
ئەز نکارم پێ بحەسم سورا وی.
تە هەو دیت تەڤی نەخوەشا دناله،
سەڤا وان ئەو ژی بێکێف و بەدحالە،
تەڤی جاهلا ئەو ژی دبە بەنگی.
بۆنا کەنێ وانا ئەو ژی دکەنە
و دسترێ مقامێ هەموو دەنگی.
بال وێ هێچن سینۆر، کلیت و دەری.
سەرەدەری ل وی ناکە تو مەری،
ئەز کەتمە ناڤ ئاگرێ ڤی دلی.
هەو دیت بوویە کەڤۆتکا عەدلاییبر،
دۆر چەرخا دنێ ئارخایین دگەرە،
ئەو عەرشێ عەزمین شۆڤ دکە ل ور،
نیشانا وەتەنێ مە ل سەرە.
ئەز مەتەلم سەر خەیسەتێ دلێ خوە،

هەر دمرا، هەر تشتی دا ئەز دبینم،
و نکارم ناسییا وی ئەز بدمە وە.

***

ژ بیست قورنەیی
نیڤ قورنە دەرێ.
ڕاستییێ دخوەزی،
پێنجی سال بەرێ،
کال و باڤێ من
پێ جۆت-کۆتانێ
خوەلییا زەڤییا مە
نکاربوون ڕاکن
حەتا ئێڤارێ.

پێنجی سال بەرێ،
ژ بیست قورنەی
نیڤ قورنە دەرێ.
کاما مە دارۆک
کڤش دبوو عەینی
چاوا لەییستۆک.

لێ نها ئاوا
دۆرگەر و گەمی
ئەو منرا بوونە
حاجەتێ حیملی.
وانا سیار دبم
و بەرێ خوە ددم
ئەز بەر ب عەزمین،
بەر ب خاتوونا

وێ هیڤا زێرین.
سەر هەزار-هەزار
کیلۆمێتری
شۆڤ دکم عەرشێ
نەناس و خۆیان.

***

ئەز کەتبووم پەی بەخت،
لێ ئەو ژ من درەڤی،
نۆلی پەزا کووڤی،
ببوو بێرەحم و سەرت.
ئەوی نەرحەت
کەدا منە حەلال
ددا بایێ، درێت.
دو دنیا هەڤخستن،
و گەلە نیر شکەستن،
رۆیێ شەمال ئاڤیت،
هێژا مە هەڤدو دیت.

***

مەیدانا چێکرنا کۆموونیزمێ یە
وەتەنێ منی پرملەت، دوگوشە،
کو لەز بەر ب کۆموونیزمێ دمەشە.

گۆشەک ئەولەدێ وییە ژیر، هێسا بوویی
قەی ژ خەوا ئەو تەزە ڕادبنە پیا،
گۆشێ دن قەی تەزە دکەڤنە ناڤا جیبیا.

چێکردارێ وێ تەڤ مێرخاسن و هێژا،

ئەو ئەولەدێ مالەکێنە، مالا مەزن،
گشک وەک هەڤ زۆر دانە ملا و مەژوویا.

قەی چقلێ کەدا وان بوونە چەمێ مەزن،
خوشینا خوە ڤا ب عەدلی دبەزن،
قەشەنگ دکن سینگ و بەرێ وەتەنێ من.

قەی ژ چلکا پێشدا هاتیە بەر و ئوڤکیان،
وەتەنێ من ژی قەی گەمیا بارگران،
ئارخایین، بێمنەت رێ دچە ل سەر وان.

ئەو رییا ئۆغرایە نوور و زۆر،
راکێت و دۆرگەرا دایە ل خوە چاردۆر،
بەر ب کۆمونیزمێ دچە چاوا ئابۆزا سۆر.

## گولانا وەتەنێ من

باهار ڤەبوویە مینا هەرسال،
گولان هاتیە کاو و کوبار،
هاتییە مەها عەزیز خێرخاز،
خوەرا ئانییە بەخت و مراز.

تو گولانا سەبرا دلا،
قەی حوبا خوە باقنگ-باقنگ
تە ڤەشارتیە د ناڤ دلا،
تاقەت دایە مەژوویا، ملا.

خاسباغچە یە وەتەنێ من،
ها گول ددە باهار-باهار،
و پێ کەدا خومیە حەلال

بەر ب مرازا دچە هەرسال.

وەتەنێ من بێ سەرۆبن
دەستەگولا ڕەنگ-ڕەنگییە،
خەملا عەدلایێ ل سەرە،
شەوق ئاڤیتیە ل هەر دەرە.

نچەکی وی تەعف و شەمال،
دخەملن کەوشەن و وار،
لێ نچێ دن زڤستانە،
سور و سەرما، با-باگەرە.

وەتەنڤانێ من پرملەت
خوەیێ کەدا خوەیە ڕحەت،
بێغۆف، ئازا و بێمنەت
کشک وەکە هەڤ، ژیر و شورەت.

پر فرەیە وەتەنێ من،
دنیایێ دا هەری مەزن،
دۆرێ پزمام، خێرخازن پر،
تەڤ ژی شەرکار و بەیراقبر.

## سالداتێ ڕەڤۆلووسیایێ

١

ئەز هێ زارۆ بووم ل ڕووبارێ دنێ،
لێ من بهیستییە ژ مەریێ وێ هێنێ،
کالکێ من تەڤی گەلە ملەتا
تفنگ دێست دا چوو دوور وەلاتا.

٢

دبێژن ئەو بوویە سالداتێ لێنین،
شەرکرییە پێشییا زولکارییا زەمین.
دبێژن شەرەکی مەزن بوو و گور،
هەر عەگیتەک خوە ور کفش دکر،
گەمییا "ئافرۆرایێ" دباراند ئاگر.
گاڤا ب عەمرێ لێنین ئەو حوجووم دکن،
سەر کۆچکا زڤستانێ، - نیکۆل بگرن،
کالکێ من ژی شێر دا تێ کوشتن.

٣

ئەوان نیکۆل ژ تەخت ئاڤیتن،
لێ عەمرێ تەزە ب چەعڤا نەدیتن،
بۆ ئازایا جماعەتێ عەمرێ خوە دان؛
سەبا بیرانینا سالداتێد مێرخاس
حەیکەل چێکرن ژ مەرمەرێ خاس،
سلسلەتا تەزە وان ڕا ببە ناس.

٤

ناڤا وان سالداتێد عەفات، نەمری،
وەکی حەیکەل دا پشت دانە پشتا هەڤ،
کالکێ من ژی تەڤ وانە، ژ کەڤر سنجری،
دبێژ ڤەی حوجووم دکە ڕەڤە-رەڤ،
ڤەی ژ گولا دژمن گلی مایە دێڤدا،
حسرەتا ئازایێ هێ دلێ وی دا...

# دو کولامێ من

١

دلێ من دا کلامەک هەبوو،
ئەو کلاما کال و باڤا بوو
و بێ ستران ئوسا مابوو؛
وێ دا تژی دەرد و کول،
ها دپەرتاند جەگەر و دل،
ببوو خەما گران-قەدا،
ترێ ئەو پێ هێسرا ئاڤدان.
ئۆ، پر زەلوول بوو کلاما من،
تو رەحمەتی وێ نە ددا من،
رێوی بووم، ژ هەڤالا مابووم.

٢

دەست کلاما خوە ئەز دگرییام،
وەختا دهات بیر قەت نەدکەنییام.
وێ ڤا دبووم یەکی دلبرین،
ڤیرینا من دگهیشتە عەزمین.
کەسی نەدخوەست ببهێ دەنگێ من،
بۆی وانا ڤەی ئەز یەکی خەریبم.
جارنا کلام ب حەمدێ خوە، نازدار،
عەینی چا ڤیزەکە دلبهار،
نیشان ددا خەملێد خوەی دور،
دشەوتاندم ب ئاگرێ خوە گور.
و تەڤی وێ ئەز ژی دفرییام،
هەڤرا دنێ-عەلەمێ دگەرییام.

چار دنێ دیسا ئەو دکەوگری،
دلێ من دا دکر مژ، تاری،
دکر ئیسکە-ئیسک، دکر زارە-زار،
بەر وێ ئەز دبووم نەچار،
دخەیدی ژ من درەڤی
و ئەز پەی وێ دبوومە کووڤی.
دجەداند و دچوو پر مەزیل،
وا دەستی وێ دبوومە هێسیر.
ئۆ، پر چەتن بوو کلاما من،
تو ڕحەتی وێ نە ددا من،
ڕێوی بووم، ژ هەڤالا مابووم..

٣

کلاما من، ئەو نە برج و کەلێ
کالکێ کالکێ مە دانی خویانێ،
سەرهاتییا مێرخاسێ وانە لێ،
وەعدێ بوهوری وێ دکر عەیان،
شەهەر و مەری دانی مەیدان
و پەردا ڕزی ڤەدکر،
خەمل، دورێ مایی نیشان دکر.
دانی بەر چەعڤا مەرییێ ئولمدار،
عەگیت و ڕاتا کەدحەلال،
مەرییێ شێر دا کینلوو و حەیفدار.
ددا کڤشە گوند و باژار،
قەسر، خاسباغچە، کۆچک و سەرا،
جزیرا بۆتا، موخورزەمین،
مەلە جزیری و شەرەف- ئێد-دین،

فەقیێ تەیرا، ئاحمەدێ خانی،
کەلا مێرخاسا کەلا دمدم
و گەلە شەهەر، گەلە مەرییێ دن،
وەکی سلسلەتا کالا و باقا
بوونە خوەیێ کۆچک و سەرا،
وەکی بوونە چا تەیرێ سیمر،
دلێ وان دا هەم رەم، هەم ئاگر،
بۆنا ڕۆژا خوەش، بۆنا عەمر.
لەما ژی ئەو حەتانی ئیرۆ
ناڤ تاریقێ دا دژین، نامرن،
چاوا مەم و زین ئەم پێڕا گیرۆ...
ئەوێ ڕحەتی نەددا من،
ڕێوی بووم، ژ هەڤالا مابووم.

ئەزی خەریب بووم بۆنا وی عەمری،
بێ پار بووم، پارا من تونەبوو،
پێشبەری من چیا، پەی من گەلی،
تو ئالیبا ڕیا من کڤش نەدبوو،
تەک و تەنێ بووم و زمانلال،
نە ڕسقێ من هەبوو، نە ژی مال،
نە حوکومات، نە ژی کۆمەک.
هەر تەعن و نووچک چاوا خەنجەرەک،
بێی دەستوور بووم ئەز و بێ گومان.
کودا دچووم بەری من ددان.
ژ وان تەعن، نووچکا تەنگ بوو بینا من،
ژ دنێ دچووم دنیا دن...
مینا گولەکە وەحیدە تەک،

تەیرۆکێ دوەراند ل من ڕەنگ و بەلگ.
ئاخینا من بوو ل سەرێ چیا
و هەر ڕۆ هەر گاڤ ئەز دنالیام.

ئەز ژ خەما دلا بووبووم گەرۆک،
فکرێ ڤا-ئیسپهی چا زارۆک.
عەبوورا من ناڤ دەڤێ گورا،
تو ڕۆژێد خوەش من نەدیت ورا.
پارا من بوون برووسک و تەیرۆک،
عەرد و عەزمان و کانیێ بەزۆک.
ور درەقسین سور و سەرما،
تو حال و تاقەت من دا نەما.
و ناڤ زیندانا سارە-تاری
ئەو ل من دکرن دیهاری،
ژ ڕۆژێد خوەش دمانە تما.
ئۆ، پر زەلوول بوو کلاما من،
ئەوێ ڕحەتی نە ددا من،
ڕێوی بووم، ژ هەڤالا مابووم.

٥

ئەو کلاما من وێ هێنێ دا،
نۆلانی بەرفا بەلەکییا
دلێ من هێدی دحەلییا،
ڕووێ وێ دا دبووم بێچار و نەخوەش،
ور حەلییام قەی بووم کانی و جەو،
کەڤرا کەتم ئەز ڕۆژ و شەڤ.
بەرژێر ڕەڤیم چا مەریێ سەرخوەش،

خوە گیهاند ڤی بەرێ ئاڤا ڕەش.
کلاما من سازێ بێ سیم بوو،
دەنگ لێ نمز بوو، نەدگهیشتە جیێ دوور،
کلاما من و ئەو بلوور،
بلوورا دارینە قولقولکری
ببوون ئێتیمۆکێ وان دەرا،
و کی زانە، چەندک-چەند سالا
چقاس سلسلەت ناڤا گەلە قورنا
ئەو بلوور دانە سەر لێڤا؟
پەرتاندنە دل و جەگەر.
دبە کو دارێ وێ بلووری
وەعدێ خوە دا شین بوویە ناڤا مێشێ
کال و باڤا، ل کو دکشە
جەوا کانییا سار ژ بن زنارا،
چڤانە ددە، نۆلانی مەرا.
دقەومە ژی خووت وێ دەرێ
هەبوویە کۆچک-سەرا، مێشە پێشبەر،
جەو و چەم لێ بووە کەمبەر.
دقەومە ئەو کالکێد من ژی
بوونە ئولدار، مەژوویێ وان تژی،
بوونە شەرکار و مەرییێ عەیان،
بوونە کالکێ قەرەتاژدین، چەکان،
کەر و کولک، خانچەنگزێرین.
دقەومە گەلە کەلێد دمدم
پەی هەڤ ڕابوونە پێشییا دژمن
و سەرهاتیا مێرخاسییا وانا

مەرا مانە-شەعدەتییێ زەمین.
ئەو شەعدەتی کفش دبە ناڤا
ئێپۆسا نەمری مەم و زین...
ئۆ، پر زەلوول بوو کلاما من،
ئەوێ رەحەتی نە ددا من،
رێوی بووم، ژ هەڤالا مابووم.
***
نها دەنگبلندە کلاما من،
بۆی وێ ڤەبوویە سبەکە دن،
چێکردارە، هۆستاکی مەزن،
ژێ رەڤینە شەواتا دل و گازن.
سازەکی دورە ناڤ روحێ من دا،
بۆ جماعەتا من ئەوێ پەر ڤەدا.
ئەو ئاڤا ئەرقا هلدکشینە،
ب قەوات ژ چیا ژۆر دا تینە.
لوولێ هەسن ژێ را دکە کەمبەر،
و ئاڤا کەفگرتی ددە بەر.
قەواتا وێ ئیشقێ دستینە،
پێلا را دەرباز دکە، دشینە
ناڤا وەتەنێ مە، هەموو دەرا،
دخەملینە گوند و باژارا.
و پەر و باسکە ئەڤ کلاما من،
دفرە عەرد و مەزیلێ مەزن،
بێغۆف ئەو بەلا دبە هەر ئالییا،
ب وێ قەواتن مەری و دنیا.
کلاما من ستەیرکا سۆرە و زۆر،
ئاها ئەو بوویە ڤۆستۆکا دۆرگەر،

پریسکێ عەدلایێ ژێ دپەکن،
وەلاتێد ڕازایی ئەو ڕادکە،
ئەو نقۆ دبە ناڤا ئۆڤکیانا،
ددە کڤشێ سورا وانە قورنا.
گۆل و بەرێ تەزە ئەو چێدکە
و سینگێ عەرشێ عەزمێن شۆڤ دکە.
ئەو بوویە گەمیا ئاتۆمە – بووزبر،
بوویە شەوق، شەمال، برووسک و ئاگر،
وێ ڤا دنیا مقاما هلتینە،
وێ ڤا هەر شەرکار ڕیا خوە دبینە،
وێ ڤا دمنگبێژن بچووک و مەزن.
تو عەردا تونە وەک کلاما من،
کانییا عەمرە و ڕوحـ ددە من.

## گولان

جان دیسا هات مەها گولگەش،
بلبل دیسا بوونە سەرخوەش،
ئەلەگەزا مە کوبارە،
گول – سۆسن ڤەی ژێ دبارە.

ئەڤ گولانا عەدلایێیە،
عەینی عەیدا جماعەتێ یە،
نێت – مەرەما بووک – زەعڤێیە
و خوەستنا دێ–باڤایە.

ئەلەگەزا شەعدێ قورنا
گرێدایە شەرا عەورا،
دۆر کۆلۆزێ وێیی بەلەک،

پەعلتێ عەورا بوونە خەلەق.

میلیۆن شەرکار، میلیۆن ملەت،
بۆ عەدلایێ بەیراقا سۆر،
ب دەست دبن دۆر ب دۆر
چاوا گازییا عەدلایا زۆر.

گولان مەها پر گولانە،
گول، عەدلایێ پەر ڤەدانە،
ئەلەگەزا سەری قەرقاش
خوەرا دکە کێف و حەواس.

کەس ناخوەزە شەرێ زرار،
تەڤ دخوەزن گول و بهار،
حالێ خوەش، عەمرێ رحەت
و عەیدێ ها، حەزار-حەزار.

## دایکا مە ئەرمەنیستان

١

دلێ من دا حوب و ئاگر
و بیرانینێد نەتەمر.
دە رابە، نەرهەت دلۆ،
ئەم هەڤرا هێ شابن ئیرۆ.
بسە دلۆ، چرا لەزی،
بنهێر سەر مەیدانا لێنین
چڤاس کەڤۆتکێد عەدلایبر
دفرن بەر پەردێ عەزمین،
مینا کولییێ بەرفا گر

تەڤهەڤ بوویی دبارن،
دۆرا هەوز دگەرن.

٢

ئیرۆ عەیدا تەیە وەتەن،
هەر ئالییا شابوونە و کەن.
بهار ڤەبوویە پاشلا تە دا،
بوویی دارا بووک و زەعڤا،
تە ڤەکرییە سینگ-بەرێ خوە،
سەودەسەرم سەر خەملا تە.

٣

چا خەونا نە ڤەگەرییایی،
حالێ تەی دەرباز، پر چەتن
یەکۆ-یەکۆ تێن بیرا من.
گەلە کەدخور و ملکەدار
مینا گورێ دەڤخوون و هار،
هم ئێ جی، هم دەرەکێد دن،
وا حەسلەتا تەیە سالێ
دبرن و درەڤاندن
ژ بێدەرێ و ژ چۆلێ،
تو دهیشتن ناڤا زولمێ.
ژ کەدا خوە دمای تما،
و نەدوێرین بپرسییانا
مەعنە چییە، ئاخر چما؟

٤

پاشلا تە دا مەزن بوومە،

چنیە کولیلکێد تە یە خاس،
چیا و بانیێد تە گەریامە،
نەخوەندی، سەرقۆت و پێخاس.
تەڤ ئەولەدێ تە، دایکا من،
ئەز ژی ئەولەدەکی تە بووم،
ناڤێ خوە ڤا ئەز یەکی دن.

٥

گەلە-گەلە ڕوونشتمە
ڕەخ کانیێ تە یە زەلال،
ژ هەر کانییێ ئاڤ ڤەخوارییە،
مینا شیرێ دایکا حەلال.
پێ پنجارا سینگ-بەرێ تە
هەرتم خوەڕا دبوومە تێر،
دخوەر کەرەنگ، سپنگ، گزێر.
خەما دلێ خوە چەتنرا
تەڤی تەیر-توویێ تە دسترا،
و من پێ بلوورا دارین
درێت زولما سال و زەمین.

٦

ناڤ کەوشەنا، ل سەرێ چیا،
ناڤا گەلیێد تە یی کوور،
هەموو دەرا، بال هەر مەرییا
دەرد-خەمێ تە دبوون مەشوور.
ژ ئەولەدێ تە بۆنا بەخت
دکەوگرییان خەریبیێ دا،

ها دگەرییان وەلات-وەلات،
لێ ئەوانا عەمرێ خوە دا،
ناڤا دنیایێ، قولچکی دا
نەددیتن جیکی ڕەحەت،
بەخت ل وانا ببوو قیامەت.

٧

سێڤانا عەورکلدایی،
چەمێ خوە ڤا ئێتیم مایی،
هەڤرا دگرییان ب زەلوولی.
زمنگوویا ڕەڤۆکە نەعس شەڤ-رۆژ
دهات دۆرا تە دگەریا،
دکشیا، دچوو خافلقە دا،
و جی نەددیت ئێرا خوە دا.
ئەلەگەزا شەعدێ قورنا،
حەزار کەسەر دلێ وێ دا،
خوە پێچا بوو ناڤا عەورا،
دکرە هەوار و قیرین،
گەلیێ وێ ژ زولما زەمین
ژێ ڕا ببوون کول و برین.

٨

خەزەب و نەراستیا زەمین
هەوار، خەم-دەرد و گرییێ تە
تەڤی گورینا عەرد -عەزمین،
گهیشتنە بەر گوهێ لێنین.
ئەو ب دەستێ مێرخاسێ خوە

خوە گیهاندە هەوارییا تە.
تو کەنیایی، تە خوە شداند،
قەوات تۆپکر، ڕابوویی ژ پیا،
قەید و چیدارێد خوە قەتاند،
تەڕا کەنییان بلبل و چیا.

٩

تە ژ ئالیێ خوە، دایکا من،
حەمێزا خوە فرە ڤەکر،
ب دل-ئەشق پێشکێشی مە کر
عەمرێ چێ، نڤیسار، خوەندن.
سەر ملێ تە یە چل بهار،
هەر بهارەک-کەدا حەلال.

١٠

زەنگوو تەڕا بوویە کەمبەر،
کاناکێرگێس قاشەک ل سەر،
ڕێ کەتیە، دمەشە تێ
گرتیە پشتا یێرێڤانێ،
مینا چێکردارەکی چێ.
چەعڤکانییا وێ سێڤانزیڤە،
ئەو پێ عەمرێ خومیی لەز ڤا
کەتیە ناڤا گول و ڕەزا،
بەژن و بالا تە دبیڤە.

١١

چقاس پرن لەمپێد لێنین،
شەوقا وانا گرتیە عەزمین،

بێ ئیشقا خوه ناڤا هەوێ
قەی گرتنێ شکلێ لێنین.

١٢

حەزار سازبەند و ئولمدار،
حەزار دەنگبێژ، پاله، گوندی،
ئەز ژی تەڤ وان چا یەکەختیار،
ب زمانێ خوەیی کوردی
بۆنا عەیدا تەیە عەزیز
تینم سلاڤا ئالاڤی،
وەکە مەزنایا چیایێ
ئەلەگەزێ، قاسی ماسیس.

١٣

وا یێرتێڤانا خەملی
ئەو قەی دێمێ تەیە عەینی،
پرا تەزە، پابێدا بەدەو،
قەی جۆت گوستیلێ تە نە ئەو.
مەیدانا لێنینێ دەرسدار،
لێنینێ مەزن، ئازادار،
بوویە عەنییا تەیە کەڤەر.
ئاوا تاجێ سەرێ تەیە
ئەلەگەزا مە چارتەیە،
تەیر و تویێ وێ دەنگبێژێ تە.

١٤

تو دەلالی، دەلال وەتەن،
تو مرازی، گومان و چار.

ئەولەدێد تە حەزار-حەزار
خووشک و برا، تەڤ یەکەختیار،
ئاڤلحەیاتی، بلبل، بهار،
ئەوە مەعنە ڤی عەمری دا
ساز و قەلەم دەستێ من دا،
چا خۆرتەکی بەر ب مراز،
ژ حوبا تە نابم خلاز.
تە ڤەکرییە دەرگە و بەخت،
خالی نابم رۆژ و سەحەت.
و ئەوە سەبەب، بۆنا من،
وا خێنجی تە، وەتەنێ
مەیی سۆڤێتییێی مەزن،
تونە تو جنەتەکە دن.

١٥

هەرتم شا بە، شیرن وەتەن،
سازی تە تێ خەبات و کەن،
و پێ کەدا خوەیە حەلال،
بەخت و مراز بینە هەرسال.

## کووبا ئازایەز را

کووبا پزمام، من ل بەر چەعڤێد خوە
ڤێ گاڤێ هێ نەدیتییە چەرمێ
ئەولەدێت تە یی مێرخاس چ رەنگی یە،
لێ ئاها ڤێ دەما خیرەتێ
سەر مێرخاسێ تە ئەز لاپ بەنگیمە.
وەختا شەرێ چەتن، نە وەکە هەڤ،

من کەلا دلا دیتیە ل بەر چەعف.
کەلا ملەتێ تە ژی مینانی
کەلا ئەولەدێ ملەتێ منە عەینی.
گاڤا هێرسا دلێ شەرکارا ڕادبە،
ئیدی ڕێ و مەجال ئەو نادە،
بۆ ئازایێ دبن شێر و پلنگ،
پەر، باسک دستینن و دبن قولنگ.
بەر نەراستیێ دبن کێنلوو، حەیفدار،
نکارە بفلتە تو نەیار.

من ل بەر چەعڤا نەدیتییە بهار،
تەیر–توو، دەشت، کەوشەن، وار و زەڤیێد تە،
لێ ڤێ بهارا خوەشە، تەعڤێن
وار، کەوشەنێ تە، چاوا یێ مە،
خەملاندیە پەنجێ تەعڤا زێرین،
عەرد ێ تە ژ بن خالی–خالیچێ
کولیلکێد تەبییەتێ یە ڕەنگ–رەنگی
پەرواز دبە چا ئەمەکدارێ چێ
و چاوا ئەولەدێ تەیە بەنگی.
قەلفێ قولنگا ژ ئالیێ بەعرێ
وێ گرتنە سینگ و بەرێ عەزمێن،
قەی عەدلایی دەرخستنە گەرێ،
قەی تێن تەمەنە بن بەر دۆرگەرا
گەمییا ڤۆستۆکییە نەبینایی،
کو تەزە ڕێ ڤەکر بۆ مەرڤایێ.
من ل بەر چەعڤا نەدیتییە
زارێد ملەتێ کووبایێ،

چەعف و برووێ وان چ ڕەنگینە،
لێ باش زانم، وەکی دنیایێ دا
هەر دەرا تەبیەت داینا خوە ڤا
ئەو مقیم یەکە و دودو نینە.
ئەز زانم حوبا دلێ دایکا یەکە،
ئێتیمییا زارا دل پڕ دێشینە،
و برینێد خەدەر ئەو ڤەدکە،
دەوسا وان برینا ها دمینە.

من نەدیتییە ئاگرەسۆرێ وور،
ئەوێ دەوا وەتەنێ تە دکن،
لێ من دیتنە زلکار، کەدخور،
ژ تەعنێ وانا برووسک دپەکن.
ئەز شا مە، کووبا، بێحەساب شا مە،
ژ قەزیا گران تو بوویی خلاس،
بۆنا ئالتنداریا تە یە مێرخاس
من پەر-باسک ستاندییە، حژمەکار مامە،
ناڤا دنێ دا تە خوە کرە ناس.
***
ئەو چیایێد بلند کو هوون دبینن،
دەردێ کوردانە سەر هەڤ لۆد بوونە،
بەر-بەرستانێ ئوسا پێل دانە،
ئەو تەمام هێسرێ چەعڤێ کوردانە،
ئەو گەلیێ ئوسا کووڕ کو دبینن،
تەڤ دەوسا برینێ لاوێ کوردانە،
ناڤا قورنا دا زۆلکری مانە،
ڕووێ عەزمین دگرن مژ و دوومانە،
ئەو ڕەشا شین و گرییێ کوردانە.

## هارۆ، دلۆ

هەی دلێ هار،
مالخراڤۆ،
ئەو چ خەبەر،
قەی جهالی،
چەعڤێ تە دەر.
بسەکنە،
مالوێرانۆ،
دنیا تەمام
هەق-حەساڤە،
زولما گران
ل بەر چەعڤە.
کوردستانا
مە کرنە
چڤاس تەڤەک.

## ملەتێ من ڕا

ئەز دەنگێ تە دبهێم، بەژنا تە دبینم
ناڤا فۆلکلۆرا تە یە نەبینایی دا،
باباغ دبم، کو مەریکی بێی تاریق نینم؛
ئەوقاس بر کری و قر کری، دیسا مایی،
دبینم چڤاس برووسک و تەیرۆک تە خستیە،
لێ تاریقا تە ژ ڕوحێ مە دەرنەخستیە.
بەیت و سەرهاتی، ئێپۆس و کلامێ مە
جیوار بوونە، ڕند تەلیانە قولچێ دلێ تە.

***

چیا و زنار نەمانە، وە خوە لێنەدایە،
گول و سۆسن نەمانە، وەکی وە نەچنیە،
وە نفیسارا خوە کریە کلاما ئالاڤ،
بلوورا دارین کریە کلام و پێلە ئاڤ،
ب وێ خوەستنا ملەت کریە ئاگر، ئالاڤ،
و وی ئاگرێ نەتەمری ناڤا قورنا
خوەیکریە و بەردایە ناڤا دلێ کوردا.

## مقامێ بلوورێ

دلێ من دا چقاس
کلام هەنە،
ئەو تەڤ ژی
مقامێ بلوورێ نە،
کزین و شەواتا
بێی گلی نە.
قەی گلییا دەرتینە
و سەر دلکنگا
ئەو درەشینە.

بلوورا دارین
قەی گلیا ڤا
ژ کووڕایا
سالا و زەمانا
دەردخە سور.
ئاگر و ئالاڤا
سەرهاتیا کوردا
و ددە وانا.

سورا قورنێد چووی
ب فەمداری،
ب زمانێ دێ
و ب دەلالی،
تەڕا شرۆڤەدکە
هەر گلی،
کیژانی ڤا تو
دبی باوەری.
مقامێ بلووری
قەی دوورەبینا
سورا کوردانە،
ئێ گەلە قورنا...
قەی گلی ماشییانە،
مقام مانە
و قەی دەنگێ
بۆخازا کوردانە...

قەی پێ بلووری
دکنە هەوار،
پێ وێ بیر تینن
کوردستانا خوە.
قەی کوردستانە،
دخوەزە بهار
و ئەو پێ بلووری
دەنگ ددە لاوا.
دلێم بلوورا
دارین حز دکە،

هەر قولکەکە وێ
ئەو سیمەکە.
سیمێ بلوورێ–
تلی، پێچینە
ئەو لێڤێ
بلوورڤانێ کوردانە.

بلوور قەی سیمە،
دەنگبێژا قورنا،
دلێم وێ ڤا
دبینە کال–باڤا.
سەرێ چیا،
دبهێم کالینا
بەرخا و مییا.
وێ ڤا دبهێم
دەنگێ قورنێ دوور
و من ترێ،
لاوێ کوردە چێ
جڤییانە دۆرا
خانێ چەنگزێرین.
قەی شا دبە
مێرخاسێ مەشوور،
کو هاتییە وەخت،
نسلەتا سەروەخت.
هەوارییا کوردانە،
بەر ب دژمن دچە
ب دەستەشوور.

## نەخشێ کولیلکێ کوردستانێنە

کنجێ ژنێ کوردایە گولگولی،
شەعرێ بووک و قیزا هەموو ڕەنگی،
ئێ دۆرا کۆلۆزێد خۆرتێد ئەڤین،
کو سەر قیزێد چەعفرەش بوونە بەنگی،
نەخشێ کولیلکێد کوردستانێنە.
عەورێ ڕەش، کو پەی هەڤ دکشن، دچن،
کێ دەرێ دبینن قیزێ بەدەو،
ڕێچوویینێ ڤا چاوا کارخەزال،
ل سوورەتێ وان ڕوونشتی گولاڤ،
نەخشێ کولیلکێ کوردستانێنە.

## کوردستانا بریندار

– قولنگ، قوربا،
چ قەومییە،
کو ب زەلوولی
هێسرا دبارینی؟
گەلۆ ژ کیدەرێ،
ژ کیژان وەلاتی،
چاوا قەومی،
ڕاستی من هاتی؟
کانێن قەلفێ تە،
تە ئەو کو هیشتن؟
دبە سور–سەرمێ
دنێ ئەو کوشتن؟
ئەگەر تو تێیی

ژ ئاليه بەغدايێ،
بێژە، بنهێرم،
چاوانە حالێ
بارزانیێ مە
عەگیت و مێرخاس؟
گەلۆ چاوانە
حالێ ئەولەدێ
وەلاتێ مێرا،
وەلاتێ شێرا،
کوردستانا مە،
عەرد ێ قەدیمی؟
ئاخ قولنگ، قوربا،
گەلۆ تو زانی
کو گەلەک قورنا
بەری رۆژێ مە
شێن وەتەنێ مە
ئەو حەساب دبوو
مسکەنێ خودێ؟
کوردستان ئەو خووت
هەما ئەو ئێر بوو
کو ژ دەستێ کوردا
فری و چوو،
پاشێ بوو خورێ
دەولەتێ دنێ.
– شايیرێ مەلوول،
چاوا دبینم

سیتلا ڤالایی
تو ل سەر ئاگر.
وێ هەڤالێ من
بەلا بوونە
ئێر-ئێرستانا،
جیێ نێزیک و دوور،
حەتا بەربانگەک
ل وان ڤەبە مەشوور.
بەر ب وێ بەربانگێ
ئەز فریم، هاتم.
- قولنگێ خەریب،
دبەک نزانی
لاوێ وی ملەتی
عەگیت و چێ نە،
بنەلییێ کەلا دمدمن،
خودانێ وان
شەشخانێ مەزن،
مەریێ خودانێ
خەنجەرێ، تیرێ،
مەریێ خودانێ
ڕما زراڤی،
ئەولەد و تۆپچییێ
تەپێ دمڤبری،
تۆپچیێ خودانێ
تۆپێ عەنگەلێ.
قولنگێ برا،

زانم، قسا ته
بێی گری نابه،
برا ئوسا به،
ب گری بێژه،
دلێ خوه دا بگریم،
کو دل ڤالابه.
– عەڤدۆ، خێرخازۆ،
کوردستان بەدەو بوو،
کاو و کوبار،
تەبییەتا دنێ
خەملا خوه هەرجار
ژ کوردستانێ
هلددا تەمام.
کوردستان گول ددا
باهار، باهار،
چیایێد بیشمێتگولین،
تەپەبلند،
وان دەف–دەواتا ڤا
دبوون رِند.
پلتێ عەورا
دبوون مینانی
شەر و شەماقیێ
دۆرا کۆلۆزا،
رِیشییه وانا–
حەزار–حەزار کانی،
ب خوله–خول

دکشییان ئازا.
هێشنایا مەخمەر
و کولیلکێد خاس
دبوونە ڕەنگێ
شەعرێد وان ئەتلەز.
تەعفا وێ دەرێ
نەدچوو ئافا،
قەی سەردەواتیێ
دەواتا بوو ئەو،
ئەشق و ڕۆنایی
ددا هەر دەرا.
کو کوردستان کفش بیا
کاو و بەدەو.
***
دلێ من دا چقاس کلام هەنە،
ئەو تەڤ ژی مقامێ بلوورێ نە.
بلوورە، ژ دلێ من گلییا
دەرتینە، نازدار دلووبینە،
شەواتێ دکە دلێ مەرییا،
مقام قەی دبن دلێ فەمدار،
مینانی زمانێ دیا حەلال.
قەی حسرەتا دیا منە مانە،
ئەو دل و شەواتا کوردانە،
نافا بلوورێ دا خوەڕا تەلیانە.
***
گۆتن شایر، ئاخر ڤی عەمریدا تەرا شەرمە
حسرەتا یارێبی،

ڕۆژێد تە ژمارتینە، تو هەی هەیی، هەی تونەیی،
بەسە بسترێیی.
گۆت وەی نە عەفەرم وە ڕا، وەکی هوون حەتانی نها
هێ من فەم ناکن.
ل من هاتیە ڕوو-ریدانە چیلە قەرقاش و ئاها
کارێ خوە دکم،
هەرمە وێ دنیا حەتا-حەتایێ نەناس و تەعری
ناکەڤنە سێری؟
ئەو باقێ گولا، کو وەڕا چنی ب چەتن حالی
بێن لێ نەکشینم؟
چرا کفش نینە، وەکی یارا من ملەت، وەتەن ئە،
گەرە بزانبن.

***

ژ دەنگێ هەوارێ ڕابوومە پیا،
دل من ڕجفی، لێ مامە ناڤا جیبیا.
چەعڤێد خوە ڤەکر، چەند جارا مز دا،
شا بووم، لێ خەون بوو، هات و چوو،
ئیدی ڕانەزام، بەری خەونێ دا،
دەنگێ هەوارێ بەر گوهێ من بوو.

***

گەلۆ ئەزێ حەثانی وان ڕۆژا ساخ بمینم،
ئازایا کوردستانێ بەر چەعڤێ خوە ببینم؟
گەلۆ وێ کەنگێ ڤەبە بەربانگا کوردستانێ،
وەکی بهار-بهار گول ڤەبن وێ گولستانێ.
ئەز ب دەف و زورنە تێکەڤمە ناف وان گولا،
مینانی بلبلەکی شەواتێ تێکمە دلا.
ئەز باوەرم، شکبەر نینم، ئاشکەرە دبێم،

دەنگێ شکیاتێ دلا وا ئەز دوور ڤا دبهێم،
جێرکە دگهێژنە هەڤ، دبن قەوات، کو ڕابن بێن.
ئۆ، جێرگێ ئازادار، نامووس و زیارەتا ملەت؟

***

وێ نەڤیچرکێ خانێ چەنگزێرین
بوونە شێ، پلنگ، ڕابوونە پیا،
وەتەنێ خوە ناهێلن دلبرین،
و وێ ڕوح بدنە زۆزانا و چیا.

## کەف

بەر پێلێ بەرێ ئەز چەرچریمە زەف،
ترێ ماشییامە و بوومە کەف،
لەما ژی ئوسا ناز و نازکم،
و بەر پێلا ئەز تەیاخ ناکم.
ئاها ب باسکێ خوەی زایف و کەف،
ئەز قەی بەرێ ڕا دبم فیق و دەف،
دبم حەزار ساز و دبم تەمبوور،
وێ سازبەندییێ ڤا دکشم قولچێ دوور.
دبمە خێلی بۆی ئاڤا بەرێ،
چا خەملا وێیە ل سەر نەدەرێ.
بێ وەستییابوون خوە دخە جیێ نەدیهار،
کڤا کو ورە ئازایی و بهار.
بەر دهەژینە، لووری دبێژە،
دچەلقینە ئوو... وێ دا داڤێژە...
خوسینا ئاڤێ و مەشا پێلا
ئەو گلیێ منن سەر لێڤا.
جارنا دکم کو نقۆبم یەکجار،

فەمکم خەیسەتێ شەرێ بەرێ،
لێ پێلێ وێ من هلدقۆشینن ژۆر،
و بەلا دبم سەر ڕوویێ بەرا شۆر.
ئەز چمە بەر قەواتا پێلێ گور،
گاڤا ئوسانە قانوونا عەمر؟
ئەز هەر هەوارا وان مەرییێ بێچار تێم،
ئێ دەرگێ تەنگ دا گومان بری بەر ب من تێن،
ڕۆدا دچن، لێ تشت تونە بگرن،
دەستێ خوە داڤێژنە من کو خلازبن.
ترێ ئەز کەفم سەر پێلێ بەرێ،
دیسا لەز تێمە سەر بەنگزێ بەرێ،
وەختا دنیا لاپ ئازابە و شێن،
تەعڤی پێلا ئەزێ ژی ب ستران بێم.
دەنگێ هەوارهاتیا دبهێم، تێن...
کوردستانا من وێ عەسە ببە شێن.
بەر پێلێ بەرێ چەرچریمە زەعف،
ترێ ماشییامە و بوومە کەف.

دبێژن گاڤا خوەلی ئوندا دبە،

ملەتێ وێ ژی پێرا ئوندا دبە.
کوردستان هەیە، خوەلییا وێ دمینە،
دۆرا مەزەلێ کال-باڤا شینە.
خوەلییا کوردستانێ ڕەوش و گولینە،
ئەولەدێد وێ مێرێ ئەسلینە،
دلدا حسرەتا ئازاییێ، برینە،
بۆرجێ کال-باڤا یە سەر وان دمینە.

## بەعسا ئازاییَ تیَ،

دەنگیَ هەواریَ تیَ،
بینا کولیلکا تیَ،
خوشینا کانییا تیَ،
هەوارهاتی ویَ تیَن.
ئەویَ گشک هەڤرا بیَن
و کوردستانا چیَ
ویَ عەسە ببە شیَن.

## دەنگیَ ئارام

دەنگیَ کلامیَ تە،
ئارامیَ برا،
ئاها قەی تو ژی تەڤی
قولنگیَ سووریاییَ
دەستیَ پاییزا ورا
هاتی ڤرا.
تو قاسدیَ حسرەتا
منی ڤیَ دەقیَ،
خەریبیَ دوور وەلاتا،
بنەلییَ خەلقیَ.
هاتی سەر هێلینا خوە
بال مە بمینی.
قەی هاتی ژ بەرییَ
شەواتا دلا،
حسرەتا کوردیَ ورا
قەی نانیە گەریَ.

کلامێ تە ڤا دبم
شەرکار و حەیفدار،
هەقیتییا وی شەری دا
دبم پر باوار...
ئاخ، دەنگێ کلامێ تە،
ئارامێ برا،
قەی کەلا دلێ من ژی
ئەو دڤە ورا،
قەی قیرینا قولنگێ
ل وان دەرانە،
قەی ئەو گازیکرنا
دەنگێ کوردانە.
بسترێ، تو بسترێ،
ئارامێ برا،
دەنگێ تەی ڤێ بهارێ
هەرە هەر دەرا.

***

ژ وان رۆژا وا گەلە وەعدە دەرباز بوویە،
لێ ژ بیرا من ئەو قەوماندن هێ نەچوویە.
گەلەکی چەتن گهیشتمە بلندایا چیێ،
ور دیت خەملێ تەبییەتێ یە حژمەتکار و چێ،
ور کولیلکێ بێحەساب بوون، نازک و ڕەنگ-ڕەنگ،
حەتا من چەند باق گرێدان، ئیدی بوو دەرەنگ.
نزانم چاوا لنگێ من کەڤرەکی کەت،
ژ وێ ئێشێ ئاخینەک ژ دلێ من دەرکەت.
ئاوا ل سەر قەواتا خوە ژی پر باوار،
نێزیکی کەڤر بووم و خوەست ئەو حۆلکرا خار.

تەنێ بووم، چقاس قەوات من دا هەبوو، تۆپ کر،
دەستی جاهلییا خوە وی کەڤری ڕا شەر کر.
قەومی، نشکێ ڤا شمتیم ل وێ دەرێ،
و دەوسا وی کەڤری ئەز گولۆل بووم ژێرێ.
گاڤا سەر هشێ خوە دا هاتم، نهێری زۆر،
من تەخمینکر، کو ئەو کەڤر سەرێ زنار بوو
و تەنێ گۆشەکی وی یی چووک دەرڤا مابوو.

## مالا خەزێنێ من

ل کو ببووم خولام،
وەختا ڕەخ وێ دەرباز دبووم،
بیرا من دانی زەلوولتی،
بەلەنگازییا عەمرێ خوە یی
دەرباز boویی بەر چەعڤا ددیت.
لێ نها تەمام هەدمیە
ئەو سۆقاق و مال،
ور هەر ئاڤا حەوزێ مەرمەر
دکە گالە-گال،
تویێ بێژی قەی ور دەواتە
بن لامپێد شەمال.

***

خەونێ دا دبهێم کالینا بەرخا و مییا،
جارنا دخوەزم ڕابم و هەرمە سەرێ چیا،
بلیزم، کێف کم و بگەرم وان جیا.

## بێی زارا تونە حوب و باهار

ئەو مالێد تێدا
زارۆ تونەنە،
قەی پەنجێ تەڤێ
ژێ دخەیدن،
ناکەڤنە مالێ،
قەی ژن و مێرێ
جانساخ و جاهل
دبنە ئاهل.

جیێ زارۆ تونە،
حەساب دبە وەک
دەواتا بێ دەف،
بێ شایی، زورنە.
قەی دەوات نینە،
شین و گرینە.

باغێ تێدا تونە
هێشنایی، کولیلک،
حەساب دبە جیێ
مەعرا، دووپشکا،
قر و قرستان.

مێشێد بەدەو دا
ئەگەر شین نەبن
دارێ تەر، جاهل،
و نەگرن دەوسا

وان داریّ مەزن،
کو عەمر دان وان،
مێشە ویّ هشک بە.

***

جارکێ کولیلکەک دارا سێڤێ ڕا
کەتە حوجەتێ،
کولیلکێ گۆتێ: وەرە تو منڕا
نەکەڤە لەجێ،
بۆنا مەرڤا گشکا عەزیز تر،
ئەزم، کو هەمە
و ڤرا تونە تو کەس من چێتر،
هەر کەس ویّ زانە.
ئەز خەملا خاسم بۆنا مەرڤا،
بۆی قیز و بووکا،
ژ بینا من خوەش ل هەموو دەرا
شانە مەزن، چووک.
لێ دار کو هەنە، وانا دشکێنن،
دشەوتینن.

داریّ بهیستن گلیێ کولیلکێ
ها جابا ویّ دا:
– تو قورە نەبە، خووشکێ، ڕندکێ،
پەسنێ خوە نەدە،
کولیلکێ من ژی هەر باهار هەنە،
و هەر کولیلکەک ئێمیشێ تەعمە.

## گوندێ مه

گوندێ مه دوور بوو، بەر پەرێ عەزمین
گۆشەکی نەناس ناڤا دنێ دا،
گوند ناڤا کەڤر-کوچکا دا بوو،
ڕێیێد زراڤ کو بەر ب وی دچوون،
تەیێ بگۆتا تامارێ گوند بوون.
زنارێ ورا قاسی منارا،
قەلیشتۆکا دا هێلوونێ تەیرا.
و مالێ مه ژی وەک وان هێلوونا،
لێ بن عەردێ دا، نه سەر زنارا.
ئەم-زارۆ، نۆتلا جووجووکێ تەیرا،
هەر قولچەک بۆ مه ناس بوو وان دەرا،
ب گوندێ مه دنیا کوتا دبوو...
خێنجی گوندێ مه دنیا تونەبوو.
گاڤا مه دخوەست دنیا بدیتا،
ئەم هلدکشییانه ل سەر زنارا،
تەماشا دنێ دکر چارالییا.
نه گوندێ مه هاژ دنێ هەبوو
و نه ژی دنیا هاژ گوندێ مه بوو.
مه ترێ دنیا تەمامییا خوە ڤا
بەر چەعڤێ مه یە، ئەم وێ دبیبن.

***

ئیرۆ بایێ پاییزێ هات،
هەوا سار چارنکال هلات،
جارا ئەولن من تەخمین کر
و سەرێ خوە بەر وی خار کر.

چمکی پەی وێ ڕا دهات
زڤستانا سۆر و سەرت.
گەلۆ دلێ منی وەستییایی
وێ تەیاخکە بەر زڤستانێ؟

## قوربان

ڕۆژەکێ دیا من گۆشت دانی بەر من.
من ب ئیشتەهـ ئەو پێ نان دخوەر.
دایکا خوەڕا گۆت: -چقاسی تەعمە،
دبێی ڤەی گۆشتێ کار-خەزالانە.
- بخوە، ئەز قوربان،- وێ من مێزە کر،
نە بەرخا تە ئیرۆ مە سەرژێ کر،
بۆی قوربانا تە مە گۆشت بەلاکر.
زەعف هێرس بووم و بەرخوە کەتم،
تو گلی نەدیت دیا خوەڕا بێژم.
گۆشت و نان بەر من بوونە ژەعر،
ڤەی سەر من دا دنیا هاتە خار
و دلێ خوە دا بوومە خوەی کەسەر.
ڤەی ئەز بوومە کووڤیێ سەرێ چیا؛
قاسی ڕۆحێ خوە بەرخێ حزدکر،
قوربان خوەرن عەمر دا تۆبە کر.

## تو کویی

تو کویی، جاهلتیا من،
گازی تە دکم، تو کویی؟
نە ڤەبوویە سبەکە دن،
تە نابینم، تو کویی؟

بەر چەعڤا هەرسال تەبیەتێ
دنیا کر چکلێ جنەتێ.
دومەقەسک، تەیر، تەیرادە
ئەشق و شابوونا وان بێ حەدە.
ئاها مینا سالا دن
هێلوونا خوە چێدکن
و ترێ گازی من دکن.
باهار دیسا شا دکەنە،
بێی تە ئەز مەتەل مامە،
لێ تو ئیدی کفش نابی،
گازی دکم، تو دەی ناکی.
وا عەمر بوویە دۆرگەر،
پێل ددن ئۆڤکیان و بەر.
دەنگ و بەس کەتییە دنێ،
لێ دەنگێ تە زیز قەت نایێ.
حوبا تە دلێ من دا،
شەڤ، ڕۆژ ئەز تە دگەرم،
تە بیر تینم هەر وەعدا،
کالم، ئەڤینم، گیرۆ.
گەلۆ تەبیەت چما
دارێ قورنا شین دکە،
وان ڕا ئەو نابە تما،
ژ کالبوونێ ڕادکە،
حەزار بەلگا ددە وان،
دخەملینە هەر سال،
لێ ئەز کرمە یەکی کال،
نە دەمێلە جاهلتی

جارکە دن ڤەگەرە بێ،
نە دهێلە هەرمە بال؟
ل من دچن پاش و سال،
پۆر ل من دبن قەرقاش،
بۆ جاهلتییێ لاپ نەخوەش؛
جاهلتییا من ئەو دبە
و ئیدی پاش دا نادە.
من جاهلتی پاکی نەدیت،
تەزە پێڕا بوومە ناس،
زولێ لێدا و ئاڤیت،
چاوا کولیلکەکە خاس.
ئاخ، کویی حسرەتا من،
نە ڤەبوویە سبەکە دن!
***
چخارا من،
گەلۆ زانی،
وەکی بەلگێ تتوونا تە
شینبوویە ور،
کیدەرێ من خوونا خوە رێت،
ل کو عەردێ خوونا من مێت.
تو قنیاتا خوونا منی،
نها ژی تێی بەر دلێ من،
کو خەمێ من برەڤینی،
لێ تو ب خوە قە نابینی،
وەکی تەڤ تە
ئاگرێ دلێ من دشخولە.
***

پرسین: – شاییر، گەلۆ قەت گەرییایی
یێر، یێرستان و تۆپراخا؟
گۆت: – بەلێ، گەرییامە، چوومە هەر جی،
لێ حەیف نێتا من ما نیڤجی.
پرسین: – شاییر، مالاڤایێ، قەت ناکەنی،
مەری ترێ دگرییی دلێ خوە دا.
گۆت: – شەواتا بلوورێیە دلێ من دا،
ژ وێ شەواتێ چەعڤێد خوە ڤەنەدا.

***

رییا کو قەداند چەند سالا دا،
ئیدی نکارم ڤەگەرینم
و تەمامییا عەمرێ خوە دا
تما مامە ور بگەرم.

***

دل، تو عەینی پەلەوانی،
بارێ خەلقێ سەر پشتا تە،
بۆ خەمێ وان پشتۆبری،
قەت تو ناکەڤی حالێ خوە.

## دنیا تو چرا ئوسانی؟

دنیا، چرا ئوسا فێلبازی؟
خەیسەتێ خوە ڤا تو نە ناسی،
تەمام ڤەنابی بەر تو کەسی.
جارنا گەلە حەیفدار و کینی،
لێ جارنا ژی قەی یا بەرێ نینی.
دبی باغ–باغچە، کولیلک، گول و ڕەز،
تو سەرەدەری ژ تە ناکم ئەز.

کاڤا تو ئەوقاس باشی و کاردار،
و مەرڤایێ ڕا تو تینی بهار،
حەیفا تە نینە، تو دبی حەیفدار؟
دنیا، چرا ئوسا فێلبازی؟
تەمام ڤەنابی بەر تو کەسی.

***

سایا جماعەتێیە ئەز دمینم،
باهار–باهار مقیم من بیر تینن.

## زۆزانێ گولێن

وە دیسا یا خوە کر،
زۆزانێ گولێن،
دلێ من دا هیشتن
حسرەت و برین:
نها ئیدی بوونە
زەلوول و زەرین،
مژوولیا وە مایە
هەر تەنێ عەزمێن.
کانیێ وە ب حسرەت
پەی مە دگرین،
وە دیسا یا خوە کر،
زۆزانێ گولێن.
دە ب خاترێ تە،
تەبیەتا سەرگۆڤەند،
وە دیسا دلێ مە
بێئیساف ماشاند.
حسرەتا دلێ مە

نەهاتە سێری،
ب حەزار مەعنان،
حەزار تەهەری.
حەتا پاشلا تەدا
چەعڤێد مە ڤەبوون،
ئیدی پاییز ژی هات،
خەملا تە چوو.
وە دەوسا برینێ
پار و پێرار،
وە سەر دا زێدەکر
شەوات، کول و برین.
ئاخ، هوون رۆژانێ خوەش،
رۆژانێ خوەش گولین.

***

باهار هات و عەرد خەملی،
سەیرە و کێف ل هەر ئالی،
خەملینە کەڤر، خوەلی،
کانێ خەملێ من ڤی دلی؟

***

ئەوێ رحەتی و خەوا من بری،
گاڤا ڤەجێنقیم، چەعڤێ خوە ڤەکر،
بەر چەعڤێ من بوو کەڤۆتک و فری،
بێتاڤەتیێ، خەمێ من زێدە کر.

## دە ما خاترێ وە!

چیایێد سەربلند،
دەشت، زەڤی و گوند،

مێرگ چیمانێ تەر،
هوون کانیێ ڕەڤۆک.
هەڤالێد مەی نەعس،
مینا مە زارۆک،
بباغشینن،
گافا ئەز چووم،
من خاترێ خوە
ژ وە نەخوەست.

شەر بەری مە دا،
ئەم هاتنە ڤرا.
جەم مە-مقیم تەعف،
جەم وە-هەرتم شەف.
جماعەت پزمامن،
وێ بڤنە پزمام،
وێ بژین ڕەخ هەف.
عەسە وێ یەک بە
هەوا، ئاف و تەعف
و ب عەدلایی
خوەڕا بژین تەف.

سال دەرباز بوونە،
بەلەکیا سڤک
ل سەر سەرێ من،
بوومە یەکی دن.
من گرتییە دارک،
ئەز درجفم،
چەتن ڕێ دچم،

گلی، فکرێ خوه
چەتن بیر تینم..
هوون بباغشینن،
وەکی وەعدەدا
خاترێ خوه نەخوەست،
وەرا بگۆتا
نێتا خوه یە ڕاست.
هوون ڕوحێ مندا نن،
دە ما خاترە وە!
***
بۆ ملەتێ خوه شیرحەلال
ئەزێ بمینم ئەو قەدەر،
حەتا هەیە کورد و خەبەر،
من سینگ و بەرێ خوه دا بەر،
جاهلتی، عەمرێ خوه دا دەر،
بۆ ملەت، وەتەنێ حەلال.

## کولیلک

ئاخ کولیلک، کولیلک،
هوون نەخشێ تەبیەتێ، ئاخینا دلا.
مەخسووس هوونن نەدەر و ڕەوشێ
وان خۆرت و قیزێ سەودەسەر،
کو ب مەعنییا چنینا وە
دگهیشتنە مرازێ خوه.
کولیلک، کولیلک، هوون خەونا من،
ئەز قەی وەرا خەبەر ددم،

قەی وە خەونا من باتنی
شرۆڤەدکر، بەر من دانی.
قەی سورا حکیاتێ دنێ
وە خوە دا خوەی دکر ل ور.
هەر ملەت ب زمانێ خوە
ناڤێ دەلال دانین سەر وە.
وە بەدەوتر دنێ دا تشت تونە،
هوونن ڕەوشێ تەبیەتێ و مەرییا.
ژ خوەلیێ دەرتێن، نەخش ددنە خوەلیێ،
لێ حەزار حەیف عەمرێ وە کنە،
چۆل و دەشتا دا دمینن یەکسال،
دمرن حەتانی دیسا تێ باهار.
لێ هوون نامرن، دبن حوب، حسرەت،
ناڤا کلاما دبن نەخش، تاقەت،
دلێ خوە دا خوەی دکە هەر ملەت.
هوون دمینن وا ب نازدار حەتا
گەرمایا ڕۆیێ، باران و خوەلی
عەمر ددن وە، وە مەزن دکن،
ب دەفا عەورا خەوێ ڕادکن.
ئاخ، کولیلک، کولیلک، هوون نەخشێ دنێ،
یەکسالییا خوە ڤا چقاس بیرانین
دهێلن ناڤا مەرڤایا دنێ.
ب وە ئەم نازێ یارێ خوە دڤن،
حوب و عەدلایی وە ڤا ساز دڤن،
بێیی وە تەبییەت کەسیڤە، ئێتیم،
مینا بووکەکە دل لێ شکەستی،

کو ڕووندنێ ڕەخ کانییێ، دگری مقیم
و دلێ خوە ڤا ئەو دمینە تی.
بەر چەعڤا نایێن گۆڤەند و دەوات،
هوونن حسرەتا وێ گاڤ و سەحەت.
ئاخ، کولیلک، کولیلک، هوون نەخشێ دنێ،
لەما هەر ملەت ب زمانێ خوە
ژ کوورایا دل ناڤێ وە ددە.
ژ خوەلیێ دەرتێن، نەخش ددنە خوەلیێ،
وە بەدەوتر دنێ دا تشت تونە،
لێ حەزار حەیف عەمرێ وە گەلەکی کنە.

***

بۆخچێ دلێ خوە ڤەکر
ç ناڤ دا بوو، حەڤەک هیشت،
پارا مەزن خوەڕا بر.

## باواری

باواربوونە کو مەرییا
دەردخە ژ حالێ چەتن
و وان دبە ل سەر ڕیا
بەختەوارییا باشە سافی.

هەر باواربوونە کو یەقین
ئەو پەر و باسک ددە مەرییا.
ب وان دفرن بەر ب عەزمێن،
ژ ور تینن بەعس و مزگێن.

باواربوونە مەرییا دبە
بن بەرێ کوورە نەدیهار،

ور سورا بەرێ ڤەدبە

بۆ عەمرێ خوەش، بەختەوار.

***

تەبیەت بەدەوە، دلۆڤان، شیرنە بێ حەساب،

جارنا سەر مەرییا هێرس دبە، ل وان دبە سەبەب،

لێ ئەوێ بەدەوییا دو دلا لاپ باشقە دایە،

شورەتا وێ ژی هەما خووت ئەو ئە، کو هەیە.

***

ئیرۆ وەرگێ مە ڤالا بوون

زۆزانڤان تەڤ کشییان و چوون،

ئاخ دلێ منی ڕەبەن ژی

دووز مینانی وان زۆزانا

مایە لاپ خکە و خالی

بۆنا وێ خەزالا کووڤی.

***

شاییر ماشۆقێ باهار، تەبییەتێ یە،

زەریێ مە کوردا ژی نەخشێ وێ نە،

دنیا بۆنا من سەرقۆت و پێخاسە،

ئەگەر تونەبن ئەو کولیلکێد خاس ئە.

***

کانی منڕا بوونە زمزم،

بوومە وەک سیمێ لوبوودچیا،

تو باوار ناکم ئەو ئەزم،

دلێ من دا حسرەتا چیا.

***

دلێ شکەستی پێ چ شا کی،

پێ دلێ کێ وی ڕازی کی،

ئەو كنج نينە تو پينە كى،
حوب ا مايين چاوا لێكى؟

***

گاڤا دەستێ يەكى دا
ڤالچيچێكا دبينم،
بەرخوانتييا خوە بير تينم.

## حوب

گەلە گەرييام، چوومە جييا،
خوەليا دنێ د بن پيا،
زۆزان، ئاران ئەز گەرييام،
حلكشييامە سەرێ چيا،
نشكێ ڤا ل وێ دەرێ،
وا من قەلفێ قيزا دى،
بەر ب وانا چووم هێدى.
ناڤا زەريێ خەملى
من زەريكە باشقە دى...
زمانێ وێ كورمانجى.
ئەوێ بەدەوييا خوە ڤا
ئەز حەلاندم جى ب جى،
و شەواتا وى دلى
كەتە ناڤا ڤى دلى،
ڕوحێ من دا ململى.
ئەز حەيرانا وى دلى،
دلێم وێ ڤا خەملى.
برا گوربە حوبا من،
بشەوتم سەرى، بن،

لێ ناخومزم یەکە دن.

***

ئێڤار کو تێ سەر زۆزانا،
کولیلک، ڕهان، گول و سۆسن
ئازا دبن ژ بن پێ مەریا،
بینا وان خوەش بەلا دبە.
کالینا میا، بەرخ و کارا،
گرییێ زارا، قیرین، هەوار،
خولە-خولا جەو و کانییا
و شنگینا بێیە نازدار
تەڤهەڤبوویی ل هەر ئالیا
دبن عەینی حەزار-حەزار
دەنگبێژ، ئاشقێ ئێڤارێ،
ڕوحدار و خزمەتکارێ وێ.

***

لاوکێ من شیرن ڕازایە، هشیار نابە،
لێ ئاخرییا من بەلەنگازێ وێ چاوا بە؟
نە من ئانجاخ مەجال دیتیە، خەولە بوومە،
تەنگەزارم، نە مەجالە، نە قودوومە.
ئەگەر ئەز قژکێ قێمیشییا وی ناکم،
ژ خەوا شیرین وی ڕاناکم،
لێ گەلۆ دلێ من و وی لۆما ناکن؟

***

کاڤا دهات شنگینا بێ،
من ترێ دەلالا من تێ.
کاڤا ددیت کار-خەزال تێن،
من ترێ وا ڕێچا وان ڤا

نها دەلالا من وێ بێ.
گاڤا پلتێ عەورا سیا خوە
داڤێتنە بنەتەرا زنێر،
من دگۆ: "ئەز حەیرانا تە مە،
ئەزێ نها داکەڤم ژێر".

***

بۆنا-حوب، حسرەتا بەدەوێ
دلێ من بوویە وەک تەیرێ هەوێ،
بێ دوو دشەوتم بۆنا وێ.

***

ئەز ناسی ئەلەگەزێ مە،
خەیسەتێ وێ پرجوورە یە،
جار هەیە شیرن دکەنە،
گازی زۆزانڤانا دکە،
ل بەر وانا کولیلکێ خاس
ڕادخە چاوا خالیچە،
وان قەبوول دکە دلحەواس،
کانییێ خوە دکە شەربەتتاس،
ب جەو، کانییا دەفێ دخە،
تەیر-توو دکەڤنە ڕەقاسێ.
جارنا هێرسا وێ ڕادبە،
پرچییێ وێ دبن خەنجەر، شوور،
عەورێ ڕەش، گران تۆپ دکە،
قەی برووسک ژ دێڤ دبارە.

## رۆیێ مەرا دلیست

رۆیێ پر حزدکر
نشتێ بێ سووج هەرجار،
لەما ژی ئەو مەرا
ببوو عەینی هەڤال.
سبێ بەربانگێ زوو
وە پێ بانگا دیکا
وا ژ خەوا شیرن
ئەم رادکرن پیا.

و تەڤی چڤیکا،
تەڤی کارا، بەرخا
دکشاند، دبرە دەر،
ئەم دسەکنین بەر.
دێمێ خوە ڤەدکر،
قەی ب وی جوورەیی
ئەم سلاڤ دکرن،
و مە هەڤرا دلیست...

قارە–قارا مە بوو،
دەرڤا ل هەر دەرا،
حەتا کو ئێڤارێ
رۆ ژی دچوو ئاڤا.

لیستکێ دا رۆیێ
ل پش پلتێ عەورا
جارنا خوە ڤەدشارت،

کرین ژێ نەدهات.

فەسال و دزی ڤا
وێ دینا خوە ددا،
گەلۆ ئەمە بێی وێ
قە چاوانن هەڤرا.

لێ گاڤا گلیێ خراب
وێ ژ مە دبهیست،
ڕووێ خوە دگوهاست،
ئیدی نەدلیست.

جەزایێ وێ ئەو بوو،
کو پێ تیرێنجا خوە،
ئەوێ قایم دگەست
سەر، چەعڤێ مە و دمست.

وێ عەور قەی شڤ دکر،
ل عەزمێن ومر دکر،
چاوا حەزار تۆپی
تو هەڤرا قورمیشکی،

ب هێرس درمشاند
تەیرۆک و باران،
تەڤی هەڤ دکر،
زۆزان و ئاران.

پێ دمنگێ عەورا
دکره قیرین،
قەی دگۆت "تەسلیم،

تەسلیمبن، تەسلیم!..."

وەختا هێرسا وێ
ئێدی دادانی،
گاڤا ددیت ئەم
بەر خوە دکەڤن،
وێ بارشبوویی
ناڤ کەسکەسۆرێ
دگۆت عەدلای!

ڕۆیێ مەڕا دلیست...

***

خەزال کارێ خوە ڤا
ئیدی هلناکشن
ل سەرێ زنارا.
زۆزانڤان تونەنە
ئیدی ل وان دەرا.
چیایێ بلند، بانی،
مانە بێ بنەلی.
گول، کولیلک تەلیانە،
قەی ئاخینا وان ئە.
بلبل قەی دنەعلن،
کو ئەو تەنێ مانە.

## تە منڕا تو گۆتیە؟

تە منڕا تو تشتەک گۆتییە،
وەکی دل-هناڤێ من سۆتیە؟
نزام چما تو ناخوەزی

تشتەکی خولامێ خوەڕا بێژی.
چەعڤێد تە دا ئەز دبینم
حوبا ڤەشارتی، خەم و ڤەنافی،
بێی وێ ژی تو شەوات، ئالاڤی.
دل، چەعڤێد مە بەسبرێ هەڤن،
چار و گومانا مە هەر ئەون.
بەختێ تە مە، تو تشتی نەبێژە،
دیندارا تە ڤا ئەز دژیم،
دلێ من بۆی تە های گێژە،
ناهێلە یا خوە تەڕا بێژم.
تە منڕا تو تشتەک گۆتییە،
وەکی دل-هناڤێ من سۆتییە؟

## ئەلەگەز

تو بێشیکا منی ئەلەگەز،
پاشلا تە دا مەزنبوومە ئەز،

تەبیەتێ خەملێ خوە دایە تە،
و کرییە جنەتا ڕوحێ مە.

تو ئالی، سپی، شینی و گەڤەز،
و شاییری بێ قەلەم، کاخەز.

کوبار سەکنین بەر مە بێمنەت،
تو خەملا خوە ڤا چاوا جنەت.

تو زەف حەلالی و بینسڤک،
بەر دلێ من وەک خەزنە و ملک.

کلامێ تە زەلالن، فەمدار،
ڕمحما دلایی، ستار و چار.

پێشیا نەراستییێ مژی، دوومان،
تو برووسکی، تەیرۆک و تۆفان.

لێ بۆی حەلالییێ باغی و ڕەز،
خەیسەتێ تە ڤا مەزن بوومە ئەز.

من بال تە ددیت خەو و ڕحەتی،
چاوا ژ دیا خوە یە ڕەحمەتی.

دە ڤەکە پاشلا خوە، ئەلەگەز،
دلوەستیایی تێمە بال تە ئەز.

تو بێشینگا منی، ئەلەفەز،
پاشلا تە دا مەزن بوومە ئەز.

## دنیا یا منە

ئەز دەولەتیمە، یەکی بەر بچەعف،
دوڕێ من و وێ نە هیف و تەعف.
خولە-خولا ئاڤێ کانییا
ڤەی خەبەردانا یارا منە
و ئەز وێ ڤا دبم حژمەتکار.
شنگینا بایێ خوەشی نازدار
ڤەی ڕامووسانا یارا منە.
ئەو بەرفا چیا ئوسا ڤەرقاش،
ڤەی سینگ و بەرێ یارا منە،
ئەز لێ گیرۆ، یەکی سەرخوەش؛

کولیلکێ ور لباسێ وێ نه،
هەموو ڕەنگێ خوەستی ژی لێ نه.
مژا زراف ژێ ڕا خێلییه،
کەسکەسۆرا حەفت ڕەنگ خێلییا وێ،
مێرگێ کولیلکا، گەلی و چیا
شکەفتێ مەزن ڤک و ڤالا
ڤەی بۆنا مە کۆچکە و سەرا،
ڤەی مالا منە، مالا عەسلی؛
ئەز زەعڤێ تەبیەتێ و چیا مە.
ور زەوجیمە ب عەدەتی،
هیڤ ژی مەڕا شەمدانە، چرا،
بۆنا ڕۆژێد ئۆغرمێ گران
برووسک مەڕا تۆپ، جەبرخانە،
دەلالا خوەستی پاشلا من دا نە،
تەیر و تووێ وێ دەرێ سازبەندێ مە،
پەر، باسکێ وانا مەڕا دەفە.
ئەمن بووک و زەعڤێ تەبیەتێ،
بهارا ڕەنگین بۆنا مە تێ.

## دو برا

## (زارگۆتنا جماعەتێ)

هەبوون–تونەبوون...دو برێ حەلال،
ئەوێ تە بارش، هەڤرا جان–قوربان،
ئاقلن، تمێ گورا هەڤدانن،
قەدرێ هەڤ زانن، هەڤ دهێڤشینن.
و وا تێ وەعدێ وانی زەواجێ،
مەجبوورن بژین هەرچار تەڤی هەڤ،

ناڤا مالەکێ، بەر ئاگرەکی.
لێ تالەبەختێرا تو وەرە ئێژا
یۆلە نەدچوون هەردو ژن هەڤرا،
هەڤرا دکەڤن تمێ هوجەتێ
و هەر ڕۆ دەنگێ شەر-دەعوا وان تێ.
خەباتا برا جۆت و جۆتکاری،
دەستی ژنا کەڕن و ستوخار.
ژ شەرێ ژنا برا تاب ناکن،
هەبوونا خوە پارەڤەدکن،
ئیلاجبری ژ هەڤ جهێ دبن.
برا حەیرا هەڤدانن هەر جار
لێ ژنێ وانا، چاوا گورێ هار.
تێ وەختا ناندروونێ، بێدەرێ
و گاڤا ل ڤرا تو کەس نامینە،
برێ مەزن ئێ بچووک بیر تینە:
"برێ من هێ جهالە، نەزان،
ئەز هنەکی زێدەکم ڕسقێ وان".
گورزا سەر پارا برێ داتینە...
لێ ئێ چووک ژی وا دفکرە:
"زارێ وی زەفن، ژنە کافرە
ئەڤ گورز ژی ژێرا ئێپێجە کارە"...
چەند گورزا داتینە سەر پارتا برێ،
ب دلەکی ڕحەت ئەو دچە مالێ.
ئوسا چەند جارا هەڤدو بیر تینن،
لێ قەت هاژ سورا هەڤ نینن.
جارەکێ ژی ئەو هەڤدو ناڤینن.

کاڤا گورز داتینن سەر لۆدێ هەڤ،
گورز هەوێدا کفش دبن بەر چەعف.
برا ڕاستی هەڤ تێن، هەڤ حەمێز دکن،
هەڤڕا شا دبن و تێر دکەنن.

### مقامێ جماعەتێ

دە یار وەرە، ئەز خەریبم،
ئەز خەریبێ نە ل ڤرم،
کەسیب هاتم بوومە بەنگی،
ئەز حەیرانا تە وی دەنگی.
لێ، لێ، لێ، لێ ...

***

ئا خ، دلێ من نالە-نالە،
تو کەسەکی ناهێلە بالە،
بن پەردێیە، کەس نابینە،
گەلۆ چ سەرێ من تینە...
لێ، لێ، لێ، لێ...

***

ئێتیم مایی بێ هەسپ، پەزا،
کانێ هەسپێ تەیی بەزا؟
دلێ من باقە گولێ بینە،
لاوک نائێ بینێ بکشینە،
دە لۆ، لۆ لۆ، تو خەریبۆ...

***

گوندێ مە دا چ گەلی نە،
چاردۆرێ گوند چەعفکانی نە،
باوارییا تە بلا هەبە،

کانی سەبا کشکا نینە.

لۆ، لۆ، لۆ، لۆ....

***

تو هورمیيا ژ خاس هورمیانی،

تو کاکلا زەر گووزانی،

تو مەلهەما قەنج دلانی،

تو هن گولی، هن ڕهانی.

لێ، لێ، لێ، لێ...

***

سوورەتێ تە هیڤا زەرە،

ڕامووسانە هێ وێ سەرە،

تە چەعڤرەشێ هەبا تری،

شڤانێ خەریب هات تو بری،

ئاخ دە لێ، لێ دلۆ، ڕەبەنۆ...

***

لۆ، لۆ، لۆ، لۆ...

دلۆ ڕەبەنۆ،

قیزێ جانێ، ئەمە جۆتن،

کانی، سۆسن و کەڤۆتکن،

ئاخ، بینا ڤان گول، سۆسنا

چاردۆرێ مە وێ ئەم سۆتن.

دە لۆ، لۆ، دلۆ ئێتیمۆ...

***

لۆ، لۆ، لۆ، لۆ...

دلۆ ڕەبەنۆ،

هیڤا گوندێ مە دەرکەتیە،

چاردۆرێ گوند هیڤەک زەرە،

ها دزڤره و وێ شەڤێ

قلۆرخ گرتن، دانە بەرە.

***

هیڤ چوو ئاڤا کو ڤەگەرە،

لێ دلێ من عەقدێ خودێ

نزام چما، مەعنی چییە،

وا خەیبدیە، ڤەناگەرە،

دە لۆ، لۆ، لۆ لۆ...

***

ئالیێ ئەلەداخێ مژە،

قەی تەیرۆکە ور درژە،

ورا دایکا من دگری،

هەیرا مندا کەر و گێژە.

لۆ، لۆ، لۆ، لۆ...

***

ئاخ ل سەرێ ئەلەداخێ

میکە خەریب وا دکالە،

زەلوول-زەلوول ها دنالە،

هن دکولە، هن دکالە،

دە لۆ، لۆ، لۆ، لۆ،

دلۆ خەریبۆ.

***

میا گێژ بەرخا خوە دگەرە،

وا گەلیکی کوور پشبەرە.

بەرخ سەکنیە ها ڤا گێلی،

نزانە چ وێ بێ سێری.

لۆ، لۆ، لۆ، لۆ...

***

ئەز خەریبم، ئاخ خەریبم،
دبە خەریبییێ دا بمرم،
تو کەس تونە منرا بێژە
- نە دایکا تە بۆ تە گێژە؟
دە لۆ، لۆ، لۆ، لۆ...
***
خۆرتەک کەسیب، لاوکێ دەلال،
چاردۆرێ من گەلی، نەوال،
ئەز دحەلم، تو نزانی،
وەرە دەرخە ژ ڤی فالی.
***
دە هێرس نەبە، منرا بێژە،
ژ ڕوحێ من بەلەنگازی
دلێ قژک، ڕووت و تەزی،
بریندارۆ، چ دخومزی؟
***
قیزێ، جانێ،
وەلە ڕسقێ تەیە کولاڤ،
و خومیێ تە لاوکێ شڤان؛
ل تە گرتییە ئاگر، ئالاڤ،
من قەلیایە هم نان، هم ئاڤ.
***
خۆرتۆ، قوربا،
تو دەولەتیێ نەکە مەعنە،
ئیلاجا من ئیدی تونە،
دل، جان تو من نەکی پیرک،
خۆرت دبینم، دبم قیزک.
***

ئاخ زۆزان، سەد جار زۆزان،
هەرسال تەڕا دبم مێڤان:
مێڤانێ من نزام چما
تو شەڤەکێ بال من نەما.
وا بەنگییا من عەڤدا خودێ
مینا کنجێ خاس و قوماش
وێ بززن ناڤا تێرا،
نزام کێ ڕا.

***

دلێ من قەی ئێ من نینە،
بەژنا لاوک کو دبینە،
قالبێ من دا کول-برینە.
دەردێ دلێ من فەقیرێ
وا گەلە، گەلە گرانە،
باوارکن، ئانگۆری بارێ
بیست و شەش دەڤانە.
هەرچێ دەردێ دل نەدیتیە،
ئەوی ترێ هێ سڤکە.

***

دە تو وەرە، لاوکێ دەلال،
باوەر نەکە هەموو کەسی،
مینا کانییا لاپ ئاڤزەلال،
ئەز یا تە مە، وەکیل نەفسی.

***

ئاخ، حوبا من لاپ ئاگرە،
تەندوورەکە گەلە گورە،

قەی گرکا ئەز لێ ددم،
تو گرکەک لێ ناگرە.

***

دلۆ، جانۆ، ئەز دخوەزم
تەڤ من شابی خوەرا هەرتم،
ب کێفا خوە، بێغۆف، ئازا،
ها برەڤی پەی خەزالا.

***

دلێ مەرووم، ژ من نەترس،
پاشلا خۆرتدا تێ بێغۆڤ بی،
وێ دەرێیە بەنگییا خالس،
ژ من ئێدی تو نارەڤی.

***

دلۆ، برا هەما شەڤەک
مەری پاشلا جانکێ خوە بە،
ژ ور شوون دا جەعنم و گۆڕ،
لۆ چ دبە، برا ببە،
مرنێ وێ دا ئێد چ هەیە؟..

***

دلێ مەعرم، دلێ پەعتی،
وەعدێ زێرین ئوندا نەکە،
زوو کارێ ڕەڤا خوە کە.

## پۆئێم

### سحید

ئالییێ ئیگرداغا بلند، وی بەری،
سەر سینۆرێ ئیرانێ و ڕۆمێ
هەنە چیا، کانی، کولیلک و گەلی،
ژ وانا بەرژێر شەهەرێ ئوورمیێ.
گوهدارکن، مەڕا بڤنە هەڤال،
ئەزێ وە ب گلییێ تەیارێ کال
بڤم ناڤ گەلیا و سەرێ چیا
و نیشاندم برینا دلێ گوندییا.
وەختێ چەعڤێ من گوندییا کەت،
مەلوولتی ڕوونشت سەر دلێ مندا،
مینا پاییزا ڕۆژکەرەکە کن
شڤانتییا من هاتە بیرا من.
ئەز وە ناڤم ناڤ باغێ گولا،
و ڤەناکم حزکرنا دلا،
ئەزێ وە بڤم چیا، ناڤا گوندییا،
گەلۆ چ دڤێژن دەرهەقا خوەدا؟
گلی دەرهەقا سێ مەریادانن:
سحیدێ کورمانج، خەبیتێ فارز؛
ئەو هەردو ژی شڤان، هەڤالێ هەڤن،
ئێ دنێ–قورانیێ توجار فارز.

١

ڕۆیێ شەوق ددا ژ ئۆرتا عەزمێن،
سیا مە سەر حەسپا نەدکەت عەرد ێ،
ئیدی وەستیا بوون ژ حەسپا و زین،
لێ سەر حەسپا تو خەوا کێ تێ؟
کولیلکێ سەر ڕێ ڕەنگ-ڕەنگی و خاس،
ئەم پەیا دبوون و دبوونە ناس.
ئاڤا کانییا ب دەنگەکی خوەش
کولیلکا ڕا کەتبوو گولاش.
باکی هێنک دۆرا مە دبەزییا،
مەرڤ نزانبوو کو دا دلەزییا.
ئەم چەند هەڤال بوون، سییاری و پەیا،
ئیرانێ دا بلند بوون سەرێ وان چیا.
ئەم چاوا کڤش بوون، گوندی ژی تۆپ بوون،
ب دلەکی خوەش نێزیکی مە بوون.
ئەم خوەڕا ڕوونشتن ناڤ کولیلکا.
چارنکالێ مە چاییر و چیمان.
ژ مە هنەکی دوور، سەر چەند گاڤا،
خوەش دهات دەنگێ ئاڤا کانییا.
دوو ڤا دەنگێ بلوورێ خوەش دهات.
ژ دەنگێ بلوورێ مەلوولتی دباری،
بایێ سڤک ژی دەنگ بەر ب مە دانی،
مەری ترێ دگریان گوندی و کانی،
کو دژیان ناڤ عەمرێ ڕەشی تاری.
تەیارێ ئەختیار ژ مە پرسی:
– دخوەزن گازی وی شڤانیکم؟

وەعدەکی کن دا ئەو بلوورڤان هات،
سەکنی بەر مە ب دلەکی شا،
ب عەشیرەتی وی سلاڤ دا مە،
هاتنا مە قەبوول کر سەر چەعڤا،
مینا زنارەکی جیێ خوە دا ما.
شڤانێ جاهل کومێ وی قوّت بوو،
چەعڤرەش، بەدەو و بەژنبلند بوو،
ئێ سحید دنهێری، دما حژمەکار،
شکلێ وی بەر چەعڤێ من ناچە توجار.
گوندیا گوّتن کو بلووریخە،
دەردێ گران ژ وانا دوورخە.
ئەوی لێخست ب مەلوولی،
کلام دسترا ب زەلوولی.
هەر کلامەک ئەوی دگوّت،
دل، هناڤێ مەرییا دسوّت.
وەعدەکی شووندا مە ترێ چیا هلشیان،
پەزێ بلوورڤان بەر ب مە کشیان.
بلوورڤان کو دیت قەیدە گوهاست زوو،
نێری جیدا سەکنی، پەز ژی دوو،
پاشێ هێدی-هێدی پاش دا چوون.
تەیار بلوورڤان نهێری دلشا، کوبار
و ڤر ریسپیێ مەیی ماقوول، خێرخاز
شڤانێ پسپوّرا ئەم کرنە ناس:
– ئەڤ بلوورڤان، ناڤێ وی سحیدە،
و خوە ژی دەنگبێژێ ئێلا مە یە،
کلامسترانیدا دلشەوتییە،

گلیێ وی خوەستنا مە زوودایە.
سحیدێ مە عەینی تەیرێ چیا یە،
ئەو مینا بازێ بێ پەرە،
ل چیا و بانییا دگەرە،
سەر زنارا، رەخ کانییا.
چ بێژم مێڤانێ مە ماقوولرا؟
سحید شڤانەکی ل سەر خوە یە،
بلوورا وی تمێ سەر لێڤا یە،
کولاڤێ کال و باڤا سەر ملا،
هەڤانا نان ل سەر پشتا وی یە،
کەری ژی ئوسا هینی وی بوو یە،
هەرگاڤ، تمێ چاردۆرێ وی یە.

٢

– مێڤانێ عەزیز، راست وەرا بێژم،
ئەم حالێ نیڤمری دژین ڤان دمرا،
ژ هەبوونا خوە دمینن تما،
پەعرییێ شیرن دمڤێ خوە دبرن،
چەعڤنهێرییا پاییزێ دمینن.
کەسیبتی پێسیرا مە بەرنادە،
نە ژی کول و دەرد مەجالێ ددە،
ئانجاخ ئەم دکن عەبوورا زارا
مقابلی نەیارا و گورا.
زڤستانا چەتن کو تێ سەر وارا،
ئەم دبن چاوا دارێ بن خزمرا.
کێماسییا مە ژی قاسی بەرا
و مە دخەنقینن هەموو دمرا.

چقا تەنگاسییێ ڤەرێ دکن،
پێسیرا خوە ژ وێ خلاس ناکن.
من عەمرێ خوە پاکی دەرباز نەکر،
گەلە مەرییارا ژی بوومە جینار،
چەعقێ گشکا دا تژی خەم، خیال،
ئاخین و شەرێ دلێ وانا دیت.
هەمی زارۆتی، خۆرتتی و کالتی
هەڤ جودا نەکر و پێ نەحەسیام
چاوا دەرباز بوون و دەرباز دبن،
لێ پەی وانرا نێزیک دبە مرن.
ژ خەرجێ دیوانێ ئەم چەعڤترسن،
حالێ مە ژی تو جارا ناپرسن.
ڤرا تو کەس تونە مە بیر بینە،
بنهێرە و برینێ مە بجەبرینە،
خوەندن و نڤیسار تونە ناڤ مەدا...
تەیار گلییێ خوە پێشدا دبر،
گەلەک گۆتن قسە دکر:
– مەسەلە، ئەم هلدن سحیدێ مە،
هەبوونا جامێری چ کو هەیە،
تەمامییا خوە ڤا گشک بەر چەعڤە:
گوهدرێژەک، سی پەز و کاڤر،
ئەو بلوورا دێست و دو سەێ دڕ.
برا بباغشینە سحیدێ مە،
سەرهاتیکە وی ئەز کن بێژمە وە:
چەند سالا بەرێ گلی قەومیە،
ڕۆژەکە پاییزێ سایی و زەعف خوەش،

هنه گوندی ب سەرکارییا کەلەش،
هێ نیڤێ شەڤێ، گوندی ڕازایی
مینا دیکێ نیشەڤ کرنە گازی.
لاوکێ گوندێ مە ژ کۆما کەلەش،
تۆپی سەر هەڤ بوون کو هەرنە شەهەر.
نیڤی مەلوول، نیڤی ژی شا دبوون،
دلێ هنەکا ژی قە ڤەنەدبوو.
کولفەت و زارۆ ل دۆرا وانا،
هەر یەکی ناڤێ تەمیکی ددا،
دومکلاندن کێماسییێ مالێ:
پتک، نەفت، شەکر و جێرێ ئاڤێ.
هەر یەکی خوەرا دبر پەز، بزن،
گا، هەسپ، چێلەک، پەنێر، ڕوون، هری،
چ کو وانا ژ دەڤێ خوە بری.
سحید ژی کەتە ناڤا وێ کۆمێ،
ئەوی خوەرا دبر دەهـ می وێ دەمێ،
گومان-عەبوورا زارایە سالێ،
بەرێ خوە دانە بەر ب ئوورمیێ.
سحید بهیستبوو کو کریڤێ وان
مالا خوە ڤا ل ئوورمیێ دما.
کریڤەکی باش، کریڤێ کال-باڤا،
دمری ڤەکری بەر هەموو مەریا،
لێ ناس نەدکر ئەوی مالا وی.

تژی پەرچە بوون دکانێ ئوورمیێ،
گشک مالێ ئینگلیس، مالێ ئامرکان،
توجارا دوڕووتی پایێ وان ددان؛

پێ وێ هەبوونێ وەلاتێد دنێ
خوە خەملاندبوو شەهەرێ ئوورمیێ.
هەبوون مەری ناڤا ڤێ کۆمێ،
کو جارا ئەولن هاتبوون باژێر،
نەدیبوون ئورمیا "تژی و تێر"
ئەوانا ترێ مەریێ وێ دەرێ
گشک ژی باش دژین، چەعڤتێرن، ڕازی.
سحید چاردۆرێ خوە دنهێری،
دکانێ تۆپ، تژی، ئەشیێ لۆدکری،
لێ وەرە بنهێر کەسی نەدکری.

توجارەک چاوا مەریکی سەرخوەش،
وەختا سۆقاقێ وی دیت میێ قەرقاش،
نەرحەت بوو، لێ خوە زوو زەڤتکر،
پاشێ فکری، پیڤا و بری،
نێتەک قرارکر و ... ڕێک خوەڕا دی.
گەرەکێ بێژم قورانیێ توجار،
زمانێ کورمانجی زانبوو زەعف باش،
زمانێ توجارا ژ هەمی دها باش.
زەعف دەرەو دکرن ئەوی هەر جار،
زارێ خوەش دیڤدا، لێ ب خوە عەینی مەعر.
قورانی تەلیایی دچوو پەی کۆمێ...
مەریێ کۆمێ بلند ناڤێ هەڤ ددان،
ناڤێ خوە و ئێ نەفەرێ مالێ ددان،
ناڤێ سحید، ئێ کور، باڤ، ژنێ،
چەند جارا هاتە وەکلاندنێ.

ئەو کۆما گوندیا، کۆما سەرێ چیا،

بەر ب كارڤانسەرێ هلدكشیا،
سحید بەر دكانەكێ خوەڕا سەكنی،
نەفەرێ مالێ هاتنە بەر چەعڤێ وی،
فكرا خوەدا هەموو تشت بژارت، كری.
وەختێ سحیدێ مە سەكنی بوو،
قورانی ب لەز نێزیكی وێ بوو،
ئەوی دلەكی دوڕوو و فێلباز،
وی جوورەیی خوە سحیدڕا كرە ناس:
– سەلام، سحید، تو سەر چەعڤا هاتی!
چاوانە شاملێ چووك؟ دبێم براتی،
پەی مرنا كریڤێ حەسەنڕا تو نەهاتی.
چ دكی، دفكری، تو دودلی؟
كەرەمكە، كریڤۆ، ئەم هەرنە مال..
سحید جیێ خوەدا ئەجێڤمایی ما،
" گەلۆ كێ دیتبوو ئەجێبا ها؟
نزانبوو ئەو خەونە، یان ڕاستیە،
دبە كریڤێ كال-باڤایە كو هەیە،
زانە ناڤێ نەفەرێ مالا مە؟
گەلۆ تۆ كێ یی؟ ئەز تە ناس ناكم،
كەرەمكە منرا بێژە تو كێ یی؟
– ئەز كریڤێ حەسەنێ ڕەحمەتی مە،
و ناڤێ من ژی مەحمەد ئاغا یە.
وەختێ باڤێ خوەڕا هاتبوویی ڤرا،
پێنج سالی تونەبوویی تو عەمر ڤا.
كەرەمكە كریڤێ من، كەرەمكە مال،
نانێ كال و باڤا ل تە حەلال!

– ئەو قەزییا یە، یان بەختە، کو هەیە؟
چ مەریکی پاکە، یەکی ڕەحمە.
وی دنهێری کۆمێ، ڕوویێ ئاخێ،
نزانبوو چ جابێ بدە توجار.
قورانی نێتا سحید پێ حەسیا،
لازم بوو دلکرین پێ فەن و گلییا،
کو هێ دوور نەچوویە کۆما وانا.
کنجێ خاس لێ، درانێ وی گشک زێر،
گوستیل، مشتکا کاروبار، قوتییا زێر.
قوتیا تتوونێ، یا زێر وی ڤەکر
و ب فەسال درێژی سحید کر.
جغارا خوە پێچاند، قولاپ دا
و جابا قورانی ئەوی ها دا:
– تەگلیفیا تە ئەز ڕازیمە، ئاغا،
هەڤالارا ئەم هاتنە ڤرا،
مە خوەرا ئانیە چەند پەز، دەوار،
ئەمێ هەرن کارڤانسارا شەهەر.
– کریڤۆ، تو چ دبێژی، ئەڤا نەبوو،
نا، ئانجاخ هاتی شەهەرێ مە،
ئەز گەلە شا مە بۆ دیتنا تە،
هاتنا تە، کریڤ، سەر چەعڤێ من،
چما خوە حەساب دکی یەکی دن؟
– ئاخر تەنێ نەهاتمە ڤرا،
پەز چاوا بهێلم، مەحمەد ئاغا،
سەرێ تە بلا ساخبە مەڕا،
یان، نا چ چەتنە هاتنا منرا؟

– هێ باش، کو تە پەز ئانییە خوەڕا،
زانی، پەز باش دچێرە ئێڤارا،
باغدا برا بچێرە ئەو خوەڕا،
تەڕا بفرۆشم قیمەتێ زێرا.
سحید کەنیا، سمێلێ خوە بادا؛
– برا ئوسا بە، گلیێ تە بە،
ئەز بیر ناکم کریڤتیا باڤێد مە،
شا مە بڤم مێڤانێ مالا وە.
و چوو پەی کۆمێ پەزێ خوە بینە.
قورانی ژ کۆمێ خوە ڤەشارت.
تزبیێ کاربار ژ جێبا خوە دەرخست،
دوعاکر، مۆری چەند جارا ژمارت،
دل لەرزی تلیێ خوە وان خست:
– خێر، شەر، خودێ. خێر..خودێ.
ئەوی خوە ژی خاپاند ل ڤێ دەرێ.
***
بەر چەعڤێ قورانی دەهـ میێ قەرقاش
ئەو حەساب بوون هەر یەک چێلەکەک باش،
زەعف باش بوو، دەستێ خوە دانی سەر پشتا خوە،
سحید و پەز لڤاند بەر ب مالا خوە.
لێ سۆقاقێ ئوورمیێ کوتا نەدبوون،
سۆقاقێ خارۆمار پەی هەڤ ڤەدبوون.
– هێ گەلە مایە کریڤێ مەحمەد؟
– نا، هندک مایە، – جاب دا "مەحمەد"؟
چاوا فایتۆنچی، شۆفێر دەنگ ددا.
سحید ژ پێز دەستێ خوە بەردا.
هەر پەزەک ئالیکی درەڤیا،

سحیدێ مه دما ئیلاجبری.
گاڤا ماشینه سۆقاقێ تەنگدا
نشکێ ڤا دهاتنه ڕاستی وانا،
پەز کووڤی دبوون، دکەتنه مالا،
سحید تەڤ هەڤ بوویی دکەته پەی وانا.
***
قورانی پێ چاکووچێ سەر دێری
دەری کوتا، وەکی بێن ڤەکن،
کو سحید و پێز بڤن جیوەر کن.
وەعدەکی کندا دەری ڤەبوو،
یا ڤەکر ژنا قورانی بوو؛
ژنەکە تژی و سەر خوە بوو،
چەعڤ کوتا چەعڤێ مێرێ خوە
- هـ، ژنک، ئەگەر تە ناس کر، کێ یە؟
وەکی بێژی کێ یە مێڤانە مە،
ئەز، مەحمەدم، تو ژی سوودابە،
"سوودابێ" فەم کر نێتا مێرێ خوە،
کەنیا، تلی بر بەر جێنیکا خوە:
- سفەت ڤا ناسە، لێ نایێم بیرا خوە.
قورانی چاوا ناڤێ خوە گوهاست،
دەوسا قورانی دانی مەحمەد،
ناڤێ ژنا خوە ژی ئەوی گوهاست،
کو ئوندابە ناڤێ وانایی ڕاست.
- کورێ حەسەنێ مەیی ڕەحمەتی یە،
تو زانی ئەو کریڤێ کال-باڤا یە،
من چاوا دیت پێڕا، پێڕا ناس کر،
خودێ ژی کریڤتیا مە ئوندا نەکر.

– ئەو سەر چەعڤا هاتیە، ئەز زەعف شا مە،
ئیرۆ شوون دا ئەو ژی کریڤێ مە یە،
شکلێ حەسەنێ ڕەحمەتی لێ یە،
مەری ترێ هەما ئەوە کو هەیە.
ڕەحما خودێ ل مرییێ وە بە،
ژ وە زەعف ڕازیمە، مەحمەد ئاغا،
حەلالا کریڤێ من، خانم سوودابە،
کریڤتیا مە ژی ئیرۆ خودێ دابە.
– زوو بکە، سوودابە، تو نەسەکنە،
کریڤێ سحید وەستیایی و برچی یە،
هەرە نان و خارنێ حازر کە،
لاییقی کریڤێ خوە تەگلیفکە.
***
قورانی خوەیێ باغ، بۆستان بوو،
دارێ ناڤ بێغ خوە خەملاندبوون،
چ ئێمیش تە بخوەستا هەبوون،
و دار بن گرانییێ خار دبوون.
ناڤا بێغ دا جەوەکە مەزن هەبوو،
سەر جەوێ سحید پەزێ خوە تێر ئاڤدا،
تەڤی قورانی پەز کرنە تەولێ،
گیها دانین بەر پێز، چوونە مالێ.
هەردو کریڤ ژی سەکنین سەر بالکۆنێ:
– کەرەمکە، کەرەمکە ڕوونێ، کریڤۆ،
نە تو وەستیایی، پەرتییی ئیرۆ.
قورانی گاز ژنا خوە کر؛
– سوودابە، زوو وەرە، ئەم برچینە،
تەختە مەڕا زوو حازرکە،

سوودابه هات، چەعف ل مێر قورچماند:

- نا، وەلە، ئەڤا نەبوو، مەحمەد،

تە خوەڕا پالدایە سەر تەخت،

مێڤان ژی سەر عەردێ نەرحەت.

کریڤێ سحید، ڕوونێ جەم کریڤێ خوە،

مالا مە حەساب کە مالا خوە،

و چارخێ خوە بێغە، بێمەعنە،

لنگێ تە بشۆ ژنا کریڤێ تە.

بۆنا لنگشووشتنێ سحید سۆر بوو،

ئەڤ ژێ ڕا پرسەکە زەعف چەتن بوو.

ژ فێلا وانا ئەوی باوەرکر،

و ژ ناڤ خوەدا ها فکری:

- وەلە نەبوو، ئیزنێ نادمە خوە،

ئەز شڤانەکی سەرێ چیا،

جامێرا بۆنا خاترێ باڤێ من

حورمەتەک لاپ زێدە دانە من.

تلیێ وێ لایقی ماقوولا نە،

نە کو بۆنا مەریێ نۆتلا منە.

- زەعف ڕازیمە، سەر عەرد ێ ڕحەتە،

شووشتنا لنگا... ئەزێ خوە بشۆم.

قورانیە توجار، ب قەرف وا گۆ:

- ئەم ژی عەشێرن، عەشیرن ئیرۆ،

تو چ دبێژی نە پاکە مەڕا،

قە ڤەنەکشە ژ قەیدێ هاڕا.

چەند دەقە شوون دا سحید ڕابوو چوو.

باغێ قورانی بەر چەعڤا نەدچوو،

کیلەکا جەوێ، سەر چیمەکی ڕوونشت،
ـەوی سەر-چەعف و لنگێ خوە ڕند شووشت،
حژمەکار دنهێری باغ و جەوێ،
شاشمایی ببوو ژ وێ بەدەویێ،
نەدخوەست دوورکەتا ژ باغ و ئاڤێ.
قورانی دیت کو سحید ئەگلە بوو،
ب مەعدەکری ژ جیێ خوە ڕابوو،
سەکنی بەر بالکۆنێ، دەنگ دا وی:
- کریڤێ سحید، نە تو قودووم کەتی،
دە زوو بکە، وەرە، چ تە قەومی؟
تو برچیی ئاخر، ئوسا نەبوو،
نان زوو ڤا حازرە، خارن سار بوو.
***
سحید وەختێ هاتە هوندور، شاش ما،
تەختە ئانجاخ سەکنی بوو سەر لنگا:
ئێمیش؛ - هنار، تری، سێڤ و هورمێ،
پلاو، سەر دا تژی کشمیش و خورمە.
سحید ملێ خوە هلکشاندە ژۆر،
خارن دەست پێ کر، ب ئیشتەکی زۆر.
ژ خارنا ئوسا تەمز و باش،
ئەوی نەدخوەست ئیدی خوە بدە پاش.
ژ وی ئیشتەیی و خارنا سحید،
قورانی مەجالا خوە نەددیت.
سحید پێ نانێ لۆش دەڤێ خوە تەمز کر،
ئەوی قورانیڕا وا گلی کر:
- ژ چیایێ بلند جیێ دوور نەچوومە،
لێ زانم تەنێ دلساخی دمینە،

دلساخی تشتێ کرینێ نینه،
ئەو عەینی مەرڕا مەسەب و دین ئە.
هەر مەرییارڕا تەمزایی دمینه.
قورانی دلێ خوەدا سحید کەنیا.
"وەرە بنهێرە ئاخریا من و وی،
دخوەزە خوەرا تێکە مێرانی،
دەرسا تەمزایێ ددە قورانی.
توێ پاشێ بزانبی کێژانە باش،
خارنا پەلاو، سەر کشمیش، نانێ لۆش،
یانێ ئەو دلخاسیا بۆش؟
وەلە تو نابی خوەیێ مییێ قەرقاش.
ئەو زمانێ کو نها ل تە یە،
پێ وی تێ بێژی قوران کیە".

***

پەی خوەرنێ سحید چوو ناڤا باغچە،
گەلە وەعدە گەریا دۆرێ دارێ ئالووچە،
جیێ باش بژارت بن دارا شفتەلیێ
یا خوە خەملاندبوو ب ئێمیشێ شایێ،
چاوا دارا دەعواتێ، یا بووک، زەعفێ،
قەی خوە خەملاندیە بۆنا مەریا،
ئەو بن وێ دارێ ڕحەت خوەرا پالدا.
ژ ئێمیشێ گران چقێ دارا بوونە خار،
تژی سێڤ، ئالووچە، هورمێ، هنار،
سحید ژ وانا مابوو حژمەتکار،
فکرا دا ئێمیش بەرەڤ دکرن،
ئێمیشێ باش، بۆنا شاملێ خوە،
تژی دکر پاشل و جێبێ خوە،

و یەکۆ-یەکۆ ددا عەزیزێ خوە.
شامل ژی دخومر، پێرا دکەنییا،
سوورمت لێ سۆر، مینا وان شەفتەلییا.
سحید فکرا خوەدا دوشرمیش دبوو:
ئەو ژ چیە کو تشتێ وا دبە؟
ژ خوەلیێ ئێمیشێ ها چێ دبە،
چرا جەم مە ژی تشتێ ها تونە؟
چما ئەم ناڤێژن، خوە گونە نینە؟
سحید ترێ هەما ئەڤە جنەت.
نا، جەم مە تژی کولیلکن بینخوەش،
ئاڤا زەلالە و سار، خوەلیا ڕەش،
ئەگەر ئەم گوند دا دارا باڤێژن،
دارێ ئێمیشا جەم مە هێ وێ باش بن،
ڕەنگێ وانا ژی ئێ کولیلکا بن،
زار ژ ئێمیش هەرتم وێ تێر بن.
زارێ شەهەر دا دچنە مەکتەبا،
باشقە گۆتی زارێ دەولەمەندا،
کنجێ تەزە وان، کوبار و دلشا،
هین دبن گلییێ باش، ئولما.
لێ زارێ مە هەرتم بن پیا، کولما،
شەڤ-ڕۆ ناڤ تەنگاسیێ و زولما.
باش دبوو زارێ مە بچوونا مەکتەبا،
شامل ڕوونشتا کێلەکا من،
تەڤی هەڤ ناڤ باغەکی ها مەزن،
کورمانجی کتێب بخوەندا،
ئەز ژی شابووما ل دلێ خوە دا.

سحیدێ مه فکرا ڤا گەله دوور چوو،
لێ نشکێ ڤا ب لەز ژ ج ڕابوو،
بیر ئانی کەرڤانسەرە، هەڤال،
قرار کر سەریکی بدە وان،
زوو ڤەگەرە بێ ڕازێ، ڕحەتبە،
وەکی هەڤالا پاش دا نەکەڤە.

***

ئەو ئێمیشێ کەتبوون بن دارا،
سوودابە زوو تۆپ کر ژ وان دەرا،
زەمبیلەکە مەزن وێ تژی کر،
و مێڤانێ مالێ ها تەگلیف کر:
– کریڤێ سحید، ڤی ئێمیشی هلدە،
بڤە، تەگلێفکە تو هەڤالێ خوە،
بزانبن ژ مالەکە تێر دچی،
لێ نە ژ مالەکە کەسیبە، برچی.
سحید دلەکی شا زەمبیل هلدا،
هێدی–هێدی چوو بەر ب هەڤالا.
سۆقاقێ ئوورمیێ دا زارێ برچی،
دەستێ خوە درێژ دکرن بەر ب وی،
ئەوی ژی تو تمایی نەدکر،
و ئێمیش سەر وانا پارە ڤەدکر.
هەڤالێ خوە دیت ب پرس و پرسیار،
خوەرا خەبەر دان مینا حەرجار.
ئیدی دەرەنگ بوو، شەڤەکە تاری،
سحید زەمبیل دێست دا زوو ڤەگەریا
بەر ب مالا مەحمەدێ کریف.

لێ نکاربوو بدیتا مالا وی.
وەختێ ژ مال دچوو زەمبیلێ تژی دێست دا،
پرسکرنا کەرڤانسەرێ مەجال نە دا،
کو پاکی بیرا خوە دا خوەی کرا،
بزانبیا ئەو مال کێدەرێ دما،
و ئەو تمێ دگەریا خافلقەدا،
لێ تو کەسی سالخێ مەحمەد نە ددا.
- ئەو مەحمەد ئاغا کێدەرێ دژی،
خومێ باغە، سوودابە ژی ژنا وی؟
لێ تو کەسی نکاربوو جاب بدا وی.
حەتا نیڤێ شەڤێ ئەو گەریا،
ناڤ سۆقاقێ بازارێ ئوورمیێ دا،
ناڤێ مەحمەد و ژنێ ددا.
وەستیا، لنگ پێرا نەدچوون ئیدی،
ئەو زەمبیلێ ڤالا حەمێزکری،
سۆقاقێ دا روونشت و فکری.
ئەوی ئوندا کربوو مالا قورانی.
***
چاوا سبە ڤەبوو، سەحید زەمبیل هلدا،
دیسا کەتە ناڤا سۆقاقا دا.
نشکێ ڤا سەکنی بەر دەریکی،
باش لێ نهێری، دەریێ سۆرکری،
ب دلەکی شا دەری کوتا.
مەری ترێ کەس تونە بوو مال دا.
قورانی کنجێ خوە گوهاستبوو.

سەحید جارەکێ ڤا ئەو ناس نەکر،

قورانی چاوا دهڤێ خوه ڤەکر،
سحید پێرا-پێرا ئەو ناسکر،
و ب جوورەکی هێرس سحید پرس کر:
- دەری چرا دکوتی، چ دخوەزی؟
- ئەزم، کریڤێ مەحمەد، ئەز سحیدم...
- باش، سحید، لێ تو چ دخوەزی؟
- چاوا چ دخوەزی، هاتم مالێ.
- تو کیبی؟ بۆنا چ هاتی مالێ؟
- نە سحیدم، میێ من جەم تە نە؟
- نزانم ئەڤ بەیانییێ سەرێ چیا،
چرا هاتییە ڤر بوویە خایێ میا؟
بەلەنگاز، چ مەحمەد، چ کریف، چ پەز؟
پریسک ژ چەعڤێ سحید دپەکیان:
- مەحمەد، ڤێ لەزێ بینە پەزێ من،
دەوسا کریڤیێ نەبە دژمنێ من!
- دە ڕەتبە، ژ بەر دەرێ مالا من،
هێ نەبوویی گۆشتێ بن درانێ من.
هەرە مەحمەد بگەرە، بڤینە،
ئەو پەزێ تە دایە، ژێ بستینە.
قورانی دەری دادا پاش دا چوو.
سحید گەلە سەکنی بەر دێری،
ئیدی فەم کر چ هاتییە سێری...
***
سحید هەڤالا ڤا چوونە جەم مەحمەد،
پەزێ سحید ژێ خوەستن ب مەعریفەت،
لێ مەحمەد ئینکار کر، خوە نەدا بەر،
سۆند خوار سەر ناڤێ خودێ-پێخەمبەر،

کو نه نافێ وی یه مەحمەد ئاغا،
نه ژی تەوقا وی دگهیژه مییا.

***

سحید ژ هەڤالا پەره هلدا،
و هەڤالەکیرا شەهەردا ما:
چوو گەله جیبیا شکیاتێ خوه کر،
لێ تو کەسی گوهداری نه دکر.
سحید شوخولێ مەحمەد دا سوودێ،
کو لێ بنهێرن ب قانوونتیێ.
و سحیدێ مه ئەوقا چوو سوودا،
وەکی ئیدی تو حال نەما تێدا.
ڕۆژا سوودێ سحید زەمبیل خوەڕا بر،
قورانی بوو مەریێ نەژی-نەمر
سحید سەرهاتیا خوه بەر سوودێ کر.
قورانی پەرەتی، کاغەز-شەعدەتی،
دا ئیزباتکرنێ کو نه مەحمەده،
نه ژی نافێ ژنێ یه سوودابه،
و ژ پەزێ سحید هاژ پێ تونه.
پەی قرارا سوودێ سحید سۆند خار،
مقابلی "مەحمەد" ببه حەیفدار.

٢

تەیار سەرهاتییا سحید کوتا کر
و دەڤێ کیسکێ خوه هێدی ڤەکر،
دەست ب تتوونێ و کاخەزێ کر.
گشکا چەعڤێ مه و سحید دنهێرین،
هنەکا سەرێ خوه دبر-دانین.

سحید مینا مەریێ مەجالبری،
نزانبوو چ جاب بدا وی تەیاری.
– ئاپێ تەیار، تە ئەز دامە شەرمێ!
تەیار کفش کر، کو سحید بەر خوە کەت.
ژ جغارێ دو قولاپ کر ڕحەت:
– سحید، کورێ من، بەر خوە نەکەڤە،
بلووریخە، برا دلێ مە فرە بە،
ئەو گلی قەومیە چەند سالا بەرێ،
ئەو کول ژی خوەرا بر بابێ بێدەرێ.
***
گوندیا هیڤی کرن گلیێ خەتیب کە،
هەڤالتیا هەردو هەڤالا حەلال کە.
– مێڤانێ عەزیزڕا ئەزێ کن بێژم:
خەتیب و سحید هەڤالێ هەڤن،
ژ گوندێ باشقەنە، ملەتێد باشقەنە،
لێ هەردو هەڤڕا هۆگر و برانە.
گوندێ وانا ژی نێزیکی هەڤن،
وەختێ کو ئەز ناڤێ خەتیب ددم،
حەساب دبە ناڤێ سحید مقیم،
هوون فەعمکن ناڤێ خەتیبە هەرتم.
مەعریفەت، خیرەت، خوەستنێ دا یەکن،
بەدەون بەژنێ ڤا ژی هەڤ جودا نابن.
ئەو کولیلکن بۆنا هەردو گوندا،
کو ئوسا شین بوونە ناڤا مەدا.
خەتیب ژی ئەو چاوا مالخێ مالا خوە،
ڕوون، پەنێر بارکری سەر پشتا گا،
بربوو بازارێ ئوورمیێ بفرۆتا.

مەحمەد ئاغا سۆقاقا شەهەردا
ڕاستی وی هاتبوو، پێشییێ گرتبوو،
پەنێر و ڕوونێ وی ژێ کڕیبوو،
قیمەتەکی ئارزان، قیمەتێ ئاڤێ،
خەتیب و گایێ وی بربوو مالێ.
سوودابە دەری بەر وان ڤەکربوو،
پەنێر و ڕوونێ کری جیوار کربوو.
خەتیب ژ مەحمەد هیڤی کربوو.
کو گایێ وی ڕۆژەکێ بما تەولێ،
حەتا خەتیب بکرییا هوور-مووری مالێ.
وەختا خەتیب گا دبە بەر ب تەولێ،
بێغدا دو میێ قەرقش دبینە وێ دەرێ.
پەی خوە دنهێرە تو کەس کفش نابە،
ئەو گا دهێلە نێزیکی پێز دبە،
پێز دبینە، پێرا، پێرا ناس دکە.
ئەو ڤەدگەرە ئیدی دەنگێ خوە ناکە،
گا داژۆ، ژ مالێ دەرکەڤە هەرە.
سوودابە تێ دەری لێ ڤەدکە،
خەتیبێ ڕوونفرۆش ڤەرە دکە.

***

چاوا خەتیب ڤەگەرییا هاتە گوند،
ئەوی، سەعید ڤا گلییێ خوە کرنە یەک،
قرار دەرخستن، قرارەکە پاک،
کو هەرن دۆر مالا قۆرانی بگرن،
و پەزێ سەعید ب زۆرێ بینن.
هەڤالێد سەعید و خەتیب پێ حەسییان،
ژ قرارا وانا خوە پاشدا نەدان،

کورمانج، فارز چاوا هۆگر و برا
ئەو گشک ژی سییاری ڕێکەتن هەڤرا.
هێ نەکەتبوون بازاڕێ ئوورمیێ،
هەسپێ خوە زوو خەملاندن سەر ڕێ،
نیشان دان کو دچن دەواتێ.
هەسپ ئازۆتن و نیڤێ شەڤێ،
سەکنین بەر دەرێ توجارێ ئوورمیێ.
خەتیب زوو ڕابوو سەر پشتا هەسپێ،
ژ دیوێر خوە ئاڤیتە حەیاتێ،
ب لەز دەری ل هەڤالا ڤەکر،
چوون دەرێ ئۆتاخا قورانی کوتان،
قورانی دەری ڤەکر، بوو کەڤر...
خەتیب و سەید قوارنی دەعف دان،
و مینا دو شێرا کەتنە هوندور،
سەید نەفەسەکە کوور کشاند،
جیێ خوەدا سەکنی خوەڕا کوبار،
و خەبەردا ب دەنگەکی وای حەیفدار:
– ئاخ تو مەعرز، کورێ مەعرزا،
تە هێسا خوەر سەرێ دەهـ پەزا؟
کو ئیدی مەریا نەکی بەلەنگاز،
تو ژ قرارا مە نابی خلاز.
خوونا خەتیب کەلییا، ئەوی بانزدا،
و حوجومی سەر "مەحمەد ئاغا"کر.
سوودابێ ترسیایی کرە قیرین:
– هوون نەکن وێ یەکە، نەبن خوونخور!
سەید نەهیشت خەتیب قوران خە،

چەعفێ خوە کوتا چەعفێ قورانی:
- مەعرز، بێژە بزانبم، تو کی یی،
مەحمەد ئاغا یی، کریڤی، تو چ یی؟
قورانی درجفی، ڕەنگ لێ چووبوو،
خەبەر نەددا، زمانێ وی لال بوو.
- مەعرز، وەختا قەلپیێ تو دبی شێر و دیک،
وەختا مێرانیێ دبی تووله و پشیک؟
دنهێری تو چ ترسۆنەکی؟
عەینی کنجێ ژنا گەرە خومکی.
دە زووکە تو ڤێ لەزێ پەزێ من بینە!
قورانی بهیست خوەستنا وان پەزە،
گۆ: - هوون چ دخوەزن، بدمە وە،
هەر بباخشینن عەمرێ مە.
***
هەڤالا بەر پەزێ سحید ڤا
ژ قورانی دو قیمەت هلدان،
سحید چەند کولم قورانی دان،
و ژ وی فەلبازی زوو قەتیان.
***
تەیار گلییێ سحید و خەتیب کوتا کر،
ب شا ئەم تەگلیف مالا خوە کر.
***
سبێ بەربانگێ ئەم ئیدی سەر پیا بوون،
دیسا گوندی تژی دۆرا مە بوون.
ئاپێ تەیار ژی مینا خۆرتەکی
دچوو، دهات، دۆر نە ددا کەسەکی.
هەموو تشت حازر، ل پێشییێ چیا، بەست،

لەزەکێ شوون دا مە خاترێ خوە خوەست.

***

هێشنایی نەرم پێل ددا مینا بەرێ،
کولیلکێ بینخوەش ژی تژی وێ دەرێ،
با دهات، خولە - خولا ئاڤا کانییا،
کالینا بەرخا و میا، کلاما شڤانا.
کەو کوبار سەکنی بوون سەر زنارا،
بۆنا ڤەرێکرنا مە مێڤانا
دەنگبێژی دکرن ل وان دەرا.
دوومەقەسک، قژک و تەیر ناڤ هەوێ،
دڤێی قەی سۆڤەکاری ددان تەڤ بێ.
رۆ ب پەنجا ڤا گرتبوو سەرێ چیا،
دڤێی قەی سلاڤ ددا مە گشکا.
چیا ژی بن پەنجێ رۆیێ چەعف ڤەکری،
سەربلند، چاردۆر مێڤانا دنهێری.
وەختا ئەم بەرژێر بوون، دو کەری پەز،
خوەرا دچێریان شیرن و ب لەز.
مەریێ بەر کەریا چاوا ئەم دیتن،
ئەوانا ب لەز بەر ب مە هاتن،

هەردو ژی عەگیت بوون و مێرخاس،
یەک سحید بوو، ئێ دن را کرە ناس.

***

ئەوێ ئەم پێ رە بوونە ناس، خەتیب بوو،
مە خۆش، بێش دا هەڤ چاوا لازم بوو.
ئەم پەیا بوون، روونشتن سەر هێشنایێ،
و مە خەبەردا ب دلنیایی.

ئەوانا بلووریٚ دخستن و دستران،
چەعفا ڤا پەی پەزیٚ خوە دگەریان.
ئەوانا خوە دانە عەیان کرنیٚ،
وەکی زانن نڤیٚسار و خوەندنیٚ،
کو دەرسدارەک ویٚ تیٚ گوندیٚ وانا،
هینی خوەندنی دکە چەند مەرییا؛
ئەوانا گلی دکرن دلشا،
وەکی دیتنە ڕیا ڕاستە ئازا.
سحید شکلەک دەرخست ژ پاشلا خوە؛
– ڕیٚنیشانداریٚ مەزن، ئەو لیٚنینە،
ڕاستە جەم وە بوویە، ژ تۆڕاخا وە یە،
لیٚ مەری تریٚ هەرتم، هەرگاڤ ناڤ مە یە.
پەنجیٚ ڕۆیا وی جەم مە ژی تیٚ ئیتباری،
ئەمیٚ پیٚپەس بکن ڕۆژیٚد ڕەش و تاری.
خوەستنا مە یە: – برا ڕیٚ بە، برا دوور بە،
ها ژی دبیٚژن: – برا دەلاڤ بە، برا کوور بە"
مە خاتریٚ خوە ژ سحید، خەتاب خوەست،
چەند سحەتا شوون دە کەتنە سەر ڕیا ڕاست...

## حەسۆ و زەلخیٚ*

*تەبیەت بەدەوە، دلۆڤان، شیرنە بیٚحەساب،*
*جارنا سەر مەرییا هیٚرس دبە، ل وان دبە*
*سەبەب،*
*لیٚ ئەویٚ بەدەویا دو دلا لاپ باشقە دایە،*
*شورەتا ویٚ ژی خووت ئەوە، کو هەیە.*

---

* ژ ڕەشیٚ دەستنڤیساریٚ بەر گرتنە.

١

تەعڤا بهارێ یە پەنجزێرین،

تیرێنجێد خوەڤا

پەیا بوو ژ حەفت قاتێ عەزمین

و ڕوح دا تەڤا.

هەر بەرفا قەرقاش لێ خەیید

ئوو ئەوقاس گرییا،

حەتا ڕۆژ ب ڕۆژ تەمام حەلیا،

بوو هێسر، کشیا،

بەر خەما گوندیایە پر گران،

گهیشتە ئاڤا

جەو و کانییا، وانڕا بوو مێڤان

و تەعڤی وانا

ب حەیفداری، هەوار و گازن

نقۆ بوو ئاڤا

گەلیێ بێ بن، گەلیێ دەف مەزن،

قایم حەمێز کر،

چیا، بانیا، گەلی و زنارا

وانا سلاڤ کر.

خەبات ئانی بۆ جۆت، جۆتکارا،

مژوولی، لیستۆک

ئانی، تژی کر ل بەر زارا.

وار، کەوشەن ئازا

بوون ژ لحێفا بەرف-بەلەکی،

خوە خەملاندن

هێشنایێڤا ئەو بمبارەکی،

تەعفا گەرم پەنجێ
خوە ئاڤیتە سەر بەدەنا چیا
و کەتە لەجێ
قەلاشت بێشمێرتێ وانی سپی.
قەی دمان تەعزی.
بەرفا مایی، ل سەر تەپێ چیا
قەی دوور ڤا دگرییان،
حەیفا وان بەرف و زڤستان.
کولیلک، هێشنایی
ڕۆژ ب ڕۆژ هەڤرا ڕادبوونە پییا،
ب حەزار ڕەنگی
دخەملاندن وار، دەشت و چیا.
باهارا خێرخاز
ئەو ئیزنا خوە ڤا ب ئەشق و دل
ئانی کەن، مراز،
خەبات، حوب، ئەڤینتی و بلبل.
باهارا بەدەو
کەتە بن ملێ خۆرت و قیزا
دا بەر هەڤرازا.
تەیر و تەیرادە قەلفە قەلفە
ژ جییێ دوور هاتن
عەیدا باهارێ بمبارەک کن.
دەنگبێژ، بلوورڤان
باهارێرا بوونە ماشۆق، مێڤان.
عەورێ بارگران
بوونە سازبەند، هەوێ دا گەریان

وەک ڕێوییێ بەلەد،
عەیدێڕا بوونە ئەو سەرکۆڤەند.
جارنا ژی ئاها
هەوێدا دکرنە شەر و دەعو،
شوورێ برووسکێڤا
وا حجووم دکرن ل سەر هەڤ،
دتەمری تەعڤ.
و بارێ خومیی مەزن ڤا ژ ور
دبارین ئەو گر.
ساو دکەتە ناڤا عەرد و عەزمین
و قەی دخومستن
وەلگەراندانا چەرخا زەمین.
پێ سیلحا برووسکێ
سینگێ عەزمین دقەلشاندن،
ئەو گورینا خوە ڤا
قەی زنار و چیا دلەقاندن.

٢

وا ئیدی هاتبوو،
سریا تۆپ کرنا پنجارا.
گوندی حازر دبوون
هلگەرن بەر ب زۆزانا.
شەڤ دووز نیڤی بوویە،
شەمۆ ئەو مالا خوە دا نینە،
بەر پەزێ خەلقێ یە.
کورێ وی چووک - حەسۆ ڕازا یە،
لێ ژنا وی بەسێ

تڤدارەکا سبێ دبینە.
حەسۆ نەرحەت بوو،
ها کێلەک کێلەک ئەو وەلدگەریا،
گلییێ وی نە زەلال،
قەی پەی بەرخا خوە ئەو درەڤیا.
بۆنا کورێ دەلال
بەسێ دکەنیا بن لێڤا دا.
چا کەو کەتە سبێ
و شەڤا تەعری ئیدی ڕەڤی،
ڕۆیێ پەنجێ زێرین
ئاڤیتە سەر گوندێ ڕازایی،
تەڤ ڕاکرن پیا،
لەزبوون کەتە ناڤا هەر یەکی،
بوو دەنگ، قیرینا وانا.
ئەلەداخ مینا خێرخازەکی
چیایێ تەپە بلند
بەر ب خوە دکشاند بنەلیێ گوند.
کۆچ پەی هەڤ ڕێ کەت.
ب قارە - قار دکشییان، دچوون،
چا جەوەکە مەزن.
سەری، بنی قەت کڤش نە دبوو،
وا قەی سەرخوەش بوون تەڤ،
تەیێ بگۆتا دەنگ دابوونە هەڤ،
وان سەلام ددا
بهارێ و تەبیەتا بەدەو،
ب کەن، ئەشق ئەوانا

تەبیەتێ ڕە ببوون حژمەتکار.
ئاها حەمێز کرن
کولیلک، کانی، کەوشەن، دەشت و وار،
وان بیرا خوە دانین
چوویینا خوە یە پار و پێرار.
وا خۆرتەکی بەنگی
ڕەخ ئێلباشی ئەو سیاری دچوو،
و ب شیرن دەنگی
دسترا، سەوت لێ بەلا دبوو.

ڕێ ڤا می، بەرخ، بزن و کار ڤەدقەتیان هەرجار،
ژ کالینا وان مەری دبوو لاپ حژمەتکار.

باهارا خوەش کۆچ دابوو بەر خوە، دبر جیێ گولین،
حەمێزا تەبیەتێدا، بن عەزمانێ هێشین.

هەبوونا کێ هەبوو، تەمام بەر چەعڤا بوو،
وێ هەبوونێڤا حالێ کشکا کفش دبوو.

دەستەکێ دبر مالێ پر قیمەت، خاس و قوماش،
دەستەکێ ژی هەبوونا وانا پالاس و پوولاس.

زارێ دەرگووش ناڤا تێرا و خورجا، ئەو مینا
جووجووکا پەی دنهێرین ژ ناڤا هێلوونا.

سەرکنگێ خوە دەردخستن، دکەنیان، دگریان،
زولم و نەراستیێ مەریا وانرا هێ نە عەیان.

هێ نزان بوون چیە ئاغا، چیە خولام،
هەر تە بدا وانا، قولپەک ئاڤ ئو پەریک نان.

زارێد سڤک عەینی مینا کارێ ڕەڤۆکە نەعس،
درەڤیان، دچوون هەر جیبیا و پرس نە دکرن تو کەس.

هەوار کەتە زۆما و زۆزان تەڤ هەڤدو بوون،
گەلەکا کۆچ هشتن و بەر ب هەوارییێ چوون.

مەری ژ نیڤێ ڕێ ڤەگەرییان و ئانین ڤێ بەعسێ،
هۆل بوویە سەر کەڤرا، بەرتەرمەڤە کورێ بەسێ.

بۆنا کورێ خومیی دەلال، بۆنا وی تایێ تەنێ
بەسا دێ ئاوا عەینی گێژ ببوو وێ دممێ.

گوندی و جینار گونێ خوە پێ ئانین، چوونە نەوالێ،
حەسۆ یێ خوەڤا چوویی ئانین داننە سەر ڕێ.

ڕۆیێ کارێ خوە دکر و هێدی دچوو ئاڤا،
قەی بەسا حەسۆ، شەواتا بەسێ ژی دبر خوەڕا.

سبە ڕۆن بوو، زۆزانڤانا مینا مۆزا هەرمێشە،
دمست ب خەباتێ کرن، کۆنێ خوە ڤەگرتن.

و ئاها، کۆن پەی کۆنا،
کێلەکا هەڤ ڕێز بوون و گرتن دەوسا خانییا.
لێ تو وەرە، ئیدی نەمان کۆچەک، حەکیم، شێخ و پیر،

وەکی نە ئانینا سەر کورێ شەمۆ و بەسا فەقیر.

بەسێ مینا مەریکە نەخوەش قنجلی بوو سەر هەڤ،
هەر ئاخین ژێ دهات، قەی لێ قەرمیبوون لێڤ و دەڤ،

دفکری، وەکی کور خەبەر نەدە، بمینە زمان لال،
ئیدی چی وێرانە عەمر و دنیا، مال و حال.

پەی چەند ڕۆژێ زەلوول زمانێ حەسۆ دیسا ڤەبوو،
ئاڤ ژ دیا خوە خوەست و دێ ژ شابوونێ باوار نیبوو.

عەمر دا مەرییێ کەسیب تم دەردلوو یە، کێم شا دبە،
لێ ڤێ جارێ شایا بەسێ و شەمۆ بێ حەساب بوو.

دێ و باڤ چاوا قوربان بەرخەک ئانین، تەڤی حەسۆ
برن بەر ئۆجاخا مالا شێخ ئەمۆ.

شێخ عەمۆ دەستێ خوە بەر ب ڕووێ خوە بر و دوعا کر،
چەند گلییێ تەڤ هەڤ بوویی گۆت و بەرخک شەرژێکر.

شێخ خوونا بەرخکێ پێ تلیێ خوە عەنیا حەسۆ خست،
بەسێ ژ گۆشت خاوە- خاو چاوا قوربان دەرخست.

٣

زارۆتییێ دا کەلە، کەلە قەزییێ چەتن و گران
خوە ل حەسۆ گرتن و کشییان چوون چاوا بازرگان.

ئەلەداخ سال ب سال قەی شورەتا خوە ددا حەسۆ،
بەدەوی و کەمالا خوە ڤا کفش بوو کورێ شەمۆ.

شەمۆ شڤانەکی دەنگبێژ بوو، بلوورڤانێ عەیان،
زوو ڤا گۆتنە - کلام قەنج دکە دەرد، خەمێد گران

شەمۆ حەسۆرا هەم باڤ بوو، هەم دەرسدارێ سەرێ چیێ،
ئەو تەمام باخشاندە کور، ئەو پێشێ خوە بی چێ.

تو شوور نکارە وێ خەما دلێ مەرییا ببرە،
لێ بلوور مینا مەلهەما وێ یەکێ یە و دبرە...

دگۆت چاوا تلی-پێچییێ خوه داینه سەر بلووریێ،
بلووریێ چاوا داینه سەر لێڤا، قەیدە لێ دەریێ.

ب چ مقامی کەریێ پێز ببە چێرە، سەر ئاڤێ،
کژان عەوریێ تەیرۆکێ نە، کیژان ئێ بارانێ.

حەسۆ خوه کەر کربوو، گوهـ ددا سەر،
لەزەکێ شووندا وی مقام ب خوه زەلوول ددا دەر.

جارنا دقەوم، کو هەڤرا دکەتنه لەجێ،
مقامێ وانی شیرن بەلا دبوو ژ سەریێ چیێ.

بلوورا دارین سەر لێڤا دکەوگری، دنەعلیا،
قەی مقابلی نەراستیێ حالێ ملەت دا دگریا.

چیایێ ئەلەداخێ ئەو ب خەمخوری
حەسۆ مەزن کر، شورمتا خوه دا وی.

ئەو خۆرت کولیلکەک بوو ور ل سەریێ چیێ،
چا خەملا ئەلەداخێ یە هەرە چێ.

دلێ وی - چاوا کانیکە ئاڤزەلال،
خەبەردانێ ڤا چاوا نوور و باهار.

چ مەری ئاڤ ڤەخوارا ژ دلێ وی،
ئەو دلێ خوه دا ویێ مقیم بما تی.

گاڤا کڤش دبوو ناڤا دەشت و کەوشەنە
قەی ئەلەداخ شا دبوو، دکەنیا.

خۆرتێ ئوسا هندک بوون ناڤا عەڤدا،
هەر قزەکێ بۆنا وی ڕوحێ خوه ددا.

هەر تونەبوونێ سیا خوە ئاڤیتە سەر وی،
و ل بەر دەولەتیا خۆرت نەدحەوی.

تونەبوونا بێ رەحم وێ مسقال مسقال
دلکێ خۆرتێ دەلال درەڤاند ئو دخوەر.

وەعدە پەی هەڤدو دەرباز دبوو، حەسۆ هێ بەرخڤان بوو،
و هەڤێ وی یی نە تو تشت قەت زێدە نە دبوو.

ئەوی قرارکر لێدە هەرە خوەرا ئێلەکە دن،
ببە شڤان، دبە حەیفێن دەولەتیێ ورە مەزن...
حەسۆ خاترێ خوە ژ دێ و باڤێ خوەست
و هەبوونا خوە ڤا ئەو ب مراز رێکەت،
هەبوونا خۆرت ئەم بژمرن یەکۆ-یەک:
قۆلۆیێ گورێ گورا، - پشت و کۆمەک.
گۆپالێ وی یی دارێ قەرەخاجی،
هەڤان، بلوورا دارین، کولاڤێ پزنی.

چەند رۆژ بوو، حەسۆ وا رێکەتبوو،
ژ سینۆرێ خوە دەرکەتبوو.
کانی، کەوشەن، چیا، بانی تەعف ژی نەناس،
مەرییێ وێ دەرێ ژی نەناس بوون هەر کەس.

و ئەوی جارنا بەر خوە خەبەر ددا،
هەی قۆلۆیێ گوهـ و دێل ژێکری
چاوا جاب چەعڤێ خۆرت دنهێری،
مەری ترێ قۆلۆیێ بێ زار - زمان
فەم دکر خەما دلێ وی یە گران.
قەی دگۆت: "چ دخوەزە خوەیێ دەلال،

چلمسیە دیندارا وی یە شەمال..."
خوەیی چ دگۆت، قۆلۆ نزانبوو،
لێ وی حز دکر، ل وی گومان بوو.

٤

وا ڕۆژەکێ ژی حەسۆ ب قەیدێ هەر جار
بۆ بینا خوە بستینە ڕوونشت ڕەخ کانیێ.
پر وەستیایی، هەڤان ژی ڤالا ببوو،
سەری بنی چەند پرتی نانێ هشک مابوون.
ئەوی نانێ خوە نەرم کر ناڤ ئاڤا سار،
و قۆلۆ ڕا نیڤی کر چاوا هەڤال.
ژ فکرا کوور و دوور نە دبوو ئازا،
هێن ژی، وان فکرا ڤا ژی ڕازا،
ئەوی چ زانبوو جەم کانیا نەناس
ئاگر- ئالاڤێ بکەڤە دلێ وی،
بشەوتینە، ژێ نەبە خلاس.
یانێ گەلۆ خووت ئەو کانی نین بوو،
ناڤا قورنا دا بەخت و مراز
دبەخشاندە خۆرت و قیزا،
یان دبوو سەبەبا بەختێ وانا،

دلێ وان دکری ئاڤا سار ڤا.
لێ ئەو کانی ژ گوند گەلە دوور بوو،
پەرچێ جێرێد شکەستی سەر تونە بوون.
کی زانە، دقەومە ئەو کانی
قیزەکە بکر بوویە، ئەڤین،
ژ حوبا دل چۆلا کەتیە چا دین،

بێ مراز مایە، ئەو ژی مینانی
قیزێ دن بوویە هێسیرا زەمین،
ژ گوند رەڤیە، ڕوونشتیە ور
و دل لێ تژی ئەوقاس گریا یە،
حەتانی ژ وان هێسرێد وێ یە گر
ئاها کانیکە ئوسا کشیایە...
وا ڤۆلۆ نشکێ ڤا بلند عەوتیا
و خۆرتێ ڕازایی ڕاکرە پیا.

٥

دوور ڤا ئالیکی کۆما بووک و قیزا
کڤش دبوون، عەینی مینا کار–خەزالا.
سەر ملێ چەپێ وا دو کەریێ پێز
هێدی هێدی دادکەتنە بەرژێر.
ژ وێ یەکێ حەسۆ دیسا بەر خوە کەت،
بلوور دەرخست و هەر وێ ڤا بوو ڕحەت.
مەریێ کۆمێ ئەو کلامێ خوە برین،
سەکنین و ئالیێ خۆرت دنهێرین.
کۆم هێدی هێدی تۆپ بوو سەر کانیێ،
جێرێ خوە دانین ڕێز بوون دۆرا وێ.

وان قیزانا خۆرت دیتن، یەکی نەناس،
گەلەک بەدەو و دینداری ڤا مێرخاس.
لێ تەک تەنێ بوو، نە هەسپ، نە ژی پەز،
و ژ وی سەرەدەری نەکر تو کەس.
قیزەکە پر بەدەو، سەرتاجا تەڤا،
قووز بوو سەر کانیێ، پێ چەنگا خوە ئاف ڤەخوەر.

بن چەعڤا ڤا خۆرت دنهێری هەرجار.
عەینی خەزالا عەردێ وێ ئێلێ بوو، حسرەتا دلا،
مینا تەعڤێ خۆرت بەر ب خوە دکشاند،
و بەدەویا خوە ڤا ئەو دحەلاند.
ئەوێ ئەو خۆرت بریندار کر و بەردا،
و کۆما خوە ڤا ئەو ڤەکشیان پاش دا.
حەسۆ ئەو خەزالا نەفسا خوەرا ڕاکر
و دلێ خوە یی جاهل پەی وێ کووڤی کر.
هێ شکلێ بەدەوێ بەر چەعڤێ حەسۆ
جارەکە دن ژی هات عەوتینا قۆلۆ.
چەند سەیێ کەرێ پێز حوجومی سەر
قۆلۆ کربوون، وی تەنێ خوە دابوو بەر،
حەتا شڤانا، حەسۆ، بەری وان دان،
قۆلۆ ب کازە کاز نێزیکی خوەیێ خوە بوو، کەت.
حەسۆ سەیێ خوە وی حال ی دا قەت نەدیتبوو،
گەلە بەر خوە کەت، سەری لێ بەرژێر
دلێ خوە دا گۆت: "ئای های، دنیا، دنیا،
چقاس زوو ددی دەر سورا خەریبا..."
شڤانێ وان هەردو کەریپا، دو مەری
سلاڤ دانە حەسۆ ب قەیدێ عەشیری.
حەسۆ ب مەعریفەتی جاوا وان دا،
ناسیپا خوە دانە هەڤ: ناڤێ ئێ مەزن مەجیت بوو،
لێ ناڤێ ئێ دن – برۆ، برێ حەلال.
وان هەردوا ژی ب دل قەبوول کرن حەسۆ.
هەرسێ شڤان کەتنە مسلعەتێ،
کوتاسیێ دا ئەو هاتنە سەر نێتەکێ:

کو فرقیا ئاغا، خولاما هەر دمرا
یەکە، چاوا شاخێ دارێد باشقە.
دمست و قەواتا خولاما هەیە،
لێ ئەو ڤێ گافێ بۆنا ئاغا، بەگا یە.
پاشێ شڤان ڕابوون، چەند پەز دۆتن،
و مێڤانێ عەزیز پێ تەگلیف کرن.
هەرسێ ڕوونشتن دۆرا تاسا شیر،
نانێ خوە خومرن وان چاوا عەشیر.

٦

گرە - گر تۆپ ببوون ل بەر دمرێ ئاخێ گوند،
مسلەت دکرن ب دمنگەکی بلند.
خەبەردان دمرهەقا دمرکەتنا
بەر ب زۆزانا. حەسۆ بەرێ خوە دا وێ کۆمێ،
ب عەشیری سلاڤ دا وانا
و قەرەفات ڤا سەکنی مێرانی.
مەرییا هەڤڕا سەلاما وی ڤەگرتن،
حەسۆ کفش کر ئەو گرە گرێ گوندن،
سەر بەدمویا حەسۆ مانە حژمەتکار،
ئەوانا زوو نەکرن پرس و پرسیار.
خەبەردان ژ پرسا عەلیخان دمست پێ بوو،
سەرێ وی دا گەلە فکر هات و چوو.

دوو کرە خەلەق - خەلەق: - ناڤێ تە خێر؟...
ژ خەریب پرسی ب دلەکی شکبەر.
- ئەز خولام، وەڵە ناڤێ من حەسەنە.
ئاغا کەنییا: - بەلێ ناڤەکی عەیانە،

کفشه ژ جیێ دوور هاتی، وەستیایی،
دبینم، هەسپێ تە تونە، پەیایی؟
کەلۆ خزمەتا تە چیە ڤان دەرا،
سلامەتی ژ کو تێیی، ژ کیژان ئالییا؟...
- ئەز خولام، شڤانم و ژ ئێلا هەسنیا.
- ئەرێ... - سەرێ خوە بەرژێرکری گۆت ئاغا.
- وەلە، تونەبوونێ ئەز ئانیمە ڤر.
لەما ژی من دێ و باڤێ خوە هشتیە ور.
- بێژە، لاوۆ، پێشێ شڤانتیێ ڕند زانی،
ئالیێ بلوورخستنێ تو چاوانی؟
- ئەز خولام، ئەو پێشێ مەیی کال و باڤانە،
لێ وێ کو نزانبم، عەمرێ مە چرانە؟
- نها تو کەرەمکە، ڕازا دلێ خوە
ئەگەر دخوەزی، ڤاسەکێ بلوورێخە.
حەسۆ خوەستنا ئاغێ تەخسیر نەکر،
بلوور دەرخست، کۆلۆز ڤۆت کر و دەست پێ کر،
مقامێ باڤێ خوە یە حزکری، ئێ نێرییا،
و کەرییێ پێز ئەوی کشاند بەدەنا چیا.
ڤەی نێرییا کەرییێ پێز دبرنە ئاڤێ،
یانێ ژ پاش دا دانین بەر ب چێرێ.
چڤاس دچوو، خۆرت ئەوڤاسی گەرم دبوو،
ڤەی تامارێ دلێ وی تەمام ڤەدبوون.
و بەر چەعڤا دشەوتین بێ ئاگر،
هش و مەژوویێ گوهدارا تەمام ئەوی بر.
کەلا دلێ وی مینا بایێ، باگەرێ،
تەیێ بگۆتا ئیدی نایێ ڕائێ.

مەری شاش مایی ڕووێ هەڤ دنهێرین،
لێ ئاغا ببوو بێ نەفەس و بێن.
وەختا حەسۆ ئەو مقام تەمام کر،
عەلی ئاغا ب دەنگەکی نەرم ژێ پرس کر:
– گەلۆ خودێ ئیدی چ شورەت دایە تە
– چ بێژم، ئەز خولام، – حەسۆ گۆت، – دە ...دایە.
– خۆرتۆ، دەنگبێژییێدا دەنگێ تە چاوانە،
یەکێ کەرەمناکی؟ گوهێ من سەر تە یە.
کۆم و ئاغا بەشەرخوەش هیڤیا وی بوون،
حەسۆ ب دلتژی دەست ب کلامێ کر...
خۆرتێ خەریب ها دسترا، دنالییا،
لێ ئاغا وا دفکری دلێ خوە دا:
"هەموو تشت ژی دەستێ خودێ یە هلبەت،
لێ ئەڤ تەیرێ جاهل منڕا بوویە قسمەت.
دقەومە هەما خودێ شاندیە منڕا،
کا کو هەیە شڤانەکی دن سەر ڤیڕا؟"
گەلە مەری تۆپ بوون، تەڤ مانە حژمەکار،
کلاما وی دبهیستن ب حەواسکار.
بەدەویا خەریب، مەعریفەتا وی دنهێرین.
کاڤا حەسۆ کلاما خوە ژی کوتا کر،
دۆرا خوە نهێری کەسەکی ناس نەکر.
عەلی ئاغا گۆت:
– خۆرتۆ، من تو بەگەم کری، نەچە جیکی دن،
دخوەزی ئیرۆڤا بڤە شڤانێ من.
هەقێ خوەیی سالێ ژی بێژە چ دخوەزی،
کەرەمکە گلییێ منڕا چ دبێژی؟...

- ئاغا، – حەسۆ گۆت، – ئەز چ دکارم بێژم،
قاییلم، یا هەق ژی تشتەکی نابێژم.
جماعەتا هانێ شکر گشک خوەیی مالن،
هەقێ شڤانایە سالێ ئەو ژی زانن.
پەزێ تە ئەزێ خوەیکم نۆلا چەعڤێد خوە،
هەقێ من ژی ئەو ل سەر ڕەحما دلێ تە.

## سەرێ ٣

١

پاییزێ سورا خوە ئانی سەر زۆزانا،
ژ جی دەرخست زۆزانڤانا،
بێ دلێ وان بەری وان دا،
جارکە مایین شاند بەر ب گوندا.
گوندیا دیسا کۆچ، کلاماڤا،
گشک داگەریان ژ زۆزانا.

***

مێرێ جاهل، خۆرتا،
گۆپالێ خوە هلدان،
دکەتنە پەی هۆلێ ئاوا
و گشکا بەری هۆلێ ددان.
حەسۆ ژی تەڤ مێر و خۆرتا
خوەرا دلیست وێ لیستۆکێ،
لێ گاڤا ڕۆ چوو ئاڤا،
گوندی پەی هەڤ دچوون ئۆدا،
ور تۆپ دبوون، خەبەر ددان،
گلیێ ڕۆژێ پێ دحەسیان.

زولما گران زفستان بوو،
خەما وێ ژی گەلە زۆر بوو.
گوندی دبوون هێسیر، دمان،
زفستانا کامباخ ژی وا
ئاقا درێژ و بینتەنگ بوو،
سور و سەرمێ ئوسا دکر،
کو بەرفەکە ئوسا دکەت،
وەک هەڤ دکر گوند و نەوال،
کلام و گەر دبوو قیامەت.
چەعڤێ مەریا باوار نە دبوو
زفستان وێ کوتا ببە،
بینا وانا وێ فرە بە.
زفستانا سارە، بێ ڕەحم
بەری گوندیا تەعڤا ددا،
دکر قولچا و پێ بەرفێ
دەری، کولەک و پەنجەرە
ل سەر وانا هشک داددا.
بەرفا قەرقاش بن پیێ مەریا
ب قرچە قرچ، قەی دگرییا،
مەری ترێ پشت لێ دشکەست،
هەی ترێ بەرف هێرس دبە،
دنەعلە و هێڤە – هێڤە.
و حولم – گولما دهڤێ مێرا
دقەرمی سەر سمێلا.
و بووز ژی وا لوولە – لوولە
داردا دبوو سەر سمێلا.

دبه لەما تەبیەت خوە خوە
ب ئۆرخانا خومیە بەرفی
وا جوورەکی ب ڕەحمداری
دگرت خانی، کولەک، دەری،
نەچەمدن پەز و مەری.
وەکی دوو ژ تەندوورا وان
هلنەکشییا، بلند نەبیا،
مەریێ خەریب، ئێ لاپ نەناس
ژ کێلەکا گوند دەرباز بوویا،
تو جارا ئەو نە دحەسیا،
کو ڕەخ گوند ڕا دەرباز دبە.

وا چاردۆرێ تەندووریێ قە
ڤالا نەدبوو، چاوا هەبوویا،
مەری دۆر وێ تژی دبوون.
مێرێ مالا، چاوا خەیسەت،
دچوون ئۆدا، گۆم و تەولا
و وێ دەرێ دبوون ڕحەت.
ژ دووێ تەندوورا و ژ سەرما
زڤستانا سەرت و بێ ڕەحم
گوندیێ مەعرووم ها دکوخییان.
ئەوقا چەعڤێ خوە مز ددان،
کو دەنگ ل وان دهات برین،
چەعڤێ وانا دوەرمین.

حەسۆ و زەلخێ زڤستانا
هایە بینتەنگ، گەلە درێژ
هەرد بۆنا هەڤ دبوونە گێژ.

حەسۆ وا خوە دپەرتاند
و چەعڤێ خوە کاف و سەحەت
بۆنا زەلخێ دقەرماند.
لێ چ کولا زەلخێ هەبوو
زڤستانا هایە قیامەت
خوە خوە قیزا ئاغێ ئێلێ
بچوویا دەرڤا ناف وێ سەرمێ.
پەریشان ژی کولا مەزن
چاوا ئاخریا لاپە پاشن
سەکنی بوو ل سەر سێری.
ئێژا زەلخێ قە دوێری،
مال دەرکەڤە، هەرە جیکی؟
زەلخێ ورا عەینێ مینا
کەوۆتکەکە مال دا گرتی،
قە ژ جیێ خوە نەدلپتی.
حەسۆ، رۆژان وا شەڤ و رۆ
ژ بەر چەعڤێ زەلخا هێسیر
دوور نەدچوون ئەو قە تو جار.
زەلخێ هەرتم ها نفری
ل خوە دکر، کو باڤێ وێ
ئاغا یە و خوە خوە ژی،
بۆنا باڤۆ ل ناف ئێلێ
حەساب دبە خاتوونا چێ.
–
حەسۆ، زەلخێ ڤی جوورەیی
سێ باهارا، سێ زڤستانا

بۆنا هەڤ ماشییان، حەلیان.
و وا ناڤا وان سێ سالا
باکی هەڤڕا خەبەر نەدان،
پەریشانا داماریێ ژی
پێشییا وانا ببوو قەدا...
ئاخ تو، عەدەت، خراب، سۆسرەت،
وەکی ناڤا سال و زەمانا
پێش دا تینی تو جوداتیێ.
دەستەکێ ڕا مەرد، مەردانە
فرە ڤەدکی دەری، کولەک،
دەستا دنڕا دبی قیامەت
و دگۆتن ئەوە عەدەت.
و ئەو مەریێ کەسیب، گەرۆک
بۆنا وانا عەمریێ ئازا
دبوو چیرۆک و مەتەلۆک.

ئاغا کوریێ خوە زەوجاند،
پەی وێڕا گەلەک نەکشاند،
بەگ و ئاغا، ئێ دەولەمەند،
ها خوەزگینی پەی هەڤ دشاندن
زەلخێ بن کوریێ خوەڕا.
قەلەن ددان خزنا زێرا.
هەسێ مە ژی مابوو ستوخار،
ئاخین دکشاند ئەوی هەر جار.

وا سێ جارا چیا و بانی،
کەوشەن و وار کولیلک ددان،
سێ جارا بن بەرفا گران

کرنە نەلین و قەی دگریان.
ئاوا سێ جارا جەو، کانی
بووز گرتن و ئەو بووز حەلییا،
سێ جارا گوندییا کۆچ باراڤا
داگەریان پاشلا ئەلەداخێ،
ل وێ دەرێ بۆنا گەرێ؛
سێ جارا قولنگ و بلبل
هێلینێ خوە تەزە کرن،
ب ویتە ویت، ب ئەشق و دل.
سێ جارا گوندیا کۆچ، باراڤا
ژ گوندا دەرکەتنە زۆزانا.
تەنێ حەسۆ، زەلخێ مانە
ل سەر سۆزێ خوە نەگوهاستی.
ئاگر - ئالاڤا حوبا دلا
ها بینخوەش دبوو مینا گولا.
لێ پەریشانێ هەموو دەرا
ببوو قەدا سەرێ وانا.

هەسێ شڤان مالا خەلقێ،
بۆنا ئاخێ دخەبتی
و تو پەزەک ئوندا نەکر،
پەزێ ئاغا هینی خوە کر.

حەسۆ پێ نان و کشمیشا
نێری ئوسا هین کربوون،
وەکی نێری نێزیک دبوون،
ئەو ژ دەنگێ بلوورا وی

نان و کشمیش درهڤاندن.
پێ مقامێ سەر بلوورێ
پەز خوە دچوو ل سەر ئاڤێ
و ڤەدگەریا ژ وێ دەرێ...

٢

شکبەریکە گران، تاری
کەتبوو ناڤ دلێ عەلی.
عەلی ئاغا وێ شکێ دا
قەی نەخوەش بوو و دنەعلیبا.
و شکا گران دووز قاسی
بارێ بیست و حەڤت دەڤا،
روونشتبوو سەر بینا وی
و ئاغا قەی دفەتسی.
ژ هێرسا لێڤێ خوە دگەست،
ئەوی جابا شکێ دخوەست.
ب فکرا دچوو ناڤ عەورێ گران،
قەی دگەریا ل رووێ عەزمان،
دخوەست پەلتێ عەورا تۆپکە،
خوە باڤێژە و بتەقە.
ئاغا خوەرا مەجالەک دی
و پەی وێ چوو فەسال، هێدی.
" کفشە ئیدی وەعدە هاتیە
رۆژا قەزیبا لاپە گران،
ناڤێ خراب سەر مە کەتیا.
رۆژا نفرێ کال و باڤان.

نا، نابە... ئوسا نابە.
ناڤ کو هەیە خووت شووشەیە.
لێ ناڤێ کال و باڤا
ژ شووشە ژی نازکترە،
ئەو کو شکەست، هەڤ ناگرە.
لازمە رێکە فەسال،
کو ئێلێ دا نەکنە قار...
ئاغا بەر خوە وا خەبەر دا،
قرار دمرخست دلێ خوە دا.
ژ خوە رازی سمێل بادا،
بن سمێلا ب تەعن کەنیا.

٣

پەی قرارێ، رۆژترا دن،
عەلی ئاغا کێفکوهاستی،
چاوا مالخوێ مالا مەزن
و ب مەعنییا گلیێ راستیێ
گازی زەلخا قیزا خوە کر،
سمێل بادا، کەنیا قەستی.
فەسال تۆربێ شکێ ڤەکر.
- شکر ئیدی تو مەزنی،
و کوباریا مالا منی،
تە بەدەوتر تو قیز تونە،
عەینی وەعدێ مرازا یە،
قەلنێ تە ژی: سێسد مییە،
کحێلەکی عەرەبی یە،
پاپاخەکی بووخاری یە،

کێ دا، زەلخێ یانگا وی یە...
تو ڕند زانی، عەدمت نینە،
نێتا قیزا باڤ ژێ پرسکە،
کیژان خۆرتی قیز حز دکە،
لێ باڤۆڕا تو ڕاست بێژە،
گەلۆ چەعڤێ تە ل کێ یە؟
وەعدێ تە یە، قەت شەرم نەکە،
دلێ خوە بەر باڤۆ ڤەکە.
نا، قیزا من، سەرکنگێ خوە
ئوسا مەلوول بەرژێر نەکە،
تو ژ باڤۆ قەت شەرم نەکە.
چ دبێژم، نە هەنەکە؛
ئەز بێحەساب تە حز دکم،
لەما نێتا تە پرس دکم.
بنهێرە، ئەز و تو نە،
مەرێ خەریب جەم مە تونە،
کیژان خۆرتی تو حز دکی،
سۆز ددمە تە کاری مێرکی...
نەکەڤە ناڤ خەمێ گران،
منڕا بێژە، باڤۆ حەیران!..."

٤

زەلخێ زەعف سۆرۆ – مۆر بوو،
و سەرێ خوە هێ بەرژێر کر،
ژ وان پرسا ئەوێ شەرم کر.

ئاخ، عەدەتێ کال و باڤا،
تو ئەختەری ئەو نە ددا

جابا باڤۆ ئەوێ بدا.
زەلخێ خوەست کو زوو برەڤە،
و ژ باڤێ خوە دوورکەڤە،
ژ مال دەرێ، چۆلا کەڤە...
ئاغا دەستێ قیزێ هشک گرت:
- کو دا دچی، بەرخا کووڤی؟
ژ باڤێ خوە کو درەڤی؟
چاوا کەڤۆتک وا دفری.
نا، تە جابا من هێ نەدا،
جابا من ما، باڤۆ قوربا...
هـ، دە بێژە، دە... خەبەردە،
تو دلێ خوە نەکە پەردە.
ڤە شەرم نەکە، قیزا نازک...
دە خەبەردە، بەرخا منێ،
دەلال، کووڤی و چەعفرەشێ،
دە تو شەرمێ نەکە مەعنی...

٥

قیزێ سەری بلند نەکر،
دەنگ لێ نەدهات، ببوو کەڤر،
زەلخێ مرنا خوە دخوەست،
لێ بەر باڤۆ ڤەنەکرا
سورا دلکنگێ خوە یە ڕاست.
ڕاستی ئەوە، خێنجی حەسێ،
تو خۆرتەکی بەگەم ناکە،
لێ چاوا بێژە، نا، نە پاکە.
ئاخر، وەکی باڤ ڕا بێژە،

خوونا هەردا وێ برێژە...
مینا بەرخا وێ شەرژێکە.
ئاغا دیسا گلی ڤەکر:
- تو قیزمکە پر دەلالی،
کەمال، ئاقل، شیرحەلالی،
چ دبێژم، ئینکار نەکە،
دلکنگێ خوە منڕا ڤەکە.
ئەز زانم، تو پر ڕوونەرمی،
لێ تو ژ من نەکە شەرمی،
ئەز دخوەزم منڕا بێژی،
کا چ خۆرتی تو دخوەزی.
ئوسا تو بەر خوە نەکەڤە،
نە ئەزم، ئەز، باڤێ تە مە،
و باش زانم، کو دلێ تە
مەریکی دا، وەڵە هەیە...

٦

زەلخێ مینا کەوا گرتی
قە ژ جیێ خوە نەدلپتی،
ئەوێ ئیدی تو تاو نەکر...
هێسرێ گر ئەوێ باراند،
سوورەت و دەست پێ وان شل کر...
دیت لێ بوویە قیر و قەدا،
جابا باڤێ ئەوێ وا دا:
- ئەز خولاما تە مە، باڤۆ،
تە نێتا خوە سەری دا گۆت...
خوەستنا تە سێسد می یە.

کحێلەکی عەرەبی یە،
پاپاخەکێ بووخاری یە...
ئەز چ زانم خوەیێ وانا،
گەلۆ کی یە، کی گوندی یە،
قەواتا وی ئیدی چی یە...
کێری چ تێ خوەستنا من،
قوولا تە مە، ئەز زمان کن،
ئەز مێڤانا مالا تە مە،
قیمەتێ من – قەلەنێ گران.
کێ مالکا خوە تێکە وێران؟
ئاخر دلە، چقاس نەبە
چا دیت، ئیدی مەجال تونە،
ژ دەست باڤێ خلاس نابە،
بەر باڤێ خوە بوو تەمەنە:
– سەرێ خوە ڤا قوولا تە مە،
حەساب بکە ئەز تونەمە...
ئاغا ئیدی فەم کر مەعنی،
قیز حز دکە وی شڤانی...

٧

گلیێ قیزێ دلێ ئاغا
ئێشاند شبێتا حەزار داغا.
ژ گوهێ خوە باوار نەکر،
ئەوی لەعزمک خوە ئوندا کر
– تو فکرا من حەساب ناکی،
جابا من ژی نادی پاکی.
دنیا–عەلام من ناس دکە،

نه ئاغا مه، نه حه‌نه‌که،
چ قه‌ومی، خودێ خێرکه،
ئه‌و چ پرس بوو، ته منرا گۆت
و دلێ من ته پێرا سۆت؟
ئه‌گه‌ر جابا ته‌ی به‌تلی
ئه‌و بوو، چ کو ته هێژا گۆت،
چ ژ ده‌فێ ته فلتی.
نا، ئاقلی، تو نه دینی،
سه‌ر گلیێ من، گلیا تینی.
ئه‌ز بۆنا ته دفکرم،
لێ فه‌عم ناکم، چرا هێرسی،
عه‌ده‌ت، نامووسێ ناپرسی.
کفشه تو من حه‌ساب ناکی،
نه ژی ژ من تو دترسی.
کو ئوسانه دبێم پاکی،
ئه‌ز ناخوه‌زم تو پرسێد دن،
ته‌نێ جابا من بده کن:
" ئێ حز دکی، چ مه‌ری یه،
گه‌لۆ کیژان قه‌بیلێ یه؟
هلبه‌ت زانم ئه‌و سه کی یه
خوه که‌ر نه‌که، ده زوو بێژه!
تو هێسرێ خوه نه‌رێژه،
تو نه‌بێژی، ئه‌زێ بێژم.
دبه هه‌ما ئه‌وه، هه‌یه،
ئێ نێزیکی مالا مه یه،
خوه ژی ئێتیم و ده‌نگبێژه؟"

٨

زەلخ؛ گاڤا خەبەردانا
باڤۆ بهیست، ڤەجێنقی،
ژ وێ خەمێ، کول و دەردێ
کرە قیرین، کەتە عەردێ...
شکا ئاغێ شرۆڤە بوو،
ئاڤا شێلوو ڤەی زەلال بوو.

٩

ڕۆژ پەی ڕۆژا دەرباز دبوون،
پورچوویێ ئاخێ ڤەنەدبوون.
دهات بیرێ زەلخا کووڤی،
کو ناڤ خەونێ خەبەر ددا،
دلپەرتی، بلند دەنگی،
و کلامێ وی شڤانی،
کو شەڤ و ڕۆژ ئەوی دسترا
بۆنا خەما دلێ بەنگی،
تو ڕحەتی نە ددا ئاغێ.
کەلە گلێ بەر چەعڤێ وی
دچوون-دهاتن وا بێ ئۆغری،
قەزیا گران بەر چەعڤێ وی.
نقۆ دبوو ناڤ متالا،
دخوەست دەرێ ژ وی ئاگری.
مۆرییێ تزبیا یەک-یەک ژمارت،
ناڤا مالێ دچوو، دهات،
کرنا خوە جۆت کر، ژمارت.

کەنەکێ قەلپ هاتە ڕوویێ وی،
و جیییێ خوە دا ها فکری:
"حەزار - حەزار دەرمان هەبە،
تەعنا خراڤ تو قەنج نابە،
ژ وێ تەعنێ عەیب گەلەکە،
تو کێ دخی، بحنجرینە،
تو گونێ خوە ل وی نەینە.
باڤێ منی ڕەحمەتی،
هەرگاڤ دگۆت، شیرەت دکر،
"تو نەبە بەرخ، گور تە بخون،
تو ببە گور، بەرخێ بخوە.
چا نێچیرڤان تەلێ داینە
و خوە فەسال ڤەشێرینە".
خێلی وەعدە ئاغا تەلیبا،
ژ ئێشا دل گەلە نەعلیبا،
لێ نێچیر قەت نێزیک نەبوو،
تو جیبیا ڕێچا وی تونە بوو،
تەلا دانی، ڤالا مابوو.

۱۰

عەلی ئاغا وەعدەک شووندا
خولامەک شاندە پەی حەسۆ.
حەسێ شڤان لەز و بەز هات،
سلاڤ دا وی گەلە هورمەت،
و سەکنی ئەو نەرحەت.
ئاغا ب تەعن، بن چەعڤاڤا
بەژن و بالا حەسۆ پیڤا،

پێ تلییا خوه جی نیشان دا:
- روونی، خۆرتۆ، نەسەکنە،
تەڕا سەر پییا لائیق نینە،
بۆی پێز خەما نەکشینە...
تەنا ئاغا حەسۆ فەعم کر،
"تشتەک هەیە، گازی من کر..."
- چەند سالە، تو شڤانێ منی؟
- قوولێ تە مە، عەلی ئاغا،
دمرباز بوونە سێ سال دها...
عەلی ئاغا جگارە پێچاند،
قولاپێ کوور پەی هەڤ کشاند:
- هەقێ تە چیە، منڕا بێژە؟
حەسۆ گەلە بەر خوە کەت،
گلیێ ئاخێ دلێ وی پەت.
- ئەز چ بێژم، ئاغا ساخ بە.
- ئەزی ساخم بێ گۆتنا تە،
چ دبێژم جابێ بدە.
- ئەز تو هەقی تە ناخومزم...
- چاوا هەقێ خوە ناخومزی،
خوە خوە یەکی ڕووت و تازی؟
نە سەرخومشی، نە ژی دینی،
سێ سالا شڤانێ منی،
بنهێرن ئاخریا من، وی!
چرا بێ هەق پەز دچێرینی؟
پەی وان گلییا حەسێ کوبار
قە سەرێ خوە نە ئانی خار:

- سێ سال نانێ تە خوارییە،
ئاڤا کانیێ تە ڤەخواریە،
بلبل-کەوێ تەڕا سترایە،
هەقێ منە، خودێ دایە،
هەقێ ماین لازم نینە...
- لێ گەلۆ تو چ دخومزی،
چرا ئوسا وا خێرخوازی؟
کورێ، تو هەقێ خوە بێژە،
وەڵە ئەڤی عەینی مینا
بەرخەکە وا لاپە گێژە...
خودێ ئاقل تە نەستاندیە،
هەقێ خوە بێژە، هەقێ تە چیە؟
ئەز نە هەوجێ هەقێ تە مە،
نە ڕسقخورێ کەسیبا مە...
ئێلا خومدا تێ چ بێژی،
ژ ئێلا من دەستەڤالا
بەر ب مالا خوە ڤەگەری؟
خەلق وێ بێژە عەلی ئاغا
ها مەریکی تالانچییە،
یەکی کەسیب و برچییە؟...
کو دەوسا تە یەکی دن بوویا،
لێ نە یەکی ها خەریب بیا،
من نەدهیشت ها خەبەردا،
منێ بەلا وی زوو بدا...
وەڵە مێرێ ڤێ ئێڤارێ،
هێسا ناچی ژ ڤێ مالێ...

زەلخا بەدمو هەموو دمقا
ژ بەر چەعف نەدچوو بەژنا خوە ڤا.
حەسۆ تم ئەو دانی بیرا خوە،
پەزێ باڤۆ ددا بێرییە،
دمزمالا وێ دهات بەر چەعف...
وەکی هەقێ خوە بستینە،
ئیدی زەلخێ ئەو نابینە.

***

– گولێ، گولێ، گولێ جانێ،
من قوربانا ڕوحێ خوە کە،
جا ببهێ گلییێ هانێ
و تو منرا شرۆڤەکە،
هەما هێژا ناڤا کەریێ
پەزێ مە دا دو بەرانا
نشکێڤا قۆچ ل هەڤدو دان.
مەعنی چ بوو، ئەز نزانم،
دبە پاشێ ئەز بزانبم.
هەردو بەران وەک هەڤ نین بوون،
لێ هەردو ژی بەرانێ مە بوون.
یەک بێجوورە و مەزن بوو،
ئێ دن جاهل و بەدمو بوو.
ئەو بەرانێ عەمرێ مەزن
سترو کەوان، گەلە ڤالن
هەردو سترویێ وی مینا مەرا
ئێ خوە ددن بەر بەرۆژا.
زەعف بێجوورە هەرد چەعڤا ژی
تژی خوون بوون، هرییا سەر ژی

وا چەند ڕەنگی تەڤ هەڤ بوویی.
لێ ئێ دینێ، گولێ قوربان،
بەدەو، کوبار، عەینێ خەزال،
ستروێ وی زراڤ، قەیتان خەلەق،
سەربلند و چەعڤ لێ زەلال،
عەنی بەلەک.
ژ هێرسا دل تژی دبوون،
هەردو پاشوّپێ پاش دا دچوون.
ژ وێ دەرێ جارکە مایین
ب بابێ خوە پێشدا درەڤین.
ژ دەربا وان دبوو گرمین.
شەرێ وانا گەلە کشاند،
هەڤ دخستن دەربێ گران.
لێ نشکێڤا، ئاخ گولێ جان،
ئاخ...گولێ عەزیز، گولێ قوربان،
ژ وێ دەربێ ئەجێبمای مام.
ئێ مەزن خوە پاشدا کشاند
و نزانم ئەوی چاوا
ئەو ستورێ خوە ژەعردادایی
ب جوورەکی پێشدا ئانی،
چاوا شوورەک ئەوی کشاند
و...ستورێ جاهل جی-جی شکێناند.
ژ ڤێ یەکێ گەلە ترسیام،
جیێ خوەدا ئەز لاپ شاش مام،
نزام چما خوە ئوندا کر
لێ پاشێ من بێ حەمدێ خوە

کره قیرین، گازی، هەوار.
منرا بێژە، گولا دەلال،
نا ئێ جاهل ئەو قۆچاخ بوو،
گەلە ئێگن و دلساخ بوو،
مەعنی چ بوو، کو ئەو ئالت بوو؟
گولێ، قوربان، دە زوو بێژە،
تو وێ سورێ شرۆ ڤەکە.
ئاخ، نزانم گەلۆ چرا،
وا لنگێ من نایێن منرا...
- ئەز چ بێژم، بەرخا شیرن،
چاوا کفشە، هێ زارۆیی...
ئەو بەرانێ سال ڤا مەزن
عەمرێ خوەدا گەلە دیتیە
شەرێ ئوسا، ئەوە فەرزن.
گەلە تەیرۆک سەر وی بارییە،
لێ ئێ جاهل، بەدەو، کوبار،
نەدیتبوو شەرێ گران.
نە پژیایی، سترو زراف،
چاوا بێژم کو تو فەعمکی،
مەسەلە وا، بەرخا ڕندک؟
وەک هەڤ نینن گا و گۆلک...
باڤێ تە ژی ڤی عەمریدا
عەینی مینا وی بەرانی
قیزێ جاهل، قیزێ بەنگی،
ب شەر و دەعو خوەڕا هلدا،
بەری خۆرتێ جاهل ددا،
ستوروێ گەلە خۆرتا شکێناند...

زەلخا رەبەن پر کەوگری،
- ئەو چ زولم بوو تە منرا گۆت،
تە ئەز کرمە لاپ بێ گومان،
ئاخ، باڤێ من، زولما گران...
ئەوێ عەسە بخاپینە،
خۆرتێ خەریب، لاوکێ شڤان.

## سەرێ چارا

پەی چووینا حەسێ دەلال
دێ، باڤێ وی بوونە بەدحال،
چ کربوون ئەوێ کەسیب،
کورک ئوسا ببوو خەریب؟
"چما ئیدی ڤەناگەرە،
پەی چ ئەوقاس ئەو دگەرە،
گەلۆ ساخە، گەلۆ کو یە،
گەلۆ تێرە یان برچی یە؟"
بەسێ مینا مەریکە گێژ
ها دگەریا سەری لێ ئێش،
دچوو، دهات، خوە بیرکری،
دەرهەقا کور دفکری.
ئەشق و تاقەت ژ وێ چووبوو،
رۆژ پەی رۆژا بینتەنگ دبوو.

هەرۆ دچوو ل سەر کانیێ،
کورێ وێ دکەتە بیرێ،
لێ کور چووبوو بێ بەراتە.
"گەلۆ هەیە، سلامەتە؟"

بەر خوە ئەوێ خەبەردا،
بەری هێسرێ زەلال ددا.
"ئاخ دەردۆ، دەردۆ،
تو بێ ئیلاجۆ،
بێ دەرمانۆ،
ژ ئاخریا من
بەلەنگازێ
چ دخوەزی؟
ئاخر دنیا
ل سەرێ من
بوویە دۆژە.
من دەرکەتیا
پلتە عەورێ
پڕ گرانە.
ئەو عەور بۆنا
من قژکێ
هم تەیرۆکە،
هم بارانە.
من دەرکەتیا
پلتە عەورێ
گەلە ڕەشە.
دایکا حەسۆ
همە گێژە،
هم نەخوەشە.
ئەز کێلەکا
کانیێ ڕوودنێم،

سەر سوورەتێ
خوە ڕەبەنێ
هێسرێ زەلال
دبارینم.

فەلەکێ ژی
نزام چما
چەرخا بەختێ من
چەپ لێدایە،
چەعڤنهێرییا
کورێ خوە مە.
کارێ خەزالا
ل سەرێ چیا
بێی تە، لاو،
ئێتیم مانە،
و مینا من
شەڤ و ڕۆ
کالینا وانە.
حەسۆ، لاو،
لێ ئەز گەلۆ
دیا تە نینم؟
وەرە بال دێ،
تو دەردێ وێ
ب چەعڤێ خوە
ڤر ببینی.

٢

بەسا ڕەبەن ب حسرەتی
ژ قوول، بەندا وا دوور کەتی
دچە مالێ، دیسا دگری.
ئێ دیتیا برینا کوور،
یان حسرەتا مەریێ جێ دوور.
وێ بزانبە دەردێ بەسێ،
و فەعمکە شەواتا وێ.
ها دچوو جەم شێخ و مەلا،
وەکی وانا فەعل ڤەکرا
و جیێ کورێ وێ بگۆتا.
هەر یەک بەر خوە تشتەک دگۆت
و گلیێ خوە سەر وێ دفرۆت.
تاقەتکەتی، تی و برچی
چوو بال حوتا پیرە، فەعلچی.
خاتیا حوتێ، خاتیا دەلال،
ژ دەرد، کولا بوومە بەدحال،
ژ بەختێ خوە مامە مەتەل،
وەرە منرا، ڕەحما خودێ،
فەلەکێ ڤەکە تو ڤێ دەمێ،
و من دەرخە ژ ڤێ خەمێ.
سەڤا کورێ خوەی حەسۆ
ئەز هاتمە بال تە ئیرۆ.

کور سێ سالە ژ مال چوویە،
ڕوحێ من ژی خوەرا بریە،
دەنگ و حسێ وی قەت تونە،

ئەز نزانم گەلۆ کویە،
جا بنهێرە، خاتیا حوتێ،
بەعسا وی ژ کی ئالی تێ؟"
حوتا فەعلچی ژ پاشلا خوە
کیسکەک و قوتیک دەرخست،
هەردو فەسال بەر خوە دانی،
برنۆتی کرە پۆزێ خوە،
بێنژی و سەبر ئانی.
"ئیشالا، سەبرا خێرێ یە،
خودێ، ڕووێ مە بن پێ تە ڤە،
کور گونەیە، بەرخێ تە یە،
ئەم گشک قوول و بەندێ تە نە،
ڕەحما تە مقیم سەر مە یە.

٣

حوتێ مۆری ڕەخ هەڤ ڕێز کر،
ب هۆستاتی کرە جۆت-جۆت،
جارکە ماین تەڤی هەڤ کر
و چەند گلیێ نە زەلال گۆت،
پورچووێ خوە کر، هێرس بوو سەر وان،
کەتە ناڤا دەعوا گران،
مۆرییارا وێ خەبەردا،
قەی ناڤێ وانا هلدا.
بەسێ مەلوول، دەنگ لێ بری،
شەرێ حوتێ دنهێری،
پورچووێ حوتێ هێدی ڤەبوو،
و سەر بەسێ ئاوا هێرس بوو:

"لێ قوربانا وی کوری بی،
سەر ڕیا خەریب بوویی تەنی،
هەما دگریی، قەت ناکەنی،
تە خێرە، تو خوە نە دینی؟"
دەعوا خوە و مۆریا بێژم:
"کڤشە لاوک سلامەتە."
ژ گلیێ وێ بەسێ شا بوو،
وا قەی حەسۆ بەژنا خوە ڤا
بەر چەعڤێد وێ ڕا دەرباز بوو.

پاشێ حوتێ قەی خەییدی،
مۆرییاڕا خەبەرنەدا،
مەجالا خوە ئەوێ وا دی.
مۆریکە نەخش ئاها هلدا،
و نیشانی بەسا دێ دا.
"ئەز چ خوەلیێ سەرێ خوەکم،
بکاربم کورکنگێ تە
ژ قەزیایێ خلازکم.
ئیرۆ-میرۆ مۆریا هانێ
دەستێ مندا دفتلە،
تێ پێشیا کور دسەکنە
و ڕێچا وی ڤەدشێرە.
لاۆ، ئەمە گونەکارن،
خودێ ڕۆژا عەڤدا کڤشکە،
بەر عەمرێ وی چ دکارن؟...

و پەی گلیێ حوتا فەعلچی
بەسێ گریا، کرە قیرین،
حالێ خوەڕا ئەو بوو دەعوچی،
سەر چەعفێ خوە کرە برین.
"ئاخ، جەگەر، جەگەر،
تو گورمکی هار،
شەڤ، ڕۆ دکەری،
ژ ڕوحێ مەرییا
قەت ڤەناگەری.
خاتییا حوتێ،
قوربانا تە مە،
گەلۆ چما
سەر سەرێ من
مژ، دوومانە؟
خاتیێ، دە تو
منرا بێژە
نەعلە–نەعلا
گەدەنگێ من
یارەب کو تێ؟
جا نیشاندە

٥

ڕێ، مەجالا،
ئاخ، من بێبەختێ،
وەلە، بەرخێ من

دانه بەر کێرێ.
شەمۆ، ئێتیمۆ،
دە تو ژی بگری،
مال لێ خرابۆ،
ئاخ، جەگەر، جەگەر!...″

٦

باڤێ حەسۆ، شەمۆیێ شڤان،
مالا خوە دا دەگمە دما،
دگەریا تم ب زەلوولی
و کێلەکا کی ڕوونشتا
پێ بلووڕێ ب دلشەوات
پەی خوە هێسر وێ بهیشتا.

٧

هەموو ئالیا دەنگێ دیکا
ئاڤا گونددا ئیدی لال بوو.
سبا تەزە هێدی ڤەبوو،
ئاها شەمۆ ژی هشیار بوو.

زوو–زوو چەعڤێ خوە مزددا،
لێ ڕۆنایا چەعڤێد وی ژی
خەییدی بوو مینا حەسۆ.
بەسێ کرە گازی، هەوار،
تۆپ کر کەلە گوندی، جینار،
شەمۆ دیتن کۆر و ستوخار.

″ئاخ، شەمۆ، مێرک،
دلێ من زەڤیا

لاپ زێرین ه،
لێ کی نزانه
بهسا قژک
وا ئیدی دینه.
شهمۆ، شهمۆ،
بێ خودانۆ،
ده چما ئوسا
ها دنالی،
نه گونه مه،
دڤمه خوەلی...

ئیدی دهردێ من
دوباره یه.
ده تو هلده
بلوورا خوه
منرا لێخه
خهما گران،
ژ من دوورخه.
بارێ دلێ من
زهف گرانه،
وهله ئهو بارێ
حهڤت دهڤانه.
تو ژ دلێ
من خهبهرده،
ئاخ، واخ، خێرخوازنۆ.
مینا بهرفێ
ئهز ڤا دحهلم،

نیرۆ شووندا
ئەز چرانم؟..."
بەسا قژک خوە پەرتاند،
دلێ مەریا دهەرشاند،
لێ رۆنایا چەعڤێ شەمۆ
ڤەنەگەریا مینا حەسۆ.

٨

بەسێ مابوو گومانبری،
خوە حەساب کر کور لێ مری،
بۆ رحەتیا دلێ خوەرا،
ب عەدەتێ کال و باڤا
مەزەلێ بریێ خوە ئەوێ
حەساب کر دەوسا ئێ حەسۆ.
حەزار کەسەر دلێ وێدا،
دچوو ور و دگریا هەرۆ:
" حەسەنگێ من،
پەز بەردایە،
دچێرینە،
لێ ئەو دەردێ
من رەبەنێ
تو نابینە،
کو ئەز حەیرا
بەژنا وی مە.

- ئاخ، دلێ من، عەڤدا خودێ،
چا سیتلا سەر ئاگر نە،

ژ تو دەرمانا کەو ناگرە.

من دەرکەتیە پلتە عەورێ
کەلە ڕەشە، پر گرانە،
هەم تەیرۆکە، هەم بارانە.

ڕابە حەسۆ، بەرخێ کووڤی،
ژ گولا کێ گەلۆ کەتی؟
ئەز کرمە یەکە کۆتی.

خەزال بێی تە ئێتیم مانە،
بەرەدایی ل سەرێ چیانە،
مینا من کالینا وانە.

زۆزان بەر من خالی دبن،
ژ دەردێ تە ئازا نابم،
بلبل دنەعلن چاردۆرێ من.

دەغما تە دلێ مندا
ها کڤش دبە دەوسا گولا،
دە تو ڕابە، باڤ و برا.

دایکا تە گونەیە، گدی،
دکارە هێ کولیلکا تۆپکە
و پێ وان پەزێ تە خوەیکە.

ئەزێ ڕحان، سۆسنا تۆپکم،
ئەزێ هەرم چۆلا کەڤم
و پەزێ تە هەڕۆ تێرکم.

بلبلزەرک و قەرەچیچەک

پێشا خوه دا تۆیکم،
پەزێ تەڕا بگهینم.

کو ئەو کولیلک تێرێ نەکن،
ئەزێ هەرم ڕیا حەفت ڕۆژا،
کولیلکا پارس کم ژ هەر مالا.

ئەزێ هەرم ل سەرێ چیا،
ناڤا گەلیا و نەوالا،
برەڤینم ژ خەزالا.

پەزێ تە بێ ئاڤ ناهێلم،
ئەز جیێ گەلە کانییا زانم،
کولما خوەدا ئاڤێ بینم.
ئەو مەزەلێ دایکا تە یە،
لائیقی من ڕەبەنێ یە،
نە ئانگۆری بەژنا تە یە.

ئەڤ جیێ من چما هلدا،
نە تو تاقەت مندا نەما،
چما بوویی یەکی تما؟
دە تو ڕابە، بێخودێیۆ،
دایکا ڕەبەن چرا خاپاند،
مەزەلێ وێ ژ دێست ڕەڤاند؟
قەنجبوونا من ئیدی تونە،
دە تو بدە چلکەک دەرمان،
دیا تە ڤەخوە، کو زوو بمرە.

نە دەرنگە، ڕۆ چوو ئاڤا،

دیا تە ئیدی بێتاقەتە،
وا ڤەلەزیام ئەز بن پێتە.

دە تو وەرە کێلەکا خوە
چیچکەکی جی تو بدە من،
جی وار بم ئەز ڤرا بال تە.

٩

شەمۆیێ کۆر
ڕێ و وار
ڕند ناس دکر
ژ بینا
گول، گیهێ ورا،
ژ خولە-خولا دەنگێ کانیا،
ژ چڤتینیا تەیر و توویێ
سەر کەڤرا، ناڤا هەوێ.
دچوو بەر ب گوند و زۆما
کول و دەردێ خوە نیشاندا.
بەعسەک خێرێ ژ کور بحەسیا.
بۆنا وی شەڤ، یان ڕۆژ یەک بوو
ئەو کەتبوو ناڤ دنیاکە
لاپە تەزە، چاردۆرێ وی
هەرتم تاری، تاریستان بوو.
و کێدەرێ دەنگێ بلبل
وی دبهیست، وێ دەمێ ژی،
دسەکنی، یان ڕوودنشت.
ئەو ب دەنگ و کلامێ خوە

دکەت لەجێ و دسترا.
و کیدەرێ ئەوی دبهیست
دەنگێ شڤانا، یان گوندیا،
دچوو جەم وان، خوەرا ڕووندشت،
و دەردێ خوە نیشان ددا.

"ئەزی کۆرم، ڕێ نابینم،
وا دەستێ خوە ناڤا هەوێ
ب حسرەتی دگەرینم،
ڕێ و مەجال قە نابینم.
کەس خودانێ خێرێ تونە،
کو دەستێ من ئەو بگرە،
ڕۆژان - ڕۆژان بگەرینە.

سالخێ حەسۆ بگهینە.
حەسۆ، جانۆ، ئەز نە ڤرم،
نە ل ورم، نزام کێ مە،
تەڤی تەڤیا، تەڤی بێ مە،
ئەز نزانم کێری چ مە.

سبەیە، لێ سبە نابە،
ئاخ، چەعڤێ من قە ڤەنابە،
چەمێ ئاڤێ ڕابوویە و ڕێ
ل من نادە، نزام چما.
ژ کۆنێ مە حەتا ڤرا
خوونا منە سۆر نقتی
سەر کەڤرا، هەموو دەرا.
ئەز ژی بوومە کالک، کۆتی،

دە زوو وەرە، باڤ و برا.

کولاڤرەشۆ، دە تو کڤش بە،
پەردا هانێ بەر چەعف هلدە.
برینا من گەلەک کوورە،
رۆژا شایێ ژ من دوورە،
عەمرێ مە ژی مینا رۆژێ
پاییزێ یە، گەلەک کنە،
ئازایا مە جیکی دنە...
شەمۆ رێ ڤا، ئاخ، چەند جارا
دنکسی، دکەت، رادبوو.
چڤیکەک دفری دۆرا وی،
شەمۆ خوە خوە خوەرا وا گۆت:
"ئاخ، وەیلۆ من مالخرابی
لێ من ترێ حەسێ منە.
خوە ڤەشارتیە و دگەرە،
حەیف چڤیک بوو خوەرا فری"
کڤش بوو ئیدی وەستیایی بوو،
خوەست رحەت بە ئەو قاسەکێ،
لێ نشکێ ڤا خولە - خولا
دەنگێ ئاڤا کانییا بووکێ
ئەوی بهیست و ب حسرەت
ژ جی رابوو، دیسا رێ کەت،
هێدی هێدی وی خوە گیهاند
کانییا بووکێ، کانییا ئاڤسار.
بینا خوە کشاند تێر ئاڤ ڤەخوار،
ئەو ب دەنگێ ئاڤا کانییێ

و پێ بینا کولیلکێ وێ
خوەڕا دژییا ل وێ دەمێ.
ئەو کەتبوو ناڤ متالا
و کانیێڕا خەبەردا:
"کانییا بووکێ"، کانییا دەلال،
هاتمە بال تە، سەلام، سەلام!
تێ بیرا تە، کانییا ئاڤسار،
ئەز، تو، عەزمان، ئەم چەند جارا
هەرسێکا پایێ خوە ددا.
من دگۆت نە تو، نە عەزمان،
چەعڤێ منە ژ وە زەلال،
لێ ئەو ڕۆژ چوون کانییا دەلال،
هەرد چەعڤ نها بوونە
ئاڤا شێلوو، ئەزی کۆرم،
مینا هیزێ خوونا سۆر ئم
و مەریکی کور لە مری.
حەیرانا تە مە،
تو سار بمینە،
کو حەسەنێ من
ژ ڤێ ئاڤا تە
حسرەت نەمینە،
ژێرا نەبێژە
باڤێ تە کۆرە.
عەیبا من خومیکە.
وێ بەر خوە کەڤە.
بێژە: "باڤۆ

نها زۆره،
ڕۆژا ئەشقێ
ل وی دۆره"
بێ: "باڤ چوویە
سەر زنارا،
ناڤ کەندالا،
ناڤا گەلیا،
تەڕا تۆیکە
کار-خەزالا،
قەلەن بدە،
قیزەکە دەلال
تەڕا بینە..."

١١

شەمۆ دگرییا ب زەلوولی،
گلی دکر ب مەلوولی
و دباراند هێسرێ گر.
کانییا ڕەڤۆک ب خولە-خول
خووت وێ دمێ. هەما حازر
هێسرێ شەمۆ تەڤ خوە دکر،
درەڤاند و خوەڕا دبر.
شەمۆ سەرێ خوە بەرژێر کر،
و هێنژی، تو دەنگ نەکر،
ڕەخ کانییێ خوەڕا ڕازا.
ئەو ژ دەرد و خەما حەسۆ،
خێلەک وەعدە ما لاپ ئازا.
کولیلکێ خاس ب هەموو بێن

ژێرا ببوون بەرپال، نڤین.
بایێ زراڤ ب نازهدار
دهات و سەررا دلیلاند.
سەرکنگێ کولیلکێ دۆر ژی
چاوا پێلێ ئاڤێ دحەژاند.
کانی ببوو چا قەرمول
خوەرا دسترا ب ئەشق و دل.

١٢

شەمۆ ئازا بوو ژ خەمێ،
ئەو دکەنیا ناڤا خەوێ.
شیرن، شیرن ئەو رازایی
خەونەک دیت، یا ئەجیب مایی.
دیت گەلیکی گەلەکی کوور،
گەلی تژی ب مەریێ هوور.
دخوەستن رابن، بسەکنن،
زیایێ مەزن نەدهیشتن.
شەوقا ستەیرکا روویێ عەزمین
دکەتە ل سەر مەرییێ هوور،
زیا و مەری دبوون مەشوور.
زیایێ مەزن و رەنگ- رەنگی
سەکنیبوون حافا گێلی،
دشولشولین، بلند دبوون
ستەیرکا بینن ل ناڤ گێلی.
مالا ئاخێ دا دەوات بوو،
بووک و زەعڤا کفش نە دبوون.
ئاغا کنجێ شەڤێ لێ بوون،

ـرەقسی ل وێ دەرێ.
نێری، بزن چا لاقردچی
ئاغا ددانە بەر قامچی.
شەمۆ بەر خوە بلند کەنیا،
کانی تەنێ قەی دەنگ بهیست.
جابا شەمۆ کانییێ نەدا ...
و شەمۆ دیت، وەکی حەسۆ
حافا گێلی، ل وی بەری،
کنج لێ تەزە، پاپاخ سێری.
پێشا وی دا تۆخم هەبوون،
ئێ کو بۆنا ڕۆنایێ بوون.
تۆخم درەشاند سەر کەڤرا،
ئاڤا گەلی و ڕەخ کانیا.
وان تۆخما پێرا-پێرا
ئیشق ددا ل وان دەرا.
دیت کو سەرێ ئەلەداخێ
پێپەلینگەک هاتە خارێ.
حەسۆ هلدا ئاپنجییێ خوە،
دۆرا خوە نهێری ب دلەکی شا،
پێپەلینگڤا خوەڕا هلکشیا
دووز سەر سەرێ ئەلەداخێ.
ئاپنجییێ خوە سەر مل هلدا،
قیزەک بەدەو دەرکەت بندا.
قیز و حەسۆ هەڤڕا شا بوون.
دۆرا وانا تژی کولیلک،
کار-خەزال و منمنیک.

حەسۆ، قیزک، کار-خەزال
هلدبرین ل سەر دەستا،
جارکە ماین ئەو بەردداں،
کارک دفریان، ب لەز دچوون،
ناف عەورێ چووک ئوندا دبوون.
لەزەک شوون دا ڤەدگەریان،
دۆرا حەسۆ، دۆر قیزکێ
ب ئارخاین ئەو دگەریان.

١٣

شەمۆ نەدیت، گەلۆ چاوا
ل سەر سەرێ ئەلەداخێ
پێپەلینگەک هاتە خارێ،
عەینی مینا کەسکەسۆرێ
و درێژ بوو ل سەر سەرێ
چیایێ بلند، ئەلەداخێ.
حەسۆ، قیزک، هەردو هەڤڕا
هێدی-هێدی وا چوون خوەڕا.
سەکنین سەر پێپەلینگێ،
ناڤا عەورا ئەو ئوندا بوون،
شەمۆ ئیدی پێ نەحەسیا
حەسۆ، قیزک قە کودا چوون؟

١٤

شەمۆ هشیار بوو
نهێری خەونە،
جیدا تەخدیر بوو.

***

دهرهەقا زەلخێ، حەسێ بێ مراز
وا دبێژن:

پەی زەلخێ و حەسێ شڤان
پەزێ حەسۆ جیدا نەمان.

پەز خەیدین، بەلا بوون، چوون،
ناڤا شکەڤتا ئەو مەخەل بوون.

ل رووێ دنێ ژ وی پەزی
پێشدا هاتیە پەزێ کووڤی.

هلدکشن سەر زنارا
و دگەڕن هەموو دەرا.

حەسۆ، زەلخێ ئەو دگەڕن،
لێ پڕ-پۆشمان ڤەدگەڕن.

| | |
|---|---|
| رێداکتۆر | قاچاخێ مراد |
| شکلکێش | ل. ھ. ماناساریان |
| رێداکتۆرێ بەدەوەتیێ | ئا. ڤ. گاسپاریان |
| رێداکتۆرێ تێخنیکیێ | ک. س. سارکیسیان |
| کۆرێکتۆرا کۆنترۆل | ئێ. ئوو. باکۆئێڤا |

## نوورا زێندی

بەیراقا تە دململە، شا و شەنگن ئیرۆ ئەم،
بن تەعڤا تە ئەم جڤییانە - حەزار ڕەنگن ئیرۆ ئەم،
نوورس و کورد، گورج، ئەرمەنی - حەزار دەنگی ئیرۆ ئەم
دلێ مە گەش، ملێ مە زۆر، پڕ قەشەنگن ئیرۆ ئەم.

کەرەما تە پەنج ڤەدایە، نۆلی کانییا قودرەتێ،
بەخت و مراز و ئازایی، نوورا زێندی ژێ دەرتێ،
دەوسا قەلپیێ ئیساف ڕاستی تە هەق کریە سەر عەردێ،
ئۆکتیابرا مە، بن گەرما تە زۆر چەلەنگن ئیرۆ ئەم.

## گورجستانێ ڕا

ترس و خۆفێ ئەم ئانین ژ قەرسێ
و کەوکی کرن چار گۆشێ دنێ.
بەختێ مە - سێوییا دەجال دژمنێ،
دەرد و کولا ڕێ ڤا ئەم خوەرن.

عەمر ژ جیێ خوە شحتی، هلشییا
نۆلی قولنگێ ژ بەریێ کشیان،
کۆمێد هێسیرا بەر ب تە مەشییان،
ترێ ئەو ئیدی کەڤر و دارن.

تە ستار دا مە، ب خوە بێ ستار،
نۆلی ئۆرخانا لێ تونە ئاستار،
ئەم ببوونە دەعن، بەخت سەر مە دەستار،
کو گرانیا وی چل حەزار بارن.

بەر تەعڤا شێورێ تۆق-توورا دەردا،

کەسەر، ئاخینێ دەست ژ مە بەردا،
چەعف ل مە ڤەبوون، دوور کەتن قەدا،
ناڤ زەڤیا بەخت دا ئەمە زبارن.

نها دەلالی، خوەی ملک، خوەی برجی،
ڕاستە ئەز کوردم، لێ توی گورجی،
تو دلێ من دا تمێ نارنجی،
پەنجێ دۆستییا مە ل تە دبارن!...

## ئەز دخوەزم

جەم ملەتی کورد
هەیە مەسەلەک-
سالا دا زەعف قرد،
کوورە نێت گەلەک.
ملەت ناڤ دەورا
ئەو، نۆلی تبەرک،
دەرباز کر، ئانی
بێ قوسوور و تەرک.
جەم ملەتێ کورد
هەیە مەسەلەک.
وەختا ترێ فرک
تەریقا ئەڤسەنە
قورافتیە سەر هەڤ،
دکە ناڤ قەوزا
ئەو ژ ڕێ دەرتێ،
تێ بینا قەزیا
شەرا ل دەشتێ.

بـبـه قال و جەنگ
ناڤا مێرا دا،
بەنگزێ وان بەترەنگ،
خوون ل چەعڤا دا،
خوە ئوندا دکن
شورەتا مەرییا،
هەڤدو قر دکن،
نۆلانی دەڤا.
"حەیف ل بەر حەیفێ"
دەڤێ وان دەرتێ،
سەد گلیێ نەتێ
دەڤێ وان دەرتێ.
لێ لێ نە ئاگر
بەری هەڤ بدن،
زارێد هوور و گر
ئێتیم بهێلن،
و ور نشکێ ڤا
داییک پێش دا تێ،
لاچکا سەرێ خوە
داڤێژە عەردێ،
ئۆرتا هەرد کۆما.
ب ئاڤرێ تووژ
وان دکە لۆما،-
مێر بەر دبن پووش.
و بۆی خاترێ
دایکا بەرگۆری،

کو پێ شیرێ خوه
مەزن کر مەری،
شەر دسەکنە،
مێر تێن سەر هشا
و هەڤدو نادن
دها بەر کاشا.
و کەسەک ورا
قەت تورش ناکە
سەر لاچکا دێ ڕا
سەمە چرقاسکە، -
سەر وێ نیشانا
ناموس، سیانەتێ،
کو بینا شیرێ
دایکێ ژێ تێ.
ئەز ڤر دخوەزم
فەسلا ئوسا بێ،
کو دایکێ
تەمامیا دنێ
تو جار... تو جارا
قەت مەجبوور نەبن
لاچکێ سەرێ خوه
باڤێژنە ناڤا
مەیدانا شەرا.

## دەولەت

گۆ ومختەکێ مالەکێ دا
کو تم شەر بوو، چێر و لێدان،

نەفەرێ وێ قورە، باباخ،
بێتفاق و هش دا ئالچاخ،
چەعقنەباری، دەخەس، ئەرنووس،
ب خەیسەت ڤا حەموو چکووس،
حەموو نە تێ و دبۆری،
قەت نزان بوون چ یە گۆری،
قەوم و پزمام ژێ درەڤین،
وان تونە بوو حوب و ئەڤین
و عەینات کوتابوون هەڤدو،
یەکە وان نە دبوو دودو
ڕۆکێ ڕاستی دەولەتێ تێن،
ژێ دپرسن: - هەی لێ، مالشێن،
تو وا ب لەز کو دا دچی،
وەختا ڤر ئەم مانە برچی؟..
گۆت، هوون پینێ بەر سڤدەرێ،
ئەز تم دچمە وێ دەرێ،
ل کۆ هەیە حوب، حزکرن
و تفاقا لاپە مەزن.

## گازنێ تە تونە بن

وی گۆت، دەلال، بباخشینە، وەکی جهالتیێ دا
من گۆتە تە: - ببە یا من، خشرێ دنێ پێ دا
بینم مالێ و ب شابوون ل بەر پێ تە ڕۆکم،
چقواس کولیلک دنێ هەنە، ئەزێ هەمیا تۆپ کم،
تێکم باقێ سپی و سۆر، باقێ گەلەک ڕەنگی،
هەرەما تە وانا ڕێز کم، ل سەر ببی بەنگی.
ئەز ناهێلم تو داچڤی، ژ کانیێ ئاڤێ بینی،

تەنێ ناڤ باخچێ حوبێ دا گولا بچرپینی.
ناڤا دور و بەرێ خوە دا بمینی دەلالی،
تە ژ سۆندا من باوار کر و بوویی بەرمالی.
ئەز کەتم ناڤ شۆڤا عەمر و من نەهیشت تو جی،
رۆژ و شەڤ خوە کرە یەک، تمێ دقجقجیم.
من دیت، هەیلۆ... سەر ریا عەمر چقاس چەل و کۆرتن!
من پێ نانی بینم سێری گلیێ، کو من گۆتن.
موویێ سپی سەرێ من پێ دا کرنە رێزا هۆنێ،
نۆلی زمڤیا کو زەر بوویە، وەعدێ وێ دروونێ.
قەواتا من نەگهیشتێ، وەرە من ڕاست فەعمکە،
شانێ موحبەتێ ناکەڤە کو دەرەوا بکە...
وێ گۆت، قوربان، نە جاییزە، تو خوە بکی لۆما
حزکرنا تە ئالاڤی نائێ کرین ب جەما
و بۆنا من ئەو چێترە ژ دور و خشرێ دنێ،
بێی وێ عەمر، مەرڤ ترێ، حەسابێ مرنێ.

## کەچا بارزانی

هەر یەک ب ئاوازەکی بەر یارا خوە دل ددە،
بروو و بژانگێ وێ ب کێفا خوە کل ددە.
دنەقشینە کوبار دێرە و کورتکێ ئەتلەز،
هەمبەری رۆیێ دکە، گەردەن مەهوە و خاس ڕەز.
ستو دا مۆری و مرجان، کۆندەرێ وێ فرەنگی،
شەر و شەماقی ل وێ ل بەر وی حەزار ڕەنگی،
گوهارێ وێ گوپکی، خوە ژی هەمین بازنزیف،
کو وان خشرا قۆنجا کن – ئەو ژی ناڤ دا بن هیف.
لێ تو، دەلالا بارزان، تو نە یەکە ئوسانی،
ئینگلیز، زۆربە، نەیارا خەزەب سەر تە دا ئانین.

کنجیٚ ئارزان ل ته نه، دلیٚ ته سافی وەک تاس،
جارنا برچی دگەری، جارنا بیٚ پشت و پیٚخاس.
بیٚچییٚ ته تەڤ تەرکی، خەوا شەڤا ته قوسیبا،
حەموو زوو دا ڕازا نه، لیٚ تو هەلا ل سەر پیا.
چارنکالیٚ ته زولمیٚ سکا خوه زۆر عەردیٚ دا،
لیٚ زولم ژ ته نابارە، ناڤا وەلاتیٚ ویٚران.
سور-سەرمیٚ بیٚشیکا ته بەر خوناڤیٚ هەژاندن،
لیٚ دلیٚ ته گەرمایی ژ پەنجیٚ تەعڤیٚ ستەندن.
دبیٚن حەموو دەردیٚ ته ڕۆ کرن ل سەر هەڤ دا،
وەختا سبەکیٚ ڕابوون، ئەو بوونه چیاییٚ کوردا.
ل بەر بەختیٚ چلماسی، عەجیٚبە، نەچلمسی،
هناریٚ سوورەتیٚ ته وەک ڕۆییٚ دتەیسن.
بینتەنگ دبی جارنا تو، لیٚ دلیٚ ته تم فره،
نۆلی بەرا بیٚ سەر-بن موحبەته ژیٚ دبارە.
شیٚبسکیٚ ته دەلالن، نۆلانی ڕیا ئەڤینتییٚ،
مەرڤ کو خوه ل وان گرت، ناخالفه ب ویٚ ڕیٚ.
هەر یەک ب ئاوزەکی بەر یارا خوه دل دده،
بروو و بژانگیٚ ویٚ، ب کیٚفا خوه کل دده.
من قەلەم کره کلچیک بۆی بورییٚ ته ئەز حەیران،
چیٚ بوویی، چیٚ یی، چیٚ مائی، موحبەتا منه گران.

## عەمەلیٚ چیٚ نامرن

کۆ وەختەکی ژ مالەکیٚ
مەریک دەرکەت ب شین و گری،
خوه کەتبوو بەد حالەکی
هیٚسر ژ چەعڤ گر دبارین.
یەکی هلدا و ژیٚ پرسی

گۆت: بێ برا، ئەو چ حالە؟...

بهارا ڕوویێ تە چلمسی،

دل تە دکە نالە- نالە؟

گۆت: "خارزیێ من مرییە، خارزی...

من خراب بوو مال و ئۆجاخ.

دەست و پیێ وی دلەرزین

تەنێ دکر "ئاخ و واخ"

گۆتنێ: "بێژە، ئەو لاپ مرییە؟...

دبە کو نا"...ئەوی چاب دا.

گۆت: "مالخراب، ئەو چ گلییە؟

مرن کو هات "نا" ل کو ما"

"پەی، - گۆت، - خۆرتۆ، تو نەزانی،

دنیا ب مرنێ ناژی،

نە مرنێ، لێ ژ کرنێ

دنیا بوویە خانا تژی.

ئەز دپرسم، گەلۆ پەی خوە

ئەوی هیشتییە ناڤەکی چێ،

عەمەلێ قەنج، زورەت و چار،

یانێ بێ پار ئەو چوو ژ دنێ؟"

گۆت: - شکر، وەرێ وی شینە،

ئەو خوەی سییانەت، ناڤدەنگینە،

ژێ دباری عەمەلێ چێ".

- ئێە، گۆت، قوربا، بەر خوە نەکەڤ،

شین خرابە سەر مێرێ چێ،

کێ پەی خوە هیشت زورەت و ناڤ،

لاپ نامرە ل ڤێ دنێ.

## بلبل

بلبل فرییا چیا و بانی،
و هات ل سەر چرپییێ دانی،
چرپیک بن وی دا زوو تەویا
گۆت: - تو چقاسی گرانی...
گۆت: - گەودێ من وەکێ بەرێ،
زێدە نەبووم ئەز باهارێ،
ئەو گرانی کو من دا هەیە،
ئەو تەمام ژ دەردێ یارێ...

## گەلیێ عەلی بەگ

تەعفێ تەزە پەنجێ خوە زێر
باراندە سەر دەشت و بانیا،
دوور ڤا ناڤا ڕەوشا سبێ
هەچێ چیا پێرا دکەنیا،
و برقینا وان جەو-کانی،
نۆلی شرکێ خەملا بووکا،
لێ فێزا وان بەلەکیێ کاو
چیل و قەرقاش ل گێدووکا،
ل کو تەنێ بلند دبە
قەرتەلێ باسک زەخم و قەوین،
شڤانێ کورد دێمقملی
ل کەریێ پێز دکە قوورتین،
یانێ بەر پێسیرا کولاڤ
دەردخە بلوورا شمشات،
قەیدێ "نێرییا" حەواس و ناز

پەرواز ددە ل دەشت و لات.
بناتارێ گەلیکی کوور،
کو ناڤ دکن وی عەلی-بەگ،
دەورانا سەرت سەر دا ئانییە
گەلەک زولوم و گەلەک جەنگ.
لێ ئەو مایە پر سەربلند
بەر نەیارا وی چۆک نەدا،
نەیار بەر وی بوونە تراخ
ژێ بوهورین حەزار قەدا.
***
دبێن وەختکێ، ڕۆژهلاتێ
ب ئەسکەرێ خوە یی قورە
ئاڤیتە سەر وی گەلییێ کوور
گەڤ ئیسکەندەرێ زوقورنە.
وەختا ئیدی ڕۆ چوو ئاڤا،
دۆر-بەرا هەر تشت سەقری،
جارنا دهات دەنگێ بووما،
ڕەشێ زنار دقشری،
ئەسکەرێ ئیسکەندەر ب چیت،
تیر و کەڤان، شوور و مەرتال
ڕاهیشتنە ناڤا گەلی،
نۆلی دزا کەر و لال.
نشکێ ڤا ترێ باتنی،
مەری ڕابوون ژ بن عەردێ.
پێشییێ ئەو دانە بەر تیرا،
ژۆر دا زنار هۆل بوون جەردێ.
بوو هەیدادە، هەسپا هیرین،

ترێ ئەو کەتن ناڤ دۆژێ.
قەت ئیسکەندەرێ زوقورنە،
نەکەتبوو ناڤ ڤێ ڕۆژێ،
وەختا سەر ڕێ، بەر زنارا
دهات ئاخین، نەعلین، زێوین
و ئەسکەرێ وی ناڤ–نیشان
پەشمۆردە پاش دا درەڤین،
گەلیێ کوور نۆلی حوتا،
ب ئینک، ب هێرس و ب عەینات
هووفی خوە کر دەوا سەوتا.
ئیسکەندەر زوو ور عەمر کر،
کو لێخن دەڤا هەوارێ،
ئەسکەر دەرێ ژ وی گەلی،
تۆپ بە بەر کانییا بن دارێ.
ئەسکەر زوو ژ گێلی کشیا،
ترێ سەر دا بارییە قار.
گەلەکا حەتا–حەتایێ
سەرێ خوە دانین ئاخێ سار،
لێ ئێد دنێ ب چەک، ڕحال،
جڤیان دۆرا سەرەسکەرا،
شرۆ دکرن وێ شەڤێ
زەرپێ شپووکا وان دەرا...
سبەترێ دوومانا گەور
ل بەر پەنجێ تەعڤا سنجر
حەلیا ل سەر هەچێ بلند،
وەک ناڤ ئاڤێ چرە شەکر،

ئیسکەندەر ل جەم خوە جڤاند
مشیر، قوماندار و سەرەک،
مەعدە کری و بێ نەدەر،
ترێ ل فکرێ کەتیە تەرک،
گۆتە وانا، وەکی فەسال
ل وی گەلی پاک مێزە کن
و شیووکا ناڤا شەڤێ
ژێڕا تەمام ئەشکەرە کن.
وەختا کۆما بەلەدێ وی،
نۆلی سەیێ سووسمە گەریان
ل عەلی-بەگ و حافا وی،
تەنێ تەبیا ل پێشیا وان
کۆمەک ژنێ کوردا ب چەک
سەکنی بوون پش زنارا...
ڕیا کەڤانە درێژ دبوو
بن قەیا وەک تیرمەرا،
نهێرین عەجێب مایی، شاش ـ
بەلەدا خوراندن پەلەنگ:
"ئەڤ بوون شیووکا شەڤا ڕەش؟.."
و ڤەگەریان پاش دا چەلەنگ.
گۆتنە ئیسکەندەر وا یە حال:
ژ وێ ڕێ نایێ پەشک و قەزیا،
کۆمەک ژنێ کورد ب ڕحال
سەر ڕێ کەتنە پش تەبیا،
ئەمێ پێشڤا و بیلەکا
وانا بدنە بەر دەربا

و تێخنه حالێ کولەکا،
کو بزێرن دەست مه کەربا!...
بەر مه ڤەدبە ڕیا کەسە،
لێ یا دن، یا حەڤت دەمنا نه...
ئەمێ هەرن و خولەسە،
خەما مەکن ڤان ژنانە!...
ئیسکەندەر ڤر کوور فکری،
پاشێ سو هاتە بەلەدا:
- وا بیر کر شەڤا بۆری،
ئەو دەربا زۆر و ئەو قەدا؟...
ئەگەر ئەم ئالت کن وان ژنا،-
نابە ناڤ مەرا هەواتێ،
کو ئەم ئالت بوون ژ دەست وانا
قارە مەرا حەتا-حەتێ.
ئەگەر ژنێ وان وەک مێرا
مەیدانێ ئەسکەر قەلس دکن،
مێرێ وانێ وێ وەک شێرا،
مەیتا عەردێ پێپەس بکن...
بلەزینن، دها بەسە
ئەم تێکەڤن خەبەردانا،
هوون داگەرن ژ ڕیا کەسە،
ئەمێ هەرن ڕیا حەڤت دەمنا...
***
ژ وێ ڕۆژێ گەکە قورنە
هات بهورین ل دوو هەڤدوو،
گەلەکێ نۆلی زوقورنە
سەر عەلێ-بەگ دبوون ئەدوو.

لێ تەریقێ وەک کەڤانیا
ناڤا مالێ زۆر و عەگیت
گێزییا خوە یە مەزن هلدا،
ئەو پاقش کر، وێدا ئاڤیت.

***

ئاها دیسا سەر عەلی-بەگ
عەورێ خێژ ل هەڤدو جڤیان،
دیسا هەچێ وی قال و جەنگ
دیسا شیووک سەردا بارییان.
دیسا چرکین هاتە عەزمانا،
عەرد، وەک نەخوەشا، کر نەعلین،
گولێ تۆپێ بەئەسڤانا
سەر گێلی دا گەف دبارن.

***

ڕەخ عەلی-بەگ، ل ناڤپەنیێ
گوندێ کوردا پەر ڤەدایە.
مال نخلینە ل بەستێ،
ترێ زیپکێ لێدایە.
لێ زەلوولی و دەجالی
نەشکێناندن شەکا کوردا،
هەلا سەردا وان پێ دانی
شا بن ل بن بارێ دەردا.

***

ناڤا دووخانا بەربانگێ
دچوونە گوند دو پێشمێرگە.
جارنا دتەلیان وێ تانگێ،
دنهێرین گوند و بەرگە.

هەردو ژ قەبیلا بارزان،
دەستێ وانا تمێ سەر چەک،
یەک ژ وان خۆرتەکی تالیان،
ڕێڤاچوونێ دما چەلەنگ.
وی دانی بیر و دل دا خەم،
ل پەرێ گوند هۆلکا تەنێ.
گەلۆ چرا دیا وی یە ڕەعم
جاب شاندییە: نەسەنە- بێ؟...
دبە کو دژمنێ دەجال
ئانییە سێری قەزیا گران؟...
"ئاخ، دایێ جان! ئاخ دایێ جان!"...
وی نشکێ ڤا بەر خوە دا گۆت،
و ڕۆژا ڕەش هاتە بیرێ،
کو شپووکێ بەختێ وان سۆت
و ئاڤیتە کانییا قیرێ.
کو سەربازێ نووری سەحید
ب نەمەردی و بێخۆفی
دکوشت جماعەتا عەگیت،
کو بەر ئینگلیز ببە سۆفی...
هاتە بیرێ چاوا زۆردا،
دفرین فرندێ ئینگلیز،
ب دەجەلی دان بەر بۆمبا
بارزانا وان گەش و عەزیز،
و مالا وان ئالاڤا گور
پێ کەت، حەتا کو بوو کۆزی،
باڤێ وی دەرکەت ژ هوندور،

دێستدا ئەو و دیا وی کەزی،
ئەو ڕەڤاندن ب لەزۆبەز،
خوە ئاڤیتە تەبیا زنار،
گولە لێ کەت خوونا گەڤەز
قەرمی ل عەردێ سار.
کوورین کەتە دیا وی یە ڕەعم، –
شەختێدا بەختێ هێسیرا.
سەر خەمادا زێدە بوون خەم،
باراندن تەعڤیا هێسرا.
سەر دەنگێ وان تۆپ بوون جینار
دلادا ئینک، دەردێ گران،
ئانین کەفەن، ئانین چەند دار
مەیتێ باڤێ ژ عەردێ هلدان
و چەل کرن ناڤا مەخبەر،
جینارا حەیف ل پێ دانی،
کێلێ کەڤری دانین سەر
وەک نڤشتا وی زەمانی.
نشکێ ڤا دیا وی–پەریشان
ڕابوو پیا تشت کەتە بیرێ.
ئەو چوو پش مالا وان وێران،
عەرد ڤەدا ل تانگا بیرێ،
دەرخست تڤنگ و فشەلخ
و گرێدا ل پشتا خوە.
ژ ناڤا بروویێ وێ یە سخ
ئاگرێ کینێ دپەکییا.
جینارا کر لاڤا–دیلەک،

کو نافا وێ جەنگ و قالێ
کورێ وێ بن عەلی-بەگ
و بهێلن مالا خالێ،
و گۆت: "ئەو هەلا تفالە،
نزانە خێر-شەرێ دنێ،
دلێ من کوور بریندارە:
ژنا کۆتی نابە دیا چێ،
حەتا ئەز هلنەدم حەیفێ،
بلا نەبێژە من دایێ!..."
و ب لەز داکەتە گێلی.

چوو پێشییا دژمنێ دەڤخوون،
رەش ل سێری دەوسا خێلی،
خوە وەک کەڤۆتکا بێ هێلوون...
***
چەندک چەند رۆژ ها بهورین،
کو ئەو دما گوندێ خالێ،-
دلێ وی نە دستری،
تمێ چەعڤێ وی ل ریا دێ.
و وەختەکێ، نیڤێ شەڤێ،
چاخێ گوند و چییا و بانی
کەتبوونە نافا خەوێ،
ژێر تەک دخولخولی کانی،
وی تێ دەرخست: هێسرا گەرم
نقتی سەر سێڤا سوورەت.
ترێ دەرمان، ترێ مەلهەم
ل برینا وی خەدەر کەت،

وی تێ دەرخست، چ حزرەتی
ئەو پاچ کرن ب دلۆڤان،
تەنێ ژ لێڤێ وێ قودرەتی
ئوسا نازکن راموسان.
وی چەعف ڤەکر، دیت پەریشان
ڕوونشتییە ل بەر سەری،
و کر ڤیرین: "وەی، دایێ جان!"
ترێ ڕۆن بوو شەڤا تەری.
خوە زەڤت نەکر و نەتابەت
خوە ئاڤیتە پێسیرا دێ،
ترێ دانە دلێ شەوات
مال و حال و ملکێ دنێ.

دێ مل هێدیکا پاشدا دا
و گۆتە کور: "فەسال تاژدین
ڤایە، لاو، ملێ مندا
ژ گولێ دژمن دو-سێ برین".
وی نزان بوو ژ دەست ئێشێ
سەر دێ کەتیە خوودانا سار،
سەرێ خوە دانی سەر پێشێ
ژێڕا بەلگێ ناز و کوبار.
هەما ئوسا ژی خەوڕا چوو.
ڕحەت و دێ ل بەر بینێ،
حەتانی کو سبە ڕۆن بوو
و ڕانەبوو ناڤ نڤینێ.
دێ ڤێمیشی وی نە دکر،
کو بگۆتا حال و حەوال،

جـو نژمنرا شەر دکر،
ج حاليدا گيهاندنە مال.

•••

مێرخاسی، وەک کانييا تەزە،
ـمرتێ حەواس، دەرتێ زەلال،
چيا و بانيارا دبەزە،
ژێ ڤەدخون هن چووک، هن کال،
تێ هەواريا ڕەهێ زلا،
کل ددە برووێ کوليلکا
و دبە بەرببينا دلا
و بەلەدا ل گێدووکا.
يانێ نۆلی تەيرێ بازی،
ناڤ عەزمانێ سايی وەک تاس،
دفرە حەزار ئاوازا،
دچە ئۆدا کوردايە ناس.
بەرێ دبە چاوا مێڤان،
خوە ددە ئالييێ ئاهلا،
دبە دۆستێ کالێ زەمان،
خيالێ خۆرت و جاهلا.
وا، عەمەلێ پەريشانێ،
کو نەدهات ل خوە موکور،
ب عەجێب دەرکەت مەيدانێ،
فری، گهيشتە گوهێ کور...
وەختا کو هێرس پەريشانێ
ل دوو خوە زوو ئوندا کر ئيز،
داکەتە گەلييێ بارزانێ
ئەسکەر ب سەرەسکەرێ ئينگليز

دکشییان نۆلی مەلەخێ،
قەتل ڕێتن عەردێ کوردا،
پەریشانێ دیت وی چاخی،
کو هەما ژ جەوا وێدا
کۆمەک کورد وێ ب مێرانی
ل بەر ئەسکەر دکنە شەر.
ئەسکەرا سەر وان دا دانی
زولوم، خەزمب. تەک ب خەدمر
ژ گەلیێ کوور دهات زێوین،
ترێ ل بەر فەرمانا سەرت
ناخومزە ئەو ببە سێوی،
چقاس ژی لێ پر نەبن دمرد.
ئەسکەر دیسا هەی دکشی،
کو کوردا زنێر ڤا بسۆن.

ناڤا وان دا نیڤپۆنژی
یارەلانێ ئینگلیز –ڕێنتۆن
قوماندارێ "بەلەبانا"
کو ئەسکەر زێدەکە حمەت،
نۆلی شپووکا زمانا،
نشکێ ڤا ل وانڕا دمرکەت.
خووت وی چاخی پەریشانێ
هەچێ قەیێ خوە جێ ومر کر،
و وێ گرت مێشا نیشانێ،
بائێ خەزمبێ وان ڕاکر:
بوو ڤرزینا گولێ عەینات،
چەند ئەسکەر شاندە جەنمێ،

ـىرـ هۆل بوو زنارێ تەعت
ـ گوڕین چاوا مرنێ،
ـرێ نەقیا چییا ل کاشا،
ـووسکێ ژۆردا کر قرچین،
حەزار زنار وەک بەراشا
وەراندە سەر دژمن ب کین.
ڕێنتۆن ترسیا، بەر خوە نەدا،
ترێ حەزار و حەزار مێر
ماتنە هەواریا کوردا،
پشت وان ستەندنە نۆلی شێر.
و گۆت: "برا عەرەب و کورد
مەڤ بکوژن ڤێ زەهەرێ
هەردو ژی بەر من ببن کوند، –
شەرق بێفەعمە نۆلی بەرێ".
خوە تەلە-تەل دا بەر تەعلدا
مەیدانا شێر هیشت و ڕەڤی،
چاوا ناڤا مێشێ سخدا
بەر ڕاوڤان درەڤە ڕووڤی...
کو ئەسکەرێ نووری سەحید
ناڤ گێلیدا ڕند هنجری،
کورد چوونە سەر قەیا وەحید،
ل کو هەوا دسنجری،
دیتن، وەکی تەنێ ژنەک
ل بەر زنێر دکە نەعلین،
ل ڕەخ وێدا تژی فشەک،
خوون دکشە ژ ملێ برین

ئەو پەریشان بوو، کو ب چێ
وانرا دەرکەت چاوا بەربانگ،
ب مێرخاسی ژ وێ هەچێ
دژمن کرە حالێ بەترەنگ..
خووت وێ دەمێ وان پەریشان
هلدان ئانینە عەلی-بەگ
و عەمەلێ وێ ناڤ-نیشان
ئێلا گەریا چەلەنگ-چەلەنگ..
ژ وێ رۆژێ چەندک-چەند سال
بوهورین. وی تێ دەرنەخست،
چاوا دیا وی بێ ملک و مال
ئەو مەزن کر و فرا خست.
کو تم شین بە وەرێ باڤێ،
دێ دا سەر وی تەری-جانی...
و بێ سەبر خووت وێ شەڤێ
گازێ دکە، چیە مەعنی؟...

## فەسلا ٢

قولبە گەورافی قشری
کەوا سبێ خوە دا چیا،
بەدەنا وان توومێ دری
دوور ڤا نۆلی قەراتوویا
فێزا وانا خوماما گەور
خەلەق-خەلەق و زەعف سخ،
دۆرا شختێ چیبا ئالایە
ئەو خوەرا کرییە قۆرخ،
مەرڤ ترێ عەسمانێ سووت

وەکەریایە نۆلی تاس،
چییایێ بلند سەری لێ ڕووت
بەر مەلسین، بوونە ڕوساس
و ئەو خومام وەک شەماقیا
قەرقاش ل کۆلۆسێ کوردا
ئوسا قەشەنگ ئالییا چییا،
وەک شڤێتا دەعواتا.
خووت وی وەختی ب لەز و کەل
دو خۆرت هاتنە پەرێ گوند
ڕەخ مالا تەک ئەو تەلە–تەل
چوون پش قەلاخا نە بلند،
یەک ژ وانا تاژدینێ شەنگ،
لێ یێ دنێ ناڤی کورگان،
وەک چییایێ خوە هەردو قەشەنگ،
بەژنێ ڤا گەودە پەلەوان.
تاژدین پەلەک عەردێ هلدا،
قەستا دەرێ مالا خوە کر،
نۆلی تەیرێ چییایێ کوردا،
قوورتییا و پەل ل وی وەر کر.
ب وێ وی دا دێ عەشارەت،
وەکی ئەوە، لێ نە کو خەلق.
ئەگەر دووڕا دێ دەرنەکەت
هاتییە سێری قەزیا و دەلک.
لێ ب چرین دەری ڤەبوو
و ژ ناڤ سڤدەرا تەری
هاتە دیتنێ قەراتوو،

پاشێ دەرکەتە بەر دێری،
کرە گازی: "تو چارا من!...
وەرە، لاوێ منی چەلەنگ!...
وەرە عەمر و ستارا من!...
وەرە، تەیرێ من بمبارەک!..."
ئەو دەنگێ وێ وەک حزرەتا
دلێ ئەڤین ل بەربانگێ،
گهیشت گوهێ هەردو خۆرتا،
شورەتا خوە رێت وێ تانگێ.
هەردو ب لەز بەر ب وێ چوون،
خوە ئاڤیتنە پێسیرا دێ،
خەمێ گران کو وانرا بوون،
خوە دوور خستن، دانە بەر بێ.
دێ ئەو برنە هوندورێ مال
وەک نووبارا دلێ شەوات
ژ وان پرسی حال و حەوال،
پاشێ گۆتە کور نە تەوات:
- من گازی تە کر، کورێ من تاژدین
سالێ من دچن..دلێ من برین..
ها دفکری: چرا، هەی فەلەک،
تە مەرا ئانییە ئەو بەختێ کولەک؟..
تاژدین: - دارا پالووتێ کۆکێ وێ زەخمە،
چقاس لێکەڤە دەرب و دەخمە،
چقاس با لێخە، دبە کو بتەوە،
لێ ئەو ئوسا زوو عەردێ ناکەڤە.
پەریشان: - لاقردیا مەکە، تاژدین، ئەز قوربان،

سال من بهورین، دەوسێ تشت نەما...
عەمرێ من نۆلی گووزێ بێعەمەل،
قالچکی زەرە کاکلی زەعف تەعل.
تەنێ مە، تەنێ!...ئەڤ هۆلکا ڤالا
بۆنا من بوویە نۆلی مەزەلا.
دنێدا هەیە تەعلی، تەنگاسی،
وەختا تەنێیی تێ ژ کێ بخوەزی
تەنێ گولپە ئاڤ، تەنێ پەری نان؟...
کێ بێ هەوارێ، بێژە، لاوۆ جان؟...
تاژدین: – ئەز دفکرم: گەلۆ چ بوویە
کو هێرسا دیا من ئەوقاس ڕابوویە؟...
دبە کو ناڤا حالێ چەتندا
وێ بەر تەنگاسییێ قەت تەموول نەدا؟...
تە بیر کریە، وەک ژانا دلا،
هەواری داکەت گرا و ملا،
دژمن شەوتاند مە ئۆجاخ و مال،
کەوشەن ژ بۆمبا دنڤات بەدحال،
ترێ دۆژە یە و تو کەتی ناڤ،
تە دەرخست تفنگ ژ ناڤا کولاڤ،
ڕابەری من کر و گۆت: – باڤێ تە
پێ ڤێ بەر دژمن عەفات شەر کرییە،
هەر جیێا گازی یە، شین و هەوار،
وەتەن دزێرە، وەتەن بریندار.
هەرە و حەتا قەید و چیدار
ل ملێ مە بە، چێر، قامچی و قار
سەر سەرێ مە بە، ڤەنەگەرە مال.

لێ نها تەنێ، دیا منە دەلال
ئەز کرمە نیشان و زەخم دژمنێ،
ترێ دخومزە دل من ڤەژمنە...
پەریشان: - کورێ من دەلال گەلەکی هێرسە
تەنێ دێ بۆی کور جارنا ژی دەرسە...
لێ نە بۆی تەنا من گازی تە کر.
تە نێتا دیا خوە قەت ڕاست فەعم نەکر.
نێت ئەو نینە وەک کۆتیبێ مێرا
بهێلی هەری ژ مەیدانا شەرا
نێتا من ئەوە، کو بزەوجی،
و پاشێ هەرە، تو کودا دخوەزی
تاژدین: - چ زەواج، وەختا هەر دەرا شینە،
دژمن سەر مەدا شپووکێ تینە.
وێ چ بێژنە من هەڤال و هۆگر:
نامووسا بارزان من لاپ پێپەس کر؟...
نا، دایێ، هلدە وی بارێ گران
ژ سەر ملێ من، ڕۆژا خەم-دەردان.
کو سەر مەدا هات عەدلایی، خوەشی،
ئەز بەر تە هارز، چاوا دخوەزی...
پەریشان: - شین دەستێ مە یە، وەک هەسپێ قولە،
تە کو ڕوو دایێ، دها زەڤت نابە.
دوو شینێڕا تمێ شایی تێ
و دوو عەوراڤیێ تمێ سایی تێ.
چەرخا مە ئوسا چەپ زڤرییە،
کو قال و جەنگ مە ڤەناگەرە.
دەگمە قەومیە، کو مێرێ کوردا

نەخوەش بمرە ناڤا جییێ خوەدا...
هەوارییا نەبخێر تم سەر مەدا تێ،
عەردێ مە یێ دەلال، نۆلی قودرەتێ،
دحەرمە ل بن پێیێ دژمن،
چیتێد مێرا خیرەت ڕادبن
و بۆی ئازایێ عەمرێ خوە ددن.
تۆقێ ئێتیما، قارانایا مالێ،
شلی، تەنگاسی، تالیا زەوالێ
ستوێ ژنا کوردە بەخترەش دکوتە،
لێ تەموول ددە، دل ناپەرتە.
ئەو فرا دخە زارێد خوە دەلال،
کو بۆنا مسکەن، ببن پشت و مال،
کو خالی نەبە وەرێ کال-باڤا،
ژێ دەرێن عەفات-لاوەندێ شەڤا...

***

گەلەک سحەتا حوجەت بهورین،
گەلەک بەر هەڤ دان دێ و تاژدین،
لێ ب ئاخرییێ ئەو هاتە سەر رێ
ب تەن و لاڤا، ب دیلەکێ دێ.

***

دها پەریشانا نۆمد
خوە گەلەکی ئەگلە نەکر،
ناڤا مالێ وێ زوو هلدا،
گازی دو-سێ ئەختیارا کر.
ئەو شاندنە مالا جینار،
کو قیزا وی ناڤە نازێ
شیشمان سوورەتێ نلی نار

کورێ وێرا زوو بخوەزن.
خووت وێ ڕۆژێ بێ دەف، زورنە
وێ بووکا خوە سیار کر، ئانی،
تەنێ ور تاسکا حنە
دگەراندن ل بەر خانی.
و جاهلا دێمی ب کەن،
دێستدا دارا بووک و زەعڤێ،
بلند دکرن ئەو هەر دەم،
دگەراندن وێ هنداڤێ...
و گورگانێ برازەعڤا
جارنا قەست دکرە قوورتین،
ترێ بوو گورینا عەورا،
سەر چییایێ گوند هەڤدو جڤین.
ئوسا دکر، وەکی دەعوات
ببە وەک دەعواتا دنێ،
وەکی مەرڤ ناڤ کول، دەردا
شا بن، ژ ڕکی مرنێ...
ڤی تەهەری وی وەعدێ سەرت
دو مراز ل هەڤدو شا بوون
و زەواجا ل عەلی-بەگ
ل کوردستانێ بەلا بوو...
حەڤت ڕۆژا ل بال دیا ئۆمد،
هەردو زلام ب شا دمان.
ڕاستە هەردو ژی مالدا بوون،
لێ وێ دەمێ چاوا مێڤان.
ڕۆژا حەیشتا تاژدین، گورگان

خاترێ خوه ژ مالێ خوهستن،
دیمسا چەکێ خوه چێ هلدان،
بەر ب بارزانی ڕێ کەتن.
ڕێکەتن بن پەرێ عەورا،
ل کو برووسک برق ڤەددە،
زناریێ کال، عەردێ دەورا
ب زێندی تەڕا خەبەر ددە،
وەکی چقاس قەتل ڕژیا
چقاس ژی دل دما ڕژی،
خوونا مێرا عەردێ پژیا،
دلێ وان مێرانی تژی.
چقاسی دژمنێ دەجال
سەردا دانین شین و ئاگر،
ئەولەدێ وێ چێ دمرن،
لێ کوردستان نەمر، نەمر...
وێ نۆلی گولا قودرەتێ
ل سەر کۆزییا قەسرێ کامباخ،
کوبار دەردکەت هەواتێ،
قەید ل ملا، لێ تمێ ساخ...
ژ وێ ڕۆژێ حەیشت مەهە تام
هات بوهورین، تاژدین، گورگان
تەعبی خوەڕا کربوون تام
بەر دژمن ناڤ قال و جەنگا،
دێ چەند جارا سەردا شاند جاب،
کو حەملە یە نازا کوبار
و ئەو شا یە بێ حەد-حەساب-

ل وێ ژی ڤەبوویە باهار.
چەعقێ وانا ل ڕیا وی یە حەیر،
ئەگەر ل وی هەبە مەجال،
بلا قاسەکێ نۆلی تەیر،
سەر چییاڕا چلقاسکە بێ مال..

***

وێ دەمێ دەست بەعەسڤانا
بێئیسافی و کرێتی
خوەلیا کوردایە زەمانا
ژ نەمەردیێ دشەوتی.
کەڤنەپەرەستێد بێ شێکر
دەستدا تۆپ و تانکێد ئینگلیز
گوند و باژار وێران دکر
هەر جییا دهات بینا دووێ مز.
ترێ لاشەکە ل بەستێ،
چارنکال لێ بوونە بەلا،
ڕەف پەی ڕەفا ل وی دەرتێ،
سەر دزڤرن وەک قەرتەلا،
خووت وی چاخی بارزانی
مێرخاس و کوباریا ملەت،
خارجی ل چیا و بانی
هەواری ل وانا داکەت:
دژمن بەلووک ل پەی بەلووک
ڕێز کرییە تێ ب قال و جەنگ
دەرباز بوویە چیا و گێدووک،
کو بێ زەفتکە زوو عەلی-بەگ.

***

ئەو دچوون فەسال و ڕێ گاف، سحەت
چڤانە ددا ناڤ قەیێ بێ سەمت،
ترێ تەبیەتێ ڕکی مەراڤا
بەندە چێ کرییە. ئاڤا سێلاڤا
خوەلیا ژۆر شووشتیە،
بنیدا زنار و کەڤر هیشتییە.
و سەر وان قەیا توومێ شیلانا،
مەرڤا ترێ کەتنە لانا.
و بنەتارێ تەنێ تەلپێ دوو
کێرکووک کربوو نۆلی قەراتوو،
بۆی "پێترۆلیووما" قەتلێ و ب فەش
دانی زێرێ زەر، وێ زەهەرا ڕەش.
پەرێ کێرکووکێ برە دار تەنێ،
سخ سەکنی بوون و سوورا چەنێ
قالم و بلند هەی درێژ دبوو،-
بۆنا بنەلیا خاین و عەدوو.
ل پش وێ سوورێ ئالایا ئەسکەر،
فەسال تەلیا بوو، وەک کۆلانا مەر.
تەزە هاتبوو پش قەرەداخێ،
ئەو شاندبوون کو گوندێ کوردا،
کو سەر تەپە بوو بێوا، بێ دوومدا،
لاپ وێران بکن و ژن و زارا،
قرکن، بکوژن، باڤێن بن دارا.
و وان ئەسکەرا بێ خۆف، بێ ئیساف،
ومختا پش چیا دا قولبی بوو تەف،
نۆلانی درا ئاژۆتنە سەر گوند،

ب تۆپ و تانک، ب خوونمێژێن قرد،
تەک بۆی وێ یەکێ، کو ور دمان کورد.
ور یەک تونە بوو، وەکی نەهیشتا،
کو شووریێ خوونێ ژ کالان دەرکەتا.
بەردا بگرتا زەندا زنێکار،
و زەخم بقووژییا: "بسەکن، بەدکار!
نە ئاخر ئەو ژی وەک مە مەرڤن!...
مالێ مە دوورن، چرا ئەم ڤرن؟...
گەلۆ کیژان کورد کەتیە حەوشا مە
و تەرباندیە گێل و ڕەوشا مە؟...
گەلۆ ئەو کورد بوو، مالێ مە برکر،
مەڕا شژوو هیشت، خوە فرۆ فرکر؟...
جا پاک مێزەکن ل خەزنێ سیتی
پۆلێ وان خوونا مەدا مەوجێن!...
بسەکن، وەحیش چ کەتی ڕکێ؟...
ڕک مەریا تمێ دکە تەلکێ..."
نا..یەکی ئوسا تونە بوو ورا
و ئەسکەرا نۆلی ڕەعورا
ڕاهێشتە پالێ، دو وان تانکێ گر
و بوولدیۆزێرا کرنە گورە-گور.
و عەمرێ گوندیا بەر دا قەتاندن،
مال وێران کرن، گوند تەڤ شێلاندن،
تەنێ دەوسا گوند ما ڕاستەکە دووز،
ستوخار و وێران، بەنگزی لێ مرووز...
سبە ڕۆن دبوو و شڤانێ گوند
ژ چیێ پەز داژۆ کو بینە بێریێ،

لێ ئەو دبینە گوند بیە وەرێ کوند،
نە ور مال مانە و نە ژی ئۆجاخ،
بەندەک نە مایە، تێکە ئاخ و واخ، –
نە ژن–زارێ وی، نە ژی پیرەدێ،
دەوسا ئۆجاخا کەلەفە ل عەردێ.
وی زوو بەرێ پێز ڤەگەراندە چیێ،
هێرس و کینێ ناڤ دلدا پەڤچێ،
هلدا قەرەبین و زوو کەتە رێ،
ئینکێ دگۆتێ: حەیف د بەر حەیفێ...
ئەو هات سەکنی پەرێ کێرکووکێ،
ل بەر وان دارا نۆلی پەپووکێ
و ژۆر نهێری ل شاخ و هەچە
نۆلانی تەیرێ دگەرە قولچا،
تەعلدێ ل تووشێ، وەکی نشکێ ڤا،
راو و نێچیرێ دوورڤا تەخمنکە،
زۆرا قاناتا خوە ور کەوکیکە
و کەس نەبینە نێچیرێ هلدە،
نوکلێ خوەیی تووژ ل ئۆرتا دل دە.
وی وەرس هلدا، کرە خەربۆقە،
قاییشا تڤنگێ پێڤا کر، شداند،
لێ سەرێ دنێ پشتا خوە ئالاند،
پێکی خوە دانی سەر گلێ دارێ
و زوو هلکشیا ناڤا شاخێ وێ،
مەرڤا ترێ ور، ناڤا هەوێ
دخوەزە بەختێ خوە ڤەگەرینە،
دوومکا کوشتی زوو پارا بینە.

وەختا وی دیت جیێ سەمت و نەسال،
بن بەلگێ دارێ، وەک تەیرێ بەدحال،
بەر وی ڤەدبوو ئالایا ئەسکەر،
نۆلانی دەڤێ بێ وا و بەتەر.
وی وەرس کشاند، پێرا قەرمبین،
مەرڤ نزان بوو ئاقلە، یان دین،
وەرس ل خوە و دارێ ئالاند،
قەرمبین ملێ خوە چەپێ شداند،
وەکی سست نەبە، ژۆردا نەکەڤە
و عەمەلێ وی بەر ئاڤێ کەڤە.
و وەختا زاپت، یانێ ژی ئەسکەر
ورا دلڤین بێ خەم، بێ کەسەر،
هەو دی دکەتنە بەر نیشانا وی،
نشکێ ڤا ژ دارێ دبوو ڤیرچینی،
گولە لێ دکەت، ئەو ور دبوو مەیت،
کەسی نزان بوو مرن ژ کو هات.
و دوو وی ڕا کێ هاتە هەوارێ،
مەیتێ وان ژی ڕێز بوون ل عەردێ.
مەرڤا ترێ جیکی باتنی
خەزمب دبارە سەر وێ ئالایێ،
خەزمب دبارە بۆنا گونێ وێ...
ئیدی ور ڕێز بوون چەندەک ل سەر هەڤ،
سەرهنگ تۆپ کر زاپتێ خوە تەڤ،
و گۆت ببینن ژ کو تێ خەزمب.
ئەسکەر لەڤ چوو-هات، زاپت زوو لڤین،
هلدان گولەرەشک، هلدان قەرمبین،

ـحرکەتنە دەر، چارنکالێ خوە،
ـنۆلانی سەما دانە بەر گولا.
تەنێ ل ڤرا شکا وان چوو سەر
شاخێ دارێد سەکنی پێشبەر.
وان بێ حەمدێ خوە ئەو دان بەر گولا،
لێ خۆرت ژ دارێ هەی دژمندە وان،
دکەتن زاپت، دکەتن ئەسکەر
و چەعفدا دمان مراز و کەسەر.
سەرهنگ ور ترێ کۆما پێشمەرگا
پش زنارا کەتنە جێرگا...
دبە کو سەد بن، یانێ ژی حەزار
دۆر وان گرتنە، ئەو مانە ستوخار...
ئیدی رێز ببوون حەیشتێ مەیت بەستێ،
لێ وی نزانبوو مرن ژ کو تێ...
و ڤر نشکێ ڤا سەر ملێ چەپێ
کۆما پێشمەرگا-پێشییا وان تاژدین
هاتن هەواریا وی خۆرتێ شڤان،
و زۆر ژمندنە دژمنێ بەتەر،
ترێ برینا کولێ دایە دەر.
ئەسکەر ور نۆلی کەریێ شهتی
چەک، جەبرخانە بەستێ داڤیتن،
ترس و خۆف دلدا پاشدا ڤەکشین،
رەڤین ژ بەستا شەرێ سنجری
خوە ئاڤیتنە پش سوورا کەڤری.
تاژدین شوولکی بەر ب وێ دارێ،
ل کو شڤان کەتبوو تەبیێ

لێ کره گازی، کو بلەزینه،
پەیا بە ژێرێ دژمن خاپینه.
لێ شڤان گۆتێ: "یا من بەتاله...
ئەز بریندارم...من نه تو حاله.
من حەیفا گوندیا ژ دژمن هلدا
ئیدی دەرد نەما ناڤ دلێ مندا..."
و تاژدین ب لەز وەک تەیرێ سیمر،
هلکشیا دارێ، وەرس خۆرت ڤەکر،
خۆرت دا پشتا خوه و زوو پەیا کر.
خۆرت بریندار بوو ژ پیل و لنگدا،
نه دکر ئاخین، تەنێ هێرس دلدا...
پێشمەرگا پێ جاو چارچەعف چێ کرن،
ئەو خۆرت دانه سەر، ژۆر ڤەرێ کرن،
چەک و دەرمانێ دژمن هیشتبوو،
وانا زوو تۆپ کر و خوەرا برن
برنه پش چییا ناڤا قەیێ کوور،
ل کو چەم ب هێرس دکر فووره-فوور،
تەنێ تەیر سەر وان پێ باسکێ مەزن
چڤانه ددا و دکر قوورتین.
و پش وان قەیا ل وارێ تەیرا
ترێ تەیرارا کورد بوونه برا،
ژێرێ هشتنه گوند، وارێ وێران،
هێلوون دانینه بن پەرێ عەزمان...
و سەر وان قەیا هۆگرێ تاژدین
دبینن کۆما ئەسکەر- پێشمێرگا،
کو سەکنی بوون نۆلی پلنگا.

ئەو جەبرخانا ژ دژمن ستەندی
تاژیێن بال کەندال دانی بەر وانا،
دو-سێ مێر هلدان، شڤانێ بەدحال،
وان سەر چارچەعڤێ هلدان ب فەسال
ئانین زاخەکێ.. زاخەکە خالی،
بریندار تێدا ب تەعل دنالین
و نالینا وان کەڤرێ زاخێ،
مەرڤا ترێ، دانە بەر داخێ.
و سەر کەڤرا پێ خوونا وانا
کەسر دنڤیسە تاریقا کوردا.
وان شڤان ئانی جەم هەکیمێ کال،
کو زاخ ژێرا بوویە هن ئۆجاخ، هن مال،
هن نەخوەشخانا بۆی بریندارا،
هن ئێتیمخانا بنعەرد بۆ زارا،
تاژدین ورا هیشت شڤانێ مێرخاس
کەسەرەک راهیشت ژ زاخێ دەرکەت لەز
و بەرێ خوە دا هەڤرازێ پێشبەر،
کو پێشییا دژمن دیسا تێکە شەر.

## فەسلا ٣

دکشی،
دکشی
لەشکەر هەر ئالی،
تەڤین
شەرقین
دهات ژ گێلی
ب ئنک،

ب کین
خوون ل دماخا،
ب تۆپ،
ب تانک
دکشین زاخا.
دهاتن بەعەس
خوونمژ و دەخەس،
کو ملەتێ کورد
بکن وەکە کوند،
وی بکن بندەست، –
لاش ل عەردێ مەست.
فرندا
ژۆردا
درەشاند ناپالم،
ناڤ دوو
و ئاگر
مەرڤێ ئام و تام.
زەڤی
بوو کۆزی،
گوند بوو کاڤل،
داخ دکرن،
داردا دکرن
ژن، زار و ئاهل،
چەم
ب خەم
دکر خوشین،

عەرد –
ب دەرد،
هەر جیبا شین و شین..
ژوردا
نولی ئەژدەها
دو خورتێ تەلیان
هاتن ژێر،
وەک شێر
تاژدین و گورگان.
وان بهیست
بەر ڕێ
گریێ زارێ بەر قەیا دو شاخ.
مەیتێ دێ
ل عەردێ،
لێ وی دکر: "ئاخ و واخ...
ڕابە،
ڕانەزێ!...
گورێ بێن، دترسم، دایکێ!..."
قەرمی بوو خوونا ئال
ل عەردێ و ل سەر جێنیکێ.
ل وی خشتی
دێ کوشتی...
گەلۆ ئەو زناری ل بال
وێ بکاربن
وی خوەیکن
ژێرا ببن ستار و مەرتال..

ب دلبرین،
ب کین
هەردو خۆرت - تاژدین و گورگان
داچڤین
بەر قەیێ
و تفال ژ ئەدێ هلدان.
هلدان وەک تبەرک،
وەک چڤیکا بێ زار و بێ وا.
کو کەرکن،
خوەی کن
ب تین و گەرمایا دلێ خوە...
نشکێ ڤا
ژێل ڤا
بوو گورین و قرچین:
دو تانک
ب ئەسکەر
سەر واندا ب گەف دکشین.
ترێ عەور
ژ عەزمان
داکەتە گەلییێ زەعفی تەنگ،
ب قوره
دخوره
ڤەدچره بەدمنا بەترەنگ.
ڤان ئەو کور
شیرەت کر
و گۆتنێ: "برەڤە هێسوویێ!..."

لێ ب خوه
وەک پلنگ
تەلییان بەر زناری قەیێ.
ساو،
ڕجاف
کەتبوو گەلی و زنار،
عەزمان لەرزی،
تەڤ تەڤزی
ژ دەست بێخۆفیا نەیار.
کو خۆرتا
سەمت هلدا
و تانک هاتنە کێلەکێ،
وەک گولا
ئەو فریان
کوشتن ئەسکەرێ خەفکێ،
مەرڤ،
پۆلا
هەڤرا زۆر کەتنە حوجەتێ.
چکا کێ
وێ جەنگێ
نیشاندە تەیاخا قودرەتێ...
کەت تۆپچی،
ئاژۆتچی.
ئێ هەردو ئەژدەهێ پۆلا
پێشمێرگا ب تفنگا
ئەسکەر چێ دانە بەر گولا.

لێ پاشێ
مێرێ چێ
زوو کەتنە هوندورێ تانکا،
بەرێ تۆپا گوهاستن
مرن رەشاندن وان تانگا.
دو مەری
ژ زری
پێشیيا پێنسد نەمەردی
دکرن شەر
ب دل-جەگەر
سەر واندا دانین بێدادی...
***
پێشیيا دژمن ببوون پۆلا
تەنێ دو کورد، دو بارزانی،
ل ئەسکەر بری بوون مۆلەت،
شەر دکرن ب مێرانی.
وەک گیهایێ بەر کێلەندیێ
چیتێد دژمن دنخلین،
لێ ژ تانکا هەی دەنگ دهات:
-لێخە گورگان... لێخە تاژدین!...
هلدە حەیفا وێ دیا کوشتی،
حەیفا هێسرێ وێ زارێ،
کو ما ئێتیم، بێ وار، ستار
و بەر زنێر تەل دزارە.
حەیفا دێ و ژن و کالا،
حەیفا کەدا کو بوو کۆزی،
حەیفا گوندێ بوون کەلەفە

و نامووسا قیزێد کەزی،
حەیفا خوونا بێ وا ڕژییا،
حەیفا وەتەنێ خوە ئەسمەر،
بلا دژمن بنکسە،
چەعقدا بمینە ئەڤ سەفەر.
دها ب جەد، دها ب ئینک
ئۆرتا کەلیێ عەلی-بەگ
زۆر بوو ڤزین، قرچین، گرمین،
ترێ تەقییایە تەندوورەک
تۆز و دوومان، کەڤر، زنار
سەر دژمندا ژۆر دبارن.
نیڤێ ئەسکەرایی پرێ
ئیدی کوشتی، بریندارن.
لێ هەردو کورد پێشییا وانا
بوونە وەک کەلا کەڤری.
دژمندنێ ب هێرس و لەز
ستار دژمن هاتە برین.
چەند سحەتا ناڤ وێ دۆژێ
گورگان، تاژدین بەر خوە ددان،
لێ نشکێ ڤا ژ هەردو تانکا
هاتە برین دەنگێ گولا.
خلاز ببوون ل وان گولە،
دەستدا مابوون تەک سۆرانی
وان نزانبوو، کو ژ هێسویێ
تێن پێشمێرگە و هەواری
و دخوەستن دەقا پاشن

پێ سۆرانیێ ب دل و جەگەر
قورفێ تێکنە دلێ دژمن
دیسا ل وی تێکنە باگەر.
کو ئەسکەرا ئەو حەوال دیت،
ئەوان ب ترس و تەلە-تەل
بەر ب تانکا دشوولکین،
ژ بەر ڕیا کو ببوو مەزەل.
وەختا نێزیکی تانکا بوون،
ژێ دەرکەتن هەردو عەفات.
ترێ لێی، تۆفان ڕابوو
سەر دژمندا ژۆردا گور هات،
ڕاهیشتن ئەسکەرێ پێشیێ،
کو زوو تەلیان ل بەر تەعلدا
چەندەک کوشتن پێ سۆرانیێ
ئاڤتۆمات دەستێ وان هلدان،
گولە ڕەشاندن دژمنا.
یەک ژ ڕاستێ، ئێ دن چەپێ
ئیدی دهات بهیستنێ
دەنگێ پێشمەرگا سەر تەپێ،
وەختا گولا تۆیا دژمن
ڕەخ کەڤر تەقیا بێ نەدەر
و عەگیتێ عەلی-بەگێ
بریندار بوون زەعف ب خەدەر.
- ساخ ئی، برا؟ - تاژدین پرسی
و دیت نەهات دەنگ ژ گورگان.
دەستێ خوە دا سەر پشتا وی

و دەستێ وی خوونێدا مان.
ترێ دووزان دەستێ وی کەت،
جانێ ویڕا چوون تەڤزی.
- ل من، برا، کۆر بم، برا!...
وی نشکێ ڤا کرە گازی.
خوونا گەڤەز سینگ دکشی
و بەر چەعڤا ڕەش بوو عەزمان.
- ئەز ژی دچم، - ئەو فکری، -
هاتیە ڕۆژا ئاخر زەمان...
کەس نزانە چقاس دەقە
ئەو خوە ڤا چوو... وی چەعڤ ڤەکر،
دیت: دو زاپت سەر ویڕا نە،
یەکی قورە هێرس چێر دکر.
وی قەواتا پاشن تۆپ کر،
ئاڤتۆمات ژ ڕەخ خوە هلدا،
ب ئینک گولە ل وان ڕەشاند،
ئەو نخلین ل ڕەخ ویدا.
لێ ژ دەست چیکا برینێ
دنیا دلۆرا وی زڤری.
ئەو نەحش کەت بێ دەنگ و حس،
دیسا بەر وی شەڤا تەعری.
چەعڤە گرتی، گوهە حشیار
وی بهیست، کو ژ چیا و بانی
کوردا سەر ئەسکەردا گرتن
و دگۆتن: "هات بارزانی!..."
دخوەست ڕابوویا و بگۆتا

کو بێژنە دێ: خەما مەکە.
وی چێ بەر دژمن تەیاخ دا،
شیرێ خوە ل وی حەلالکە.
لێ وی تەک حزنکەک ڕاهیشت،
خوونێ بەربات کر وی قەفەس،
کوخییا، کوخییا بێ فەیدە بوو،
ئەو خوەڕا بر مرنا دمخەس.
ئەز نزانم ل بن تەعفێ،
سەرێ چیایێ، کو کەوگری،
یانێ بەر برووسکا شەڤێ،
ئۆبێ کوردایە سەقری،
نازا حەملە تێکە ئنتین
ل پش پەردێ زارێ بینە،
کو وەرێ مێر بمینە شین،
مزگینێ ئێلێ هلینە.
ئەز نزانم: ئەوێ کور بە،
یانێ قیزەکە گولیزەر،
ئاگرێ دلا زەعف گور بە،
کەزی زێرێ کورتکێ مەخمەر.
لێ باوەرم وەکی قیز بە،
گولیزەر بە، یانێ عەیشان
ئەوێ ئوسا زۆر و چێ بە،
کو وێ بەژنێ دا پەریشان...
ئەگەر کور بە ل دێ گومان،
بژیا ئازایا کورد، کوردستان
وێ عەسەیی ببە تاژدین...

## گورگانێ زیندانی

ل وێ دەرێ، کو چیڤۆیێ ئەفسەنە،
بەلوو دکر فەنێ ژنا خالێ خوە،
کو خولقی چیرۆکا سەیرا دنێ،
سۆرێ چەعفشێن بوو بائیسێ مرنێ،
میرزە مەعموود گەریا دنێ ب جولەت،
ئالت کر دێوێ سۆر و سپی مخەنەت،
بوو قەساسێ سەرێ دێوێ جانپۆلات،
کو قەرەمانێ قانتری ئامن
حەڤت بەراشێ ئاشا داڤیتە دژمن
ڤیزا ڕۆستەم چل پەلەوانێ باڤێ خوە،
ئالت کر ئانی، نەوالێدا گرێدا.
سێڤەسێلنگ ژۆردا کرە فرتۆنا،
میرزە مەعموود دیت دەرگیستیا وی تونە.
بەدەوا چێ ئەوێ گولا گولبارین
ل حەموو مێرا کربوو عەینات و کین
و کێ دهات بەر کۆچکا وێ کار و بار،
وێ دکر کەڤر و عەردێدا دکر خار.
ل وێ دەرێ، ل کو شێخێ مووریا
خوە حەساب دکر سۆفییێ ژ سۆفییا،
کو مووری و کێزکێد بێ زمان
نەکەڤن بن پیا و ئەو هلدە گونێ وان،
زەنگل ئانی و گرێدا ساقێ خوە،
لێ ب خوە ژی وی گۆشتێ مەریا دخوەر.
ئەتەمێ تەیر ب باتنی دگەریا،
خێرەتخانە ڤەکر ل سەرێ حەڤت ڕیا.

جارا پێشن پشیک ل پادشێ بوو قەواز
ئانی کۆکا ئەوان مشکێ ئانیزاز.
کو قیزا کورد سی نەهـ قیزێد ناف، نەدەر
تەمی دانێ هەقێ پادشێ بێنە دەر،
چل هەراڤی ل زاخێدا خاپاندن،
کنج و چەک و هەسپێ وان ژێ ستەندن.
کو حەفت کۆسە گەریان ڕیا هەمەدانێ
پۆل دەرخستن بەر پشتا پەریشانێ.
کو تەشقەلە هلدا دەفا هەوارێ،
زاپت خاپاند، دەف ئاڤیت و هات مالێ.
تەیرێ سیمر ل ناڤا چیایێ کوردا
بوو هۆگرێ مێرێ چێ و وان مەردا.
شاه ئیسمایل ژ باڤێ خائین باوەر کر،
عەرەبا زەنگ ئەو ژ مرنێ خلاز کر.
ئا، ل ورا سەرێ ئۆدا پزنی،
بەر بەخرا، کو ناڤ دوودا هنگڤی
کالێ زەمان تزبیێ خوە کر دکشاند
ئەڤ چیرۆک هنارت، ناڤا کوردادا گەراند.

## فەسلا یەکێ

ل سۆقاقەکە جزیرێ،
کو شین دکن ل بەر بیرێ
دارێ گووزا، دارێ چاما،
پیرەکە بەلەنگاز دما.
ل ڕەخ سوورا دۆرا باژار،
کو ژۆردا تێ بوویە هەسار،—
هاسێ دبە کەنەرێ چێم

و پش وێ ڤا بەستەکە دێم،
کو تێ خانێ پش کاستینێ
مەزەلێ مەم و زینێ،
مالا وێ بوو، دەری لێ خار –
ئانجاخ وێ، کور ببوو ستار.
پیرێ مالا خاتوونا شەنگ
دخەبتی، دهات دەرمنگ.
لێ کورێ وێ ناڤی گورگان،
ناڤمل فرە، بەژنە تالیان،
دخەبتی جەم نالبەندا
و وەختا چاکووچ هلددا،
ب بایێ خوە دبرە ژۆر،
ژۆردا دانی هەسنێ سۆر،
حەدادخانە، پێرا سیندان
ژ زەرپێ هەڤرا دحەژیان.
دبێژن کو وەختا ئەو بوو،
مالا وانا ڕەخ دجلە بوو،
پیرکا ئەو وێدا شووشتن
و قەواتا وی چەمێ گور
کەتە ناڤا تامارێ کور.
هەر ئینیا نچێ شەهەر
ناڤا باخچێ درێژ و بەر
دیوانا پادشێیە گران،
توجار هۆستا و پەلەوان،
ژن و قیز و خۆرتێ تالیان
تۆپ دبوون کو وەعدێ خوە

ڕند دەربازکن ناڤا باخا.
دەنگبێژ دکەتنە حوجەتێ،
کو نیشاندن مەعریفەتێ،
پەلەوانا دگرت گولاش،
دهات دەنگێ بلوورا خوەش،
سەر کوچک برنج دکەلیا
و خوەش دهات بینا قەلیێ،
کێ وێ ڕۆژێ هۆستاتیا خوە
دها کەمال، ڕند نیشاندا،
پادشێ ئەو ور خەلات دکر
و سەردا ژی عەمر دکر،
وەکی نچەکی دیوانێ
ل سەر سڤرا پادشێ ڕوونێ.
جارکێ هۆستا هلدا سیندان
چەند خورج کۆمر، پێڕا پف دان،
دا سەر پشتا خۆرتێ گورگان
و ئەو چوونە ناڤا باخچە،
کو دەرباز کن ور ئینیا خوە.
حەدادخانە وێ ور ڤەکر،
ب دەنگێ زیز وێ گازی کر:
- کێ دکارە قورسێ هەسن،
کو قاسی کۆدەکە مەزن،
حەڤت دەرباڕا بپەلێخە؟
ئوسا تەنک، وەک تەنۆکە؟...
پەلەوان؛ ناڤمل فرە
هلدا چاکووچ ب بایێ خوە

ل هەسن خست حەڤت دەربێ زۆر،
نەپەلخی ئەو قورسا سۆر.
دوو ویرا ئێ ستوکور قالم
چەعفی لێ تووژ، بەنگزی زالم
دەلالیێ دیوانا پادشێ،
هلبری ژۆر چاکووچێ چێ،
سەر هەڤ لێ خست حەڤت دەربێ زۆر،
نەپەلخی ئەو قورسا سۆر.
دوو وان ڕێز بوون چل پەلەوان،
لێ تشتەک دەرنەکەت ژ وان.
ڤرا هۆستێ دەیندا گورگان،
وی چاکووچ ڤر ڕند هلقۆشاند،
ب بائێ خوە ل قۆرس داوشاند.
ئوسا لێخست، کو عەرد هەژیا،
گورزە پریسک چارنک ڕژیا،
قورسێ هەسن ڕاست پەلخی،
وەک تەنۆکا قوتیبا دخن.
پادشا، وەزیر، قازی، لەلە
ژ دەربا وی مانە مەتەل.
وان عەجێبا وا تو جارا
نەدیتبوون ناڤا دەورا.
هێرسا پادشێ زەعف ڕادبوو،
کو جماعەت گورگان شا دبوو،
ترێ تەرکەک هشێ وی کەت،
کو پەلەوانێ وی یە ناڤ-دەنگ
یەک وەکە گورگان دەرنەکەت.

وی ب دلەکی کول و کۆڤان
ئانی هۆستا، ئانی گورگان،
بنیا سفرێ جی دانە وان.
برنج و نان بەر ڕاست کرن
و ئەو ورا خەلات کرن...
خووت وێ دەمێ قیزا پادشێ،
کو بوو شەعدا وێ تەماشێ،
سەر گورکانێ چێ بوو بەنگی.
و وەک هیڤا چاردە شەڤی
بەر گورگان ڕا نەرم خنگری،
پاشێ زوور بوو خۆرت نهێری،
چەعڤێ وان چەعڤێ هەڤدو کەت،
ترێ دو ستەیر عەزمان ڤێکەت.
وێ تێ دەرخست کو حوبا وێ
کەتە دلێ وی خۆرتێ چێ...
ب دەنگێ بلند گۆتە پادشێ:
– چەعڤێ تە ڕۆنک، پادشا جان،
تە زێدە دبن پەلەوان.
ئەو خۆرت ل سەر حەموویا ڕا نە،
وی بەرنەدە ژ دەستێ خوە.
پادشێ ئاڤرەک دا قیزێ،
لێ دیت: ڕاستە ئەو گلیێ وێ
ئاقلە قیزا وی دیلبەر،
نە کو نۆلی وەزیرێ کەر...
وێ ئیدی ژ کیژان جیێا
دەستخە پەلەوانەکی وا.

کو نافێ وی ل دنێخه...
پادشاتیا وی ڕوومەتێخه.
و ئەو کێلمی بەر حەموویا:
- ژ ئیرۆدا، لاوۆ، گورگان،
بخومزی ببی پەلەوان؟...
گورگان بەر وی تەمەنە دا
و گۆت: - برا ساخ بە پادشا...
ئەم حەموو قوولێ تە نە...
وەلاتێ تە ئەم تێدا نە...
ئەو پێشە نە دلێ منە...
نکارم ب دلێ کەل
کێفکم بێ شوخول ئەمەل.
کو با دکم چاکووچێ خوە،
ترێ ددم بێ سووجێ خوە،
ترێ گەرما کوورا ئاگر
دبم مالا جۆتکارا پر.
حەتا نەچم حەدادخانێ
و بێن نەکم دوو-دووخانێ،
پۆلا کوورێدا سۆر نەکم،
گیسنێ جۆتا ئەز زۆپ نەکم،
گوندی نەبێژە: ڕازی مە،
نان بەر من دا ناچە خارێ...
ئەز ناڤ شوخولدا ڕووسپی مە...
لێ ڕۆژێ ئۆخرمێ گران
دژمن بکم فزلدوومان.
دنێ سەر وان تێکم قیر و سیر، -

تو کیر - ئەز ژی بەر تە پەنیر.
ئەو گلی پادشێ خوەش نەهات،
لێ وی ل ور نەکر مەدەت،
تەنێ دا وی ئاڤرێ تەعل،
نەخوەست شایێ بکە بەتال،
گۆتێ: - گونێ تە ستویێ تە بە،
بەر گلیێ پادشێ ڕانەبە...
پادشا گۆت: - چارە نابە!...
ڤێ جارێ من بەخشاندە تە،
جارا دنێ ئەزێ دنێ
سەر سەرێ تە تێکم دۆژە!
کورمێ هەستویێ تە بکۆژە!...
نها دیسا هەرنە جییێ خوە...
حەتا ئینیا دن، ڤان چاخا...
هۆستا، گورگان ژ جی ڕابوون،
بەر ب سیندانێ خوە سار چوون.
ڕە ڤا دیلبەر ناڤا قیزا،
کو شا دبوون و دکەنیان.
دەرکەت حەتا تانگا گورگان،
ترێ مەلهەم دلێ وێ دان
و درێکا ڤا، زەعف فەسال
دەرخست گستیلکا قاش لێ لال
دا گورگان و گۆتە خۆرت:
- گوهـ بدە من، لۆ هۆستێ جۆت!...
حوبا تە دلێ من سۆت.
تو هلدە ڤێ پێشکێشا من،

وەک نیشانا دلێ ئامن
بۆی وی مێری کێ فرتۆنە
نێرۆ ڕاکر ناڤا باخچە.
دەست سەر دەستێ وی ڕا تونە.
سبێ ل ناڤا باخچێ مە،
بزان بە ئەز هڤیا تە مە.
پاشدا زڤری زوو مەشییا،
کەتە ناڤا کۆما جاریا.
هۆستا کەتە ناڤ متالا.
دبە بێ سەرێ خۆرت بەلا؟
و گۆتە وی: – خۆرتۆ، فەسال..
نەکەڤە چەنگێ پادشێ دەجال.
و وی هلدا سیندان، پڤدان
دانی سەر پشتا گورگان،
هاتن سەر ڕیا کورتە بەر
و داکەتن ناڤا شەهەر.
گورگان ڕانەزا وێ شەڤێ،
بەنگزێ دیلبەرێ وەک ڕۆیێ
ئەو کێلما وێ، بەژنا تالیان،
درانێ وێ، نۆلی مرجان،
گولیێ وێ ڕەش، شێبسکی چێ
ل بەر چەعڤێ وی بوون تمێ.
سبەترێ وەختا هۆستا
هەسنێ سۆر کر ناڤ کەلپەتان
ئەو ئانی، دانی سەر سیندان،
گورگان چاکووچ لێ خست حەواس،

چێ کر گیسن و جۆتێ خاس،
پاشێ جاخێ چەند عەرمبا،
سورنی ڕاست کر ب چەند دەربا،
کنجێ پالا ژ خوە ئێخست،
کلیت دەرێ کوورخانێ خست،
کۆلۆز گرێدا زەعف شورەت.
خوە کر کنجێ، کو ستەند خەلات.
جاخێ کو ڕۆ چوو ئاڤا
عەرد کەتە ناڤا خوناڤا،
بەر ب باخچێ پادشا لەزاند.
وەختا ئەو هاتە ناڤ باخچە،
دیت، کو خالییە هەر گۆشە،
وی خوە تەلاند ل بەر دارێ،
دیت: بوو شنگینا دیلبەرێ،
هات، لەزاند، خوە زەڤت نەکر،
خوە ئاڤیتە هەمێزا کور:
و دو دلێ هەڤ حەباندی
ب زۆرێ سەمت ژ بەخت ستەندی،
ناڤا بەدەنا تەبیەتێ
هەڤڕا کەتن مسلەتێ.
وێ ڕۆژێدا هەر ئێڤارا،
وەختا کو ڕۆ دچوو ئاڤا
گورگان دهاتە جەم دارێ،
دسەکنی هڤیا یارێ،
دکەتنە ناڤ حوبا نازک،
حەتا کو دیک دکر گازی...

ڕۆکێ خەو ل پادشێ قوسییا
ئەو ناڤ باخچەدا دگەریا،
وی دیت: وا وێ ناڤا شەڤێ
ڤیزا وی وێ چارشەڤە لێ،
ترێ مەلەکە دفرە
گورگان ڕا تەنێ دگەرە...
هندک ما ئەو خاڤا هەرە.
کومرەشییێ ئەو دفەتساند...
ترێ ورا ڕوحێ وی ستەند...
سبێ میرێ چ بێژنە وێ؟...
بێناموسە دیلبەرا وی...
ژ ناڤا میرا، ژ ناڤا جندیا
وێ گاڤانێ گوهێ گوندا
ژ بێفەعمیا خوە ها حەباند؟...
وی زوو بەر ب سەرێ لەزاند
ب هێرس دمین ل قەوازا کر،
خولام و پەلەوان ڕاکر،
کو زوو گورگان بگرن، بینن،
دەست و لنگا قەیدا خینن،
باڤێژنە بنێ زیندانێ،
بمینە ور تا جاندانێ...
پەلەوانا گرتن گورگان،
دەست و پیێ وی گرێدان،
کشاندن بەر دەرگێ هەسن
ئاڤیتنە زیندانا مەزن.
دیلبەر کەتە ناڤا خەما،

کو حزکریێ وێ ور دما...
خورێ وێ بوون، هێسر، گری
و ئەو تمێ دفکری.
چ خالیێ ل سەرێ خومکە،
کو گورگانێ خوە خلازکە؟
جاریکە وێ یە جهال
شەرمزا بوو و زمعف ئاقل.
ومختا وێ دیت خاتوونا وێ،
کەتیە نافا خەم و شینێ،
ئەو هێدیکا هات هەرێمێ
و گۆتە وێ، کو چ بکە،
گورگان ژ حەبسێ خلازکە.
وێ چەند خولامێ دمست و پێ
ئانینە جەم خاتوونا چێ،
و بەر وانا وێ زێر ڕۆ کر،
تەمی دانێ و قرار کر،
ومکی ژ کۆچکا دیلبەرێ
حەتانی بنێ زیندانێ
نەقەبەکێ ڕاست دمرباز کن
وی شوخولی ئەگلە نەکن،
وانا هلدا کولنگ و مەر
نەقەب کۆلان، نەقەبا بەر،
ڕۆ کرنە شەڤ، شەڤ کرنە ڕۆ
و ڕۆژەکێ دمما نیڤرۆ
خوە زیندانێرا گیهاندن
جاب سەر خاتوونێدا شاندن،

کو وان عەمرێ وێ قەداندن.
دیلبەرێ ئەو خەلات کرن،
بەر ب مالا ڤەرێ کرن.
هلدا چرا نۆلی شەمدان
نەقەبێرا هاتە جەم گورگان،
دەست، پێ ڤەکر ژ وەرسا
و یارێ خوە تێر راموو‌سا.
وێ رۆژێدا دیلبەرا جان
هەر رۆ گورگان دبوو مێڤان.
حەتانی بەربانگا سبێ
دکەتنە شایی موحبەتێ.

## فەسلا دودا

چەمێ فراتێ زەعف کوورە،
گور ژۆردا تێ، فوورە-فوورە،
مەرڤ ترێ ئەوی دینە،
دلەزینە، دلەزینە...
تەنێ وەختا دچە دەشتێ،
رەحەت بینا خوە دستینە.
پادشاکی وەلاتێ دن
رەخ چەم پش تۆپکەکی
تۆپ کر ئۆردیا خوە مەزن،
هاتە سەر پادشێ جزیرێ،
کو وی تێکە بن دەستێ خوە
بستینە خەرج-خەراجا خوە،
سوورا جزیرێ هلشینە،
ئوورت، ئۆجاخا بقەلینە.

وی بژارتن چەند پەلەوان
و ورا سێ کێر دانە وان،
هەر سێ ژی مینا هەڤدو،
چاپا وان یەک، چەقویا وان یەک
دەستوییێ وانا یە ڕەشبەلەک.
گۆت: - ببن جەم پادشا مەلەک،
برا تێ دەرخە ژ ڤان کێژان
یا پادشێ یە کێژان ژ ڤان،
یا وەزیرە، کێژان قازی
ئەگەر دلێ وی لەرزی
حتێ دەرنەخست، بێ پادشێ مە
ژ وە دخوەزە شەرێ مەزن،
برا ژ مە نەکن گازن...
زوودا دنێ دا عەیانە،
کێ کو شەر خوەست، مەعنی هەنە...
پەلەوانا هلدان ئەو کێر
بەر ب جزیرێ چوون بەرژێر،
و بەر دەرگێ کۆچکا مەلەک
ئەو سەکنین، هلدان خەلەق
و دەرگە دان ڕەق و ڕەق...
دەرگەڤانا دەری ڤەکر،
ئێ مەزن هێرسا خوە ڕاکر:
هەرچار پەلەوانا گۆتنێ،
کو هەرن حزوورا پادشێ،
شەرتێ پادشێ ئانییە وان،
یان وێ ببە شەرێ گران.

وەختا ئەو چوونە دیوانێ،
تەمەنە دان ل بەر پادشێ،
پاشێ گۆتن: – پادشێ مە
وە گەلەکی سلاڤ دکە.
هلدە ئەڤان سێ کێرێ هان،
تێ دەرخن: چکا کێژان
یا پادشییە، لێ کێژان وان
یا وەزیرە، – کێژان قازی؟
ئەگەر تو ڕاستیێ دخوەزی:
ئەم نە دزن، نە مخەنەت،
پێنج ڕۆژا تەڕا مۆلەت.
ئەگەر تە ور تێ دەرنەخست،
ژ مە ئیدی نەکن گازن،
وێ ببە شەرمکی مەزن.
پاشێ دیسا تەمەنە دان
و زوو پارا ئەو ڤەگەریان...
مەلەک ناڤا خەم و هێرسێ
دفکرێ سەر وێ پرسێ.
خەو ئیدی نەکەتە چەعڤا،
ئەو بوو نۆلی زارا ساوا...
وی عەمر کر سەر تەلالا،
بگەڕن سووک و مەهەلا،
کێ وێ سێرێ تێ دەرخینە،
وێ قیزا پادشێ بستینە.
وان هلدا دەفا هەوارێ،
گەریان سۆقاق و بازارا،

دکر گازی قەولێ پادشێ...
هاتنە کۆچکێ گەلەک مەری
میر و ئاخا، خۆرتێد زەرین،
لێ کەسەکی سەرەدەری
ژێ دەرنەخست- شوخول وا ما.
پادشا گۆت: - بنهێرن کی ما؟
ورا قیزا وی یە دیلبەر،
نۆلی رۆیێ نوور و نەدەر
گۆتێ: - باڤۆ، تو دزانی،
تەک ما گورگانێ زیندانی.
گۆ گورگان ئانین بەر مەلەک،
ترێ دەردا هات عەسابەک.
پادشێ قەولێ پادشێ دن
ب فەن ل بەر وی رۆ کرن.
سێ کێر ل سەر تەختە هلدان
و هێدیکا ئەو دان گورگان.
پاشێ قەولێ خوە ژێرا گۆت،
ئەگەر وی ژ قەدێ خلازکە،
وێ قیزا خوە زوو بدە خۆرت.
گورگان ل کێرا نهێری،
سەر وێ سورێ کوور فکری،
گۆ زوو بکن، ئاگر دادن،
نە ئاخر ئەزی حەدادم.
کێرا باڤێژنە ناف ئاگر،
یا کو بوو وەک مخێ ژەنگگر،
- ئەو یا قازی، لێ یا وەزیر،

وا کو ورا خوه دیت تقدیر،
وێ نیفی بێ گوهاستنێ.
لێ کێرا پادشێ - ئەو ئا دنێ
هنەکی بێ گوهاستنێ.
وەختا سافی بوو ئەو پرس،
پادشا مەلەک ئیدی بێ ترس،
فەنەکۆری نۆلی ڕووڤیا
عەمر کره سەر قەوازا،
وەکی گورگان پارا بن،
وی زیندانێ دا بهێلن،
بنهێرن چکا ڕاستە
چ کو وی گۆت، یانێ قەستە.
سبەترێ ئاگر دادان،
ئوسا کرن، چاوا گورگان
بەری وێیا تەمی دا وان.
و هەرسێ کێر ب جابا وان
شاندنە سەر پادشێ دەجال.
پادشا دیت ئەو جابا کەمال،
گۆت: - پاک هوون قوربانا وی بن
کێ ئەڤ سێرا تێ دەرخستن،
لێ هەلا هێ قەت دەگەنەک
دەرباز نەبوویە ژ پادشا مەلەک.
هانێ بن هەرسێ هەسپا
و تێ دەرخن کیژان ژ وانا
ماکا وانە، کێژان جەنوو،
لێ یا دن ژی جەنوویا وێ.

هەرن، وە ڕا حەفت ڕۆژ مۆلەت،
پادشێ وە کو تێ دەرنەخست،
ئەم ناکن ژ وی تو منەت.
برا ژ مە نەکە گازن،
شەرێ مەزن ژێ دخوەزن.
قاسد زوو پارا ڤەگەریان
دانە مەلەک ئەو جابا هان.
پادشێ دیت، وەکی هەرسێ هەسپ
ڕەنگەکینە، بەژنەکینە،
هەرسێک ژی هەسپنە چێ نە.
دێل و بژوویێ وان شە کری.
لێ کیژان جەنوو، کیژان ماک؟...
کێ وێ جابا وێ بدە پاک؟...
خەو ئیدی نەکەتە چەعڤا،
ئەو بوو نۆلی زارا ساوا...
وی عەمر کر سەر تەلالا،
بگەرن سووک و مەحەلا،
کێ وێ سێرێ تێ دەرخینە،
وێ قیزا پادشێ بستینە.
وان هلدا دەفا هەوارا
گەریان سۆقاق و بازارا،
قەولێ پادشێ دکر گازی.
هاتنە کۆچکێ گەلەک مەری،
میر و ئاخا خۆرتێد زەرین،
لێ کەسەکی سەرەدەری
ژێ دەرنەخست، شوخول وا ما.

پادشا گۆت: – بنهێرن کی ما؟
ورا قیزا وی یه دیلبەر،
نۆلی رۆیێ نوور و نەدمر
گۆتێ: – باڤۆ تو دزانی
تەک ئام گورگانێ زیندانی.
پادشێ گۆت: – زوو بلەزینن،
وی خۆرتی منڕا بینن..
ومختا گورگان هات دیوانێ،
تەمەنە دا ل ئەرکانێ.
پادشێ قەولێ پادشێ دن
ب فەن ل بەر وی رۆ کرن.
پاشێ قەولێ خوە ژێڕا گۆت،
ئەگەر ئەو سێرێ تێ دمرخە،
وێ دلبەرا خوە بدە خۆرتی.
گورگان گۆت: – پادشا، قوربا،
تە جارمکێ ڤر قەولێ خوە
ب فەن و دەلکا تەرباند
و دیلبەر ژ دمست من ستەند،
برا ئەو گونە ستویێ تە بە،
و بۆی خاترێ دیلبەرێ
ئەزێ وە هینکم وێ سێرێ.
هەرن هەر رۆ بەرێڤارێ
هەسپا رێکێدا ببن ئاڤێ،
تی بهێلن رۆژا پێنجا،
رۆژا شەشا وە کو بەردا
وێ بلەزن بەر ب ئاڤێ،

ماکێ وێ بده پێشییێ،
دوو وێ هەره جەنوویا وێ،
لێ جەنوویا وێ بده پاشیێ.
وان هەسپا زوو بگرن،
دوروفێ کفش لێخینن،
سەر پادشێدا زوو بشینن.
وەختا سافی بوو ئەو پرس
پادشا مەلەک ئیدی بێ ترس،
فەنەگۆری، نۆلی رووڤیا،
عەمر کره سەر قەوازا،
وەکی گورگان پارا ببن،
وی زینداندێدا بهێلن،
بنهێرن چکا راسته،
چ کو وی گۆت، یانی قەسته.
رۆژ زوو هاتن، زوو بهورین،
وان ئوسا کر، چاوا گورگان
بەری وێیا تەمی دا وان.
مەلەک ورا گەلەک شا بوو،
کو وێ قەزیێ ژ خلاز بوو،
و هەرسێ هەسپ، جابا سێرێ
بەر ب پادشێ وی کر رێ.
لێ گورگان ما ناڤ زیندانێ،
دیلبەر دچوو سەردانێ.
وەختا جاب دان پادشێ دەجال،
پادشا دیت جابا وان کەمال،
گۆت: - پاک: هوون قوربانا وی بن،

کێ ئەو ستێرا تێدەرخستن.
وی موشتوکا چل مژڤکی
دەرخست ژ ناڤا پەرچەکی
تێلەکی زراڤ پەڤا کر
دەست ب ڤێلبازییا کر
و ڕابەری قەوازا کر،
گۆت: - هەرن بێژنە پادشێ خوە،
دەعوا مە دمینە چاوا دەعو،
برا مەلەکێ زمان قەلەو،
ڤێ تێلێ ڤێ موشتوکێڕا
دەرباز بکە، بشینە منڕا.
هەرن، حەڤت ڕۆژا وی مۆلەت،
کو تێ دەرنەخست، ئەمێ جەلات
سەر ویدا زوو ڤەرێکن،
سەرێ وی جەنمێ شا کن.
قەوازێ مەلەک پۆر-پۆشمان
سەر پادشێدا زوو ڤەگەریان،
گۆتن: - وا یە حال و حەوال،
پادشێ بریە ل مە مەجال.
مەلەک هلدا موشتوک و تێل،
نهێری چکا چ فەن و فێل
کریە ناڤ وێ پادشێ دژمن،
قورف کەتە ناڤ دلێ وی
ڕجفین پێ و ملێ وی
خەو ئیدی نەکەتە چەعڤا،
ئەو بوو نۆلی زارا ساوا

وی عەمر کر سەر تەلالا،
بگەڕن سووک و مەهەلا،
کێ وێ سێرێ تێ دەرخینە،
وێ قیزا پادشێ بستینە.
وان هدا دەفا هەوارا
گەریان چارسوو و بازارا
قەولێ پادشێ دکر گازی...
هاتنە کۆچکێ گەلەک مەری،
میر و ئاخا، خۆرتێد زەرین،
لێ کەسەکی سەرەدەری
ژێ دەرنەخست، شوخول وا ما.
پادشێ گۆت: - بنهێرن کی ما؟
ورا قیزا وی یە دیلبەر،
نۆلی ڕۆیێ نوور و نەدەر،
گۆتێ: - باڤۆ، تو دزانی
تەک ما گورگانێ زیندانی.
مەلەک ئاڤرەک دا قیزێ،
نەدخوەست وی ناڤی ببهێ،
لێ چارە چ؟ وی کولزکی
ورا گۆتە قەوازەکی،
کو زوو بکن، بلەزینن،
وی گورگانی ژێرا بینن...
وەختا گورگان هات دیوانێ
تەمەنە دا ل ئەرکانێ
و گۆت: - پادشا تە من خێرە،
دبە کو ئیرۆ دیسا سێرە؟...

پاشێ قەولێ پادشێ دن
ب فەن ل بەر وی ڕۆ کرن.
پاشێ قەولێ خوە ژێڕا گۆت
کو وێ سێرێ تێ دەرینە،
وێ دلبەرێ وی بستینە.
گورگان گۆت: - پادشا قوربا،
تە دو جارا ڤر قەولێ خوە
ب فەن و دەلکا تەرباند
و دیلبەر ژ دەست من ستەند.
ئاخر، پادشا، ئاها نابە!...
برا ئەو گونە ستویێ تە بە
و بۆی خاترێ دیلبەرێ
ئەزێ وا هین کم وێ سێرێ.
هەرن، هوون مووری بگرن،
تێل لنگێ وی ڤا گورێدن،
هنگڤ تێکنە دیزەکێ
تەک بهێلن لێ قولەکێ.
موشتوکێ تێکنە وێ قولێ،
مووری بەردن ناڤا مالێ.
تەنێ مووریێ وە خلازکە،
ئەوێ عەسە ڕێ ببینە
تێل موشتوکێ ڕا دەربازکە.
هوون خوە ورا ئەگلە نەکن
و زوو دەرێ دیزێ ڤەکن.
و سەرێ تێلا هەڤا کن،
سەر پادشێدا زوو بشینن،

کو سەرێ مە نەئێشینن.
جماعەتا ورا هازر،
ب دەنگێ زیزی کرن گازی:
- عەفەرم گورگانێ مەرا!
لێ مەلەک نۆلی مەرا،
دیسا قەولێ خوە تەرباند
چەعفێ خوە قەوازا قرپاند،
کو گورگان ببنە حەبسێ، -
قیزا خوە نادە وێ نەفسێ.
گورگان کو برنە زیندانێ،
مەلەک دەرکەت ژ دیوانێ،
عەمر کر کو مەیدانێ
هنگڤ تێکنە ناڤ دیزێ،
موشتکێ، تێکنە دەڤێ وێ،
تێلا بینن، بینن مووری،
دەرخن سێرا پادشێ زووری.
و هەر ئالیا خولام رەڤین
هنگڤ ئانین و دیز ئانین،
موشتک ئانین و تێل ئانین،
مووری ئانین ژ ناڤ کەوشەن
ئانین سێری وانا ئەو فەن،
سەرێ تێل ڤر هەڤ ڤا کرن،
مەلەک ورا گەلەک شا بوو،
کو وێ قەزیێ ژی خلاز بوو.
وەختا جاب دان پادشێ دەجال،
مەلەک دیتیە جابا کەمال،

قەوازێ مەلەک هاتن بال
و ژێ کرن حال و حەوال،
ل بەر پادشێ تەمەنە دان
موشتک و تێل ورا هلدان
و ب فەسال دانێنە بەر،
ترێ ڤر تیرەکە خەدەر
دلێ ویدا زەعف کوور چوو خار،
لێ دیسا بەر وان دانەخار،
گۆت: - پاک، هوون قوربانا وی بن،
کێ ئەو سێرا تێ دەرخستن،
تێ کڤشێ مەرییێ زانە
ل شەهەرێ وەدا هەنە...
من جێرباند ئاقلێ وە،
نها هات سریا ملێ وە.
هان وەڕا مەرتالا پۆلا،
شیشا هەسنە ناج جۆلا.
مێرێ قەوات هوون ببینن،
دەربەکێرا ب بایێ خوە
شیشێ ل ڤێ مەرتالێخە.
شیشێ پۆلاڕا دەرینە
و زوو سەر من دا بشینە.
هەرن، وەڕا حەڤت ڕۆژ مۆلەت،
ئەگەر قەولێ مە دەرمنگ کەت،
دها ژ من نەکن گازن
ئەم شەری مەزن وە دخوەزن.
قەوازا خوراندن پەلەنگ

و پارا ڤەگەرییان چەلەنگ.
بەر مەلەک تەمەنە دان.
و گۆتنێ ئەو قەولێ هان.
مەلەک سەر وی دا فکری،
هندک ما کو بگری.
دیت، تێ خەتا ل پەی خەتێ،
پادشاتی دەست وی دەرتێ.
قورف کەتە ناڤا دلێ وی،
ڕجفین پێ و ملێ وی.
وێ عەمر کر پەلەوانا
دەرخنە ناڤا مەیدانا،
برا خوە بجێرببینن،
بەلکێ شیشێ تێ دەرینن.
چل پەلەوان ل وێ فێزێ
ڕەخ هەڤدو کەتنە ڕێزێ.
یەک ژ یەکی ڤالتر
و بلندتر و گەودەتر.
جماعەت دۆرا وان جڤیا،
پادشا سەر وانا دا قووریا.
مەرتال دانینە بەر قووچێ
و گاڤ دا پەلەوانێ چێ.
و هلدا شیشا هەسنی
و هنەکی ور سەکنی،
سەرێ شیشێ هنکی داخست
و شیش ل مەرتالێ خست.
زنگینا زۆر ژ شیشێ هات،

ئەو پارا پەکیا و عەردێ کەت.
دوو وی ڕا هات یەکی دنێ،
ترێ قاسدێ مرنێ.
وی شیش هلدا و هلقۆشاند،
پاشێ ل مەرتالێ داوشاند،
بوو ڤزینا شیشا هەسن،
مەرڤ ترێ لێ سیارن جن،
مەرتالێ کەت و هلپەکیا،
مەرتال دیسا جییە خوەدا ما.
و وا چل پەلەوانا
جێرباندن شیشا هانا.
نەچوویێ قەواتا تو یەکی،
کو دەهـ دەربا، یان دەربەکێ
وێ مەرتالێڕا دەرباز کن،
پادشێ خوە ژ قەدێ خلاز کن.
شوخول ئوسا ژی جیدا ما،
پادشا گۆت: - بنهێرن کی ما؟
ورا قیزا وی یە دیلبەر،
نۆلی ڕۆیێ نوور و نەدەر،
گۆت: - باڤۆ، تو دزانی،
تەک ما کورگانێ زیندانی.
تونە بوو پادشێ تو چارە
وی گۆتە چەند خزمەتکارا.
کو زوو بکن، بلەزینن.
وی گورگانی ژێرا بینن.
کو وان گورگان ئانین ور زوو،

وی دیت پادشێ چوویە ڕەنگ-روو.
وەختا گورگان هات دیوانێ،
تەمەنە دا ل ئەرکانێ
گۆت: - پادشا خێرە، یانێ شەرە،
تە نە ڕەنگە، نە بەشەرە؟
پادشێ قەولێ پادشێ دن
ب فەن ل بەر وی ڕۆ کرن.
پاشێ قەولێ خوە ژێڕا گۆت،
کو شیشێ مەرتالێ دەرینە،
وێ دلبەرێ وی بستینە.
گورگان گۆت: - پادشا، قوربا،
تە سێ جارا ڤر قەولێ خوە
ب فەن و دەلکا تەرباند
و دیلبەر ژ دەست من ستەند.
بۆنا خاترێ دیلبەرێ،
شیشێ مەرتالێڕا دەرێ.
تەنێ سۆند بخوە ب قودسێ،
دها من ناڤێژی حەبسێ.
تەنێ هەیە قرارا من،
دەستخن مەرتالەک شیشا دن،
ب چاپا وانا، کاشا وانا،
ئەزێ ڤر بجێربینم،
شیشێ ل مەرتالێ دەرینم.
شیش و مەرتالا پادشێ
بلا بمینە تا سبێ.
ئەزێ ورا، بەر پادشێ دن

واندا قەواتێ نیشاندم.
حەتا چەعف وان نەترسینن،
ئەو دەست ژ مە ناکشینن.
مەلەک قەولێ گورگان تەمام
قەبوول کرن، گۆتە خولام
کو زوو بینن شیش، مەرتالێ
مەیدانێ چێکن ل پالێ.
خولام ئانی مەرتال و شیش،
پالە تۆپ بوون، مێر، ژن تیش-تیش،
قیزێ بەدەو، خۆرتێ تەلیان
حەزار ڕەنگی دۆرێ جڤیان،
ناڤ دا دیلبەر، نۆلی چرا،
مەرتال دانین بەر کەڤرا.
گورگان شیش هلدا دەستێ خوە
و چەند جارا ئەو هلقۆشاند،
شیش ل مەرتالێ داوشاند.
وێ ناڤ هەوێدا کر ڤزین،
ترێ بەندا عەرد لەرزی
و دووز ئۆرتا مەرتالێ کەت،
قرچینەکە ئوسا ژێ هات،
ترێ عەورێ خێژ زڤرین
و سەر هەڤدو کرن گورین.
پەکیان پریسک وەک برووسکێ،
ترێ خوەستن عەردێ دووز کن.
و ل ناڤا وێ هەساری
شیش مەرتێلدا چوو خارێ.

جماعەتا ورا هازر
ب دەنگێ زیز کرن گازی:
- عەفەرم گورگانێ مە ڕا!
عەفەرم شێرێ شێرا ڕا!
جولعەت نەکر مەلەک پادشا
بتەربینە قەولێ خوە
و گورگان چوو مال دا ڕازا.
سبەترێ گورگانێ مەرد
بەر ب دیوانا مەلەک لەزاند
هلدا مەرتال، شیشێ هەسن،
بەرێ خوە دا پادشایێ دن.
وەختا هات بال پادشێ دەجال
پادشێ دیت کو شیش و مەرتال،
وێ هەما ئوسا پارا تینن،
وی عەمر کر ب هێرس و کین.
هاتیە ڕۆژا قوربەتییا،
کو ئۆردی تەمام ڕابە سەر پییا.
گورگان کو دیت پادشێ دەخەس
تڤدیرا شێر دبینە لەز.
وی بەر پادشێ تەمەنە دا
و گۆتە وی: - پادشا، قوربا،
ما دو ڕۆژێ مۆلەتا وا.
گۆت: - هوون کڤش کن مەیدانێ.
ئەزێ بگرم نیشانێ،
شیشێ ئۆرتا مەرتالێ خم،
ئۆلی تیرێ تێرا دەرخم.

و نیدی مه نەترسینن،
دەستێ خوه ژ مه بکشینن.
خولاما کفش کرن مەیدان
و شیش دانه دەستێ گورگان،
وی شیش چەند جارا هلقۆشاند
و ئەو ل مەرتالێ داوشاند،
وێ ناف هەوێدا کر ڤزین،
ترێ بەندا عەرد لەرزی
و دووز ئۆرتا مەرتالێ کەت،
ئالیێ وێ دنێرا دەرکەت،
قرچینەکە ئوسا ژێ هات،
ترێ عەورێ خێژ زڤرین
و سەر هەڤدو کرن گورین.
پەکیان پریسک وەک برووسکێ،
خوەستن عەردێ ورا دووز کن.
پادشا، وەزیر هەڤ نهێرین،
زار، زمان وان هاتە برین،
ب ترس و خۆف وا فکرین:
– کو ناڤ وان دا هەیە مێرێ وا،
بزانبە ژ مەلەک تێ قەدا.
ئەوێ بینە کۆکا مێرا،
پاکە ئەم هەرن مالێ خوه.
وی عەمر کره سەر ئۆردیێ،
کو دها ور ئەگلە نەبن،
زوو بکن، پارا ڤەگەرن.
ب ترس و خۆف پادشێ دەجال،

پۆر و پۆشمان ڤەگەرییا مال.
پێرا دەنگ دنێ هلانی،
کو ور گورگانێ زیندانی
شیش مەرتال ڕا دەرانی.

## فەسلا سسیا

ژ پش چییا دەرکەت تەعڤا گەش.
پێرا کەنیان سۆسن، بنەڤش،
چەم دکر خوشین هێدیکا،
بوو ویتە-ویتا چڤیکا،
باسک ڤەکرن منمنیکا.
ژ ناڤا گوند کشیا کەری،
وەک بەلەدا-پێشییێ نێری،
کەڤانی چوونە قرشکا،
دوو هلکشیا ژ کوچکا.
هات چەلقینا مەشکا کوردا،
زەرییا تەمەزی گرێ دان،
نۆلی هۆریا هلدان مسین،
بەر ب کانیێ ڕەف-ڕەف لڤین..
خووت وێ دەمێ ژ ناڤا گوند
دەرکەت گورگانێ بەژنبلند.
دلێ ویدا کولا خەدەر
بەنگزێ دیلبەرێ تمێ ل بەر،
لێ خایینتی، دەلکێ پادشا
ئەو ئاڤیتنە دەولا ئاشا
و ئەو کەتە ناڤ فکرێد کوور،
ژ مالێ دوور، دیلبەرێ دوور.

و نەو ڤرا دووز کەتە رێ،
ریا کو دچە بەر ب جزیرێ،
دەرباز بوو ژ چەند نەوالا
و هاتە بەستەکە ڤالا.
دیت کو ناڤدا گوندێ گەودە.
مەرا تەرکی هلددە
بێ سەمت ل بن گرا دخە،
سەرێ زەڤیێ دادخە،
کێفا خوە زەڤیێ ئاڤ ددە.
گورگان ڤر زەندەگرتی ما،
وی تو جارا عەجێبا وا
نە زانبوو، نە دیتبوو.
هێدیکا نێزیکی وی بوو،
سلاڤ دایێ، سلاڤ ڤەگرت.
گورگان ئیدی ڤر خوە نە گرت،
گۆتێ: - چ عەجێبە برا؟...
گوندی بن لێڤا دا کەنیا،
گۆت: - ئەڤ عەجێب نە گرانە،
ئەڤا پێشێ مە گوندیانە.
عەجێبا گران ئا ئەوە.
کو ور گورگانێ زیندانی
هلدایە شیشا هەسنی،
مەرتالێ را ڕاست دەرانی!
ئەڤا بەر وێ پەری نانە...
قەوات قەواتا گورگانە.
-ئێ،- گۆت، - قوربا، ئەزم گورگان...

گۆت: – ئوسانە، وەرە حەیران،
سدقێ من ئوسا دخوەزە
ئەز برێ چووک تو ئێ مەزن.
ناڤێ من ژی گرگوهێزە،
ئەز ڤێ فێزێ، یان وێ فێزێ
گرا هەڤدو دگوهێزم.
ڤەدکم ڤر ئەز ڕیا ئاڤێ
ل سەر باخچا، ل سەر زەڤیێ.
لێ ئیرۆدا ئەم برا نە،
دەسدتێ من دەستێ تەڕا نە.
ئەز تەڕا مە، کودا هەری.
یان ڤر، یانێ ڕێسەفەری.
کورگان دەردێ خوە ژێڕا گۆت،
دەرد دلێ گرگوهێز دسۆت.
هەردو ڕابوون و کەتنە ڕێ.
ڕیا کو دچوو بەر ب جزیرێ.
کو ڕێ کورت کن ناڤا دەشتێ،
ڕێ ڤا ئەو کەتنە سۆهبەتێ
و دەرباز بوون، دەشت و بانی،
چیایێ بلند، حەزار کانی.
لێ نشکێ ڤا وان تەخمین کر،
یەکی گەودە کنجە زڤر.
وێ ناڤا کۆلێد نۆقتکێ
خوەڕا دایە پەی کێوریشکێ،
وێ دگرە، تیمار دکە
و جارکە دنێ بەردە،

و ددە پەی، دەست داڤێ پیا،
کێوریشک ناڤ دەست دا دپرتییا.
و وێ حەفت بەراشێ ئاشا،
نۆلی حەفت زنارێ تووشا
لنگێ خوە ڤا گرەدایە،
وی نە منەتە. ترێ با یە،
تێ و ب زۆر چرقاس دکە،
تۆز و دوومانێ ڕادکە،
گورگان ڤر زەندە گرتی ما.
وی تو جارا شپووکا وا.
نە زانبوو، نە دیتبوو،
هێدیکا نێزیکی وی بوو،
سلاڤ دایێ، سلاڤ ڤەگرت،
گورگان ئیدی ڤر خوە نەگرت،
گۆت: - ئەڤ چ شپووکە، برا؟...
ئەو بن لێڤا دا وی کەنیا
گۆت: - ئەڤ شپووک نە گرانە،
ئەڤا پێشێ مەیی زوودا نە.
ئەم جارنا دکەڤنە قۆشێ
یان ڤێ تووشێ، یان وێ تووشێ،
حەتانی کو ڕۆ دچە ئاڤا.
چما نزانی، مال ئاڤا،
شپووکا مەزن ئا ئەو ئە،
کو ور گورگانێ زیندانی
هلدایە شیشا هەسنی
و پۆلاڕا ڕاست دەرانی؟...

ئەڤا بەر وێ پەری نانە،
قەوات-قەواتا گورگانە.
گورگان ڤرا کوور فکری،
گۆت: -وەی لی من مالخرابی!...
ئەز تونە مە، لێ ناڤێ من،
نەبێژی هەر جیبیا دزانن.
- ئێ،- گۆت، - قوربا، ئەزم گورگان
گۆت: - ئوسانە وەرە، حەیران،
سدقێ من ئوسا دخوەزە
ئەز برێ چووک، تو ئێ مەزن.
ناڤێ من ژی تێرنەبەزە،
بێ بەز مەری بێ مرازە.
سبا دبینم تڤدیرێ
و ڤر دەرتێمە نێچیرێ.
وێ دگرم، دبمە مال،
و ددمە مەرڤێ بێ حال.
لێ ئیرۆدا ئەم برا نە،
دەستێ من دەستێ وەڕا نە.
گورگان دەردێ خوە ژێڕا گۆت،
دەرد دلی تێرنەبەز دسۆت،
هەرسێ ڕابوون و کەتنە ڕێ،
ڕیا کو دچوو بەر ب جزیرێ.
کو ڕێ کورت کن ناڤا دەشتێ
ڕێ ڤا ئەو کەتن سۆهبەتێ.
و دەرباز بوون دەشت و بانی،
چیایێ بلند، حەزار کانی

و نبینن. ئەو نشکێ ڤا
چەم دکشە پێشییا وانا،
ناڤا چەم یەکی بێهوودە
سەکنییە زنارگەودە،
چەم پێدا هووفی خوە دکە،
پێرا ژی نفرا دکە.
- گێنێ، تینا بەجیم!...
گورگان ڤر زمندەگرتی ما
وی تو جارا عەجێبا وا
نە زان بوو، نە بینا بوو،
هێدیکا نێزیکی وی بوو،
گۆت: - ئەڤ چ شپووکە، برا؟
ئەو بن لێڤا دا وی کەنیا
گۆت: - ئێ... خۆرتێ دنێنەدی.
تێ کڤشێ شپووکا گەندی
تە نە دیتیە، ئەڤ پێشێ مە یە.
چەم دکشە، چەم - تونە یە.
منرا دبێژن تێرنەخار -
نە تێر ئاڤ خار، نە تێر نان خار.
ئا ئەوە شپووکا گران،
کو ور گورگان پەلەوان
هلدایە شیشا هەسنی
و مەرتالا پۆلا خستیە،
شیش وی ئالی را دەرخستیە...
-ئێ، - گۆت، - قوربا، ئەزم گورگان!...
گۆت: - ئوسانە، ومرە، حەیران،

تو من ڤرا نەکە گازن،
ئەز بریێ چووک، تو ئێ مەزن.
لێ ئیرۆدا ئەم برا نە،
دەستێ من دەستێ وەڕا نە.
گورگان دەردێ خوە ژێڕا گۆت،
دەرد دلێ تێرنەخار دسۆت...
هەرچار ڕابوون و کەتنە ڕێ،
ڕیا کو دچوو بەر ب جزیرێ،
وەکێ ب لاڤا، یان ژی ب زۆرێ
ژ کۆچکێ دەرینن دیلبەرێ.
بینن جیێ دنێ پەیاکن،
دلێ گورگان ل وێ شا کن.
کو ڕێ کورت کن ناڤا دەشتێ
ڕێ ڤا ئەو کەتنە سۆهبەتێ
و دەرباز بوون دەشت و بانی،
چیایێ بلند، حەزار کانی.
تەعڤێ هەر جیبا دقژلاند
و بین ل وانا دچکاند.
و ئەو دبینن نشکێ ڤا
یەکی بەر قەیێ وەک سەڤا
وێ هوو دکە و پووسێ سار
سەر قەیێدا ژۆردا تێ خار،
گۆشێ قەیێ زەمبەلیکا
هەڤ گرتنە وەک نەینیکا
دبرقن حەزار ئاواز،
ترێ ناڤدا دور-لالێ خاس،

کوزکان ڤر زەندەگرتی ما،
وی تو جارا عەجێبا وا
نە زان بوو، نە بینا بوو،
هێنیکا نێزیکی وی بوو
گوت: – ئەڤ چ شپووکە، برا؟...
ئەو بن لێڤا دا وی کەنیا،
گوتێ: – ئێ.خوٚرتێ دنێنەدی،
تێ کڤشێ شپووکا گەندی
تە نەدیتیە. ئا ئەوە شپووک،
کو پادشا بەر دبن پەپووک.
شپووک ئەوە، تو نزانی،
کو ور گورگانی زیندانی
هلدایە شیشا هەسنی
و مەرتالا پۆلا خستیە
شیش ئالیێ دنێرا دەرخستیە.
ئەڤا بەر وێ پەری نانە،
شپووک، شپووکا گورگانە.
مترا دبێژن سمێلپووس
ئەز خەنیمێ مەرڤێ چکووس،
کو ئەز هووکمە ناڤا هەوێ،
دەربەکێرا زڤستان تێ.
بەرف دبارە، سور و سەرما
وەردگرن چییا و بانییا،
زارۆ هلدن خزەکا،
دلیزن، دکن حەنەکا،
دجەمدن گوهـ و پێچی،

لێ کەسەک ناهێلە وی جی،
کو دجڤن، کو تۆپ دبن،
ناڤ بەرفێدا گولۆل دبن.
- ئێ...- گۆت، - قوربا، ئەزم گورگان
گۆت ئوسانە، وەرە حەیران،
برا حەموو پێ بحەسن،
ئەز بریێ چووک، تو ئێ مەزن،
و ئیرۆدا ئەم برا نە
دەستێ من دەستێ وەڕاە،
گورگان دەردێ خوە ژێڕا گۆت،
دەرد دلێ سمێلپووس سۆت.
هەر پێنج ڕابوون و کەتنە ڕێ.
ڕیا دچوو بەر ب جزیرێ،
وەکی ب لاڤا، یان ب زۆرێ
ژ کۆچکێ دەرینن دیلبەرێ
بینن جیێ دنێ پەیا کن
دلێ گورگان زەرییێ شا کن.
کو ڕێ کورت کن ناڤا دەشتێ
ڕێ ڤا ئەو کەتنە سۆهبەتێ
و دەرباز بوون دەشت و بانی،
چیایێ بلند، دەشت و کانی.
و دبینن وێ خۆرتەکی
پالا خوە دایە دارەکێ،
بلوور ل سەر لێڤێ نارین،
وێ لی دخە، دکە گوژین،
ئوسا نازک، ئوسا دەلال،

مقام ژ بن پێچیێ کەمال
دەرتێن، وەکی دل دحەلە،
مەرڤ لاپتە خوە بیر دکە
و دچە دنێکە دنێ،
کو زلم و ترس نەکەتنێ.
خۆرت لێ دخست و چارنکال
چڤێک، کێوریشک، کارێ خەزال،
کولیلک، کەڤر، حەتا تاسێ
بەر کەتبوونە ڕەقاسێ.
گورگان ڤر زەندەگرتی ما...
وی تو جارا عەجێبا وا
نە زانبوو، نە دیتبوو،
هێدیکا نێزیکی وی بوو،
گۆت: – ئەو چ شپووکە، برا؟
ئەو بن لێڤا دا وی کەنیا
گۆت: – ئێ... خۆرتێ دنێنەدی،
تێ کڤشێ شپووکا گەندی
تە نەدیتیە. ئا ئەوە شپووک.
شپووک ئەوە تو نزانی،
کو ور گورگانێ زیندانی
هلدایە شیشا هەسنی
و مەرتالا پۆلا خستیە،
شیش ئالیێ دنێڕا دەرخستیە.
ئەڤا بەر وێ پەری نانە،
شپووک، شپووکا گورگانە.
منرا دبێژن بلوورڤان، –

جارنا گاڤان، جارنا شڤان.
ئەز ئەولەدێ ڤی کەوشەنی.
چڤیک، خەزال، سەر من بەنی.
-ئێ، -گۆت، - قوربا، ئەزم گورگان!
گۆت: -ئوسانە، وەرە، حەیران،
برا حەموو پێ بحەسن،
ئەز برێ چووک، تو ئێ مەزن.
و ئیرۆدا، ئەم برا نە،
دەستێ من دەستێ وەڕا نە.
گورگان دەردێ خوە ژێڕا گۆت، -
دەرد دلێ بلوورڤان دسۆت.
هەر شەش ڕابوون و کەتنە ڕێ،
ڕیا کو دچوو بەر ب جزیرێ،
وەکی ب لاڤا، یان ب زۆرێ
ژ کۆچکێ دەرینن دیلبەرێ،
بینن جیێ دنێ پەیاکن،
دلێ گورگان زەرییێ شا کن.
کو ڕێ کورت کن ناڤا دەشتێ،
ڕێ ڤا ئەو کەتنە سۆهبەتێ
و دەرباز بوون دەشت و بانی،
چیایێ بلند، حەزار کانی،
نشکێ ڤا یەک ل وان قووریا،
دیتن وێ خۆرتەکی تەلیان
زوو دەمەشە، دایە پەی وان.
ئەو سەکنین. دیتن وێ خۆرت
هاتە نێزیک و وانڕا گۆت:

– سەلام وەڕا، گەلی برا.
زوو دا هیڤیا وە مە ڤرا،
و تە گورگان، تە گرگوهێز،
تە سمێلپووس، تە تێرنەبەز،
تە تێرنەخار، تە بلوورڤان،
وە چ گۆتیە من ڤا عەیان.
من ڕا دبێژن گوهسەکر،
کێ کو چ گۆت، چ قسە کر،
کێ دزی کر، خرابی کر،
بوخدان ئاڤیت و دەرەو کر
ئەز دبهێم پەرا–پێرا،
بەلوو دکم دەلک و شەرا.
هوون شەش برا ئەزێ حەڤتا
ئەمێ ئالت کن حەموو قەدا.
و دیلبەرا لێڤە لێ نۆش،
کو هیڤیا گورگانە شەڤ–ڕۆژ،
بینن ب شایی پەیا کن،
دلێ گورگان زەرییێ شا کن.
هەر حەڤت برا زوو کەتنە ڕێ،
ڕیا کو دچوو بەر ب جزیرێ،
دەرباز بوون ژ گوند و زۆما،
مێشێ سخ و گەلەک چەما
و ڕۆژەکێ بەر ئێڤارێ
سەر شەهەردا هاتنە خارێ...
دەنگ بەلا بوو حەموو ئالییا،
تالال ناڤ سووکا دقووریان.

کو هات گورگان، کو هات گورگان!..
ترسا کێ پادشێ دەجەل
پۆر و پۆشمان ڤەگەریبا مال.
وی نەهیشت کو مالوێرانی
سەر وان دا بێ، نۆلی تەنی.
و ئەو بگەرن سەربەرژێر
رۆکێ برچی و رۆکێ تێر.
کووچا تۆپ بوون کۆمێ مەریا
و دان پەیێ عەفاتێ خوە.
دەف و زورنە هاتنە ئۆرتێ،
گۆڤەند گرتن قیز و خۆرتا.
بوو شایا نۆلی دەعواتا.
و ئەو بەس گهیشت مەلەک،
دیلبەرا وی یە چەعقبەلەک.
دیلبەر شا بوو. پادشا مەلەک،
ترێ دلێ وی کەت تیرەک،
چاوا قیزا وی-دەلالی
گورگان را ببە بەرمالی،
ببە بووکا پیرا خیزان
ئەوا پنتی، ئەوا نەزان؟...
لێ قەولێ وی؟... قەولێ پادشا
دزڤرە وەک کەڤرێ ئاشا...
وی هێدیکا گۆتە وەزیر
- زوو ببینە چار و تفدیر.
ئیرۆ گورگان، هەڤالێد وی
ئەوێد کەسیب، ئەوێد گوندی،

ئۆتاخەکێدا جی بکە،
سبێ نانەکی زۆر ڕاستکە،
برا مێر بێن حەموو کۆما.
و برا مە نەکن لۆما...
ببینن کو سیپانەتا وان
ئەم دگرن. لێ تو بزان،
ئەزێ وان تێکمە تەلێ،
کو خرابتر بە ژ کۆلێ،
و گۆڕێ وانڕا ساز کم،
یاخا خوە ژ وان خلاز کم.
وەزیر هێدی ڕابوو ژ جی،
هلدا عەبە، هلدا تزبی،
ب خولاما ڤا دەرکەت دەر،
ئانین مێڤانێد دێمقەمەر.
تەک وەختا ئەو مان تەنێ،
ئۆتاخەکێدا جی کرن،
عەزمت، قولخ وانڕا کرن.
تەمامە شا، تەک گوهسەکر
وێ ئێڤارێ قەت دەی نەکر.
تەک وەختا ئەو مانە تەنێ
کۆتە گورگان، وەکی کەنێ
وەزیر ل وی قەت خوەش نەهات، –
وێ بێژە، کو وەعدە هات...
سبێ، کو تەعڤێ نەدیر دا،
شەهەر تەمام ڕابوو سەر پیپا،
ڕابوون ئوسا ژی حەڤت برا،

تەلال ناڤا شەهەر بەزین
ب دەنگێ زیز کرن گازی:
– ئیرۆ پادشێ مە یی کەمال
بۆی گورگانێ مە یی دەلال
ڤەکریە خێرەتخانە...
تژی گۆشتە، تژی نانە...
برا گرەگرێ شەهەر
تامام رابن و بێنە سەر.
جاهل هلشیان و کال هلشیان،
هاتنە سەر سڤرا پادشێ،
کو ببینن گورگانێ چێ.
پادشا، وەزیر خووت وێ دەمێ،
هات روونشتن سەرێ سڤرێ.
دوو وانا ڕا دەرکەت گورگان،
و گرکوەێز، و تێرنەبەز،
و تێرنەخار، و سمێلپووس،
و بلوورڤان، و گوەسەکر.
وانا ل سڤرێ مێزە کر
ژۆرێ پادشا، ڕەخ وی وەزیر،
ڤێزا گرەگرا قازی.
دوو وانا ڕا چل پەلەوان،
دەست خوە هلدان، ڕاهیشتنە نان،
ژێرێ ڕوونشت کۆما گورگان
و تێرنەخار ڤر فکری:
– نانێ پادشێ نە کەسری
ل جانکێ من حالالە،

دو لۆق ل ناڤا سنیێدا،
و گۆت: - پادشا، ئەز بەنی،
دبە هەبوونا تە تونە؟
مێڤان برچی ڕوونشتنە...
ئەو بۆنا کورێ درانا،
لێ نە کو نانێ مێڤانا...
پادشێ گۆت سیتلێ بینن
ل بەر وی بێهوودی داینن.
دو خولاما سیتل هلدان
و پێڕا ژی دەهـ شەشە نان
ئانین، دانین بەر تێرنەخار،
کو زەندێ وی وەک قۆتە دار.
تێرنەخار خوە پێشدا دا
پێ سێ شەش نان چەند لۆق لێدا
ڕەقین ژ بنێ وێ ئانی،
و ئەو خوەڕا کرە مەعنی.
گۆت: - لۆ مالا وە خراب بە،
پادشا، قوربا ئاوا نابە.
ئەڤ بۆنا کورێ درانا.
لێ نە کو نانێ مێڤانا.
پادشێ گۆت: - سیتلا ڕێز کن،
و زوو وی نەپاکی کەر کن.
و خولاما بایێ بەزێ
سیتل دوو هەڤ دانە ڕێزێ،
و ڕاخستن نانێ لەڤاش،
پەنیرێ کوردایی خوەش.

و تێرنەخارێ نەتاوات،
تەزە سریا وی ڤرا هات
ڤالا کر سیتل دوو هەڤ،
پادشا، وەزیر، دەڤێ وان ژەڤ
دنهێرین زەندەگرتی
عەجێبا دنێنەدیتی،
کو وی بێهوودە نۆلی زیبا،
دۆنزدەهـ سیتل گۆشتێ پەزا
و بیست شەش نان هووفی خوە کر،
بادی چەقلماست سەردا کر،
بادا سمێلێ خوە یە ڕەش،
جی سەکنی وەک دەڤێ بەش
و گۆتە وی: - پادشا، قوربا،
ئەم هاتنە پەی بووکا خوە...
ڤر ترێ تیرەکە بەرک
قول کر دلێ پادشا مەلەک.
وی چەعڤێ خوە وەزیر قرپاند
پاشێ گلی لێ ڤەگەراند:
- هەلا هوون مێڤانن، قوربا.
نە دوسبە، نە سێسبە،
چەند ڕۆژا مە مۆلەت کن،
ئەمێ هەلا وە خەلات کن.
پاشێ وێ بێ سریا بووکێ:
خوە بووک نەبوو ڕەزێ سووکێ؟
کۆما گورگان ڤر ڕابوو پیبا،
وەزیر زوو دا پێشییا وانا،

ئەو برنە ئۆتاخا باشقە،
تەک دەریک لێ، بێ ڕەواقە،
بانێ دیوارێ وێ تەڤ هەسن.
تێدا دانین حەڤت جیێ مەزن.
دەری سەر وانا کیپ دادان،
هەر حەڤت برا ناڤ وێ دا مان.
سەر یەک عەرەبە دار ئانین،
کرن کوورە دۆرا خانی.
وەختا ئیدی ڕۆ چوو ئاڤا،
هێدی هات بینا کەزەبا،
تەلالا زۆر دەڤێ خستن،
کەڤانیا چرا ڤێخستن،
نانێ شیڤێ دا بەر زارا
نڤین ڕاخست مالخوێ خوەڕا،
دەرکەتن لاوەندێ شەڤێ.
جزیر پێدا کەتە خەوێ،
پادشا و وەزیر تەلە-تەل،
نۆلی دزا، مرووز زەعف تەل
هاتنە دۆرا خانیێ گورگان،
خورۆم گیها هێدی هلدان
و ئاگر بەری دارا دان.
ئالاڤا گور زوو قولۆز بوو
و شەڤەرا دەو و دۆز بوو.
و ڤر ئۆتاخا هەسنی،
وەک تەندوورێ زوو سنجری،
هشیار بوون تێدا حەڤت برا،

دیتن ئەو عەجێبا گران،
وانا سمێلپووس کر گازی
کو هونەرێ خوە نیشان دە،
یان نا، حەموویێ ببنە کۆزی.
وی ڕاهیشتن چەند تەڤزی،
گۆت: - بەندێ وە چما سست بوویە،
بسەکنن، هەلا زوو یە.
ژ سەرمێ ئیدی خوە ڤا چوومە،
ئانجاخ هنەکی گەرم بوومە.
- بەسە تو خوە پاشدا بدی،
زوو بکە، سمێلپووس، گدی!...
ئیدی مە تێ زۆر بینا کز،
کزێ کو تێ ژ مالا دز.
گۆت: - گونە وە ل ستوییێ وە بە،
برا ژ من گازن نەبە...
وی هوو کرە بانێ ژۆرێ
و ڕەخدەری و ل دۆرێ،
بان قشا گرت. سور و سەرمێ
لووڤاندە وان دەوسا گەرمێ.
وانا لهێف خوە پێچاندن
حەتا سبێ ڕجفاندن.
وەختا ڕۆهلات گەش ڤێکەت
و تەعڤا سۆر هێدی دەرکەت.
پەنجێ خوە هەوێدا وەردا
و ڕژاندە حەموو عەردا،
وەزیر پێنج، شەش خولام هلدان،

هاتن بال ئۆتاخا گورگان،
کو دەرێ ئۆتاخێ ڤەکن،
هەست-پەستێ وان زوو تەمز کن،
وەکی نەبینن بنەلی،
پادشێ ل وان کر خایینتی.
وەختا وانا دەری ڤەکر،
عەجێبا گران مێزە کر...
هەر حەڤت برا سەر دێمێ خوە،
سەر بەنگزێ خوە، سەر قامێ خوە.
وان دانە هەڤ خۆش و بێش،
دلێ وەزیر تژی کول-ئێش.
حەڤت برا هەما وی چاخی
زوو دەرکەتن ژ ئۆتاخێ،
ناڤ شەهەر دا خوەڕا گەریان،
چوونە جەم هۆستێ گورگان،
هۆستا ئەو دیت پێڕا شا بوو،
دەنگ حەدادخانێ بەلا بوو:
یەکی هلدا تەختێ فرە،
تەڤشۆیێ تووژ و مقارە.
تەراشتن جاخێ عەرەبێ،
ئێ دن قازناخێ تەکەرێ
فەسال ڕاست کر ل بەر کوورێ،
یەکی مخێ نالا تۆپ کر،
یەکی گیسنێ جۆتا زۆپ کر.
یەکی چێکر زرزا دێری،
گورگان زوو چێدکر سورنی.

و حەتانی ڕۆ داگەریا
خەبات دەست هۆستادا نە ما.
خووت وێ دەمێ گۆت گوسەکر:
- چ پادشێ گۆت، من تەڤ سە کر،
وێ ئیشەڤ جیێ مە داینن
ئۆتاخەکە خەولەیە دن.
ئاڤا ئاشا بەری سەردن،
کو ئەم تێدا بخەنقن...
نها وەرن هوون ڤێ جارێ،
ئەم خوە بکن چ چارێ؟...
تێرنەخار گۆت: - پەی، بەیتییۆ،
نە ناڤێ تە بە، نە تو یۆ...
پادشێ مە یی بێ ئامنە،
ڤێ جارێ ژی سریا منە.
تێرنەخار چەما دچکینە،
ئاڤا ئاشا وێ بمینە؟
برا ئەو بەر فەنێ خوە بن،
ئەم ژی وێ هاژ یا خوە هەبن.
سبێ ئەوێ پۆر-پۆسیدە
دیسا مە ژ ئۆتاخێ بەردە.
ئەم نها هەرنە دیوانێ،
پادشا نەڤێژە ئەو کانێ؟...
ئەم گلییێ خوە بینن ڕووکی
و ژێ بکن دەعوا بووکێ.
کۆما برا زوو ڤەگەریان،
بەر دیوانا پادشا جڤیان،

قصىتا كەتن مسلەتێ،
چکا ژ پادشێ چ دەرتێ.
پادشا هێرس گۆتە خولاما،
کو نان داینن بەر مێڤانا.
دیسا نۆلی ڕۆژا بەرێ
تێرنەخار هات دۆرا سفرێ.
و خولاما بایێ بەزێ
سیتل ڕەخ هەڤ دانە ڕێزێ،
وی ڤالا کر سیتل دوو هەڤ.
پادشا، وەزیر دەڤێ وان ژەڤ،
دنهێرین زەندەگرتی
عەجێبا دنێنەدیتی،
کو وی بێهوودە نۆلی زیبا،
دۆنزدەه سیتل گۆشتێ پەزا
و بیست شەش نان هوفی خوە کر،
بادی چەقلماست سەردا کر.
بادا سمێلێ خوە یە ڕەش،
جی سەکنی وەک دەقێ بەش.
و گۆتە وی: –پادشا، قوربا،
ئەم هاتنە پەی بووکا خوە...
ڤر ترێ تیرەکە بەرک
قول کر دلێ پادشا مەلەک.
وی دیسا فەن مێڤان خاپاند
و گلیێ هان لێ ڤەگەراند:
– قوربا، خوە هوون نە نەزانن؟...
ڤرا هەلا هوون مێڤانن...

حەڤت ڕۆژا هوونێ مۆلەت کن،
ئەمێ هەلا وە خەلات کن.
پاشێ وێ بێ سریا بووکێ،
خوە بووک نەبوو ڕەزێ سووکێ؟...
و وی دوو هەڤ دانە ڕێزێ
چ لازمە بۆی جهێزێ
قیزا وی یە ناڤ و نەدەر –
خوە وێ بێ پار دەرنەخە دەر؟
گلیێ وانا گەلەک کشاند،
خەوا شەڤا وان دقوساند.
وەختا دیوان ور بەلا بوو،
وی چەعف کرە وەزیرێ خوە،
کو بدە پێشییا مێڤانا، –
ڤەرێکە هەرێما وانا.
کۆما گورگان ڤر ڕابوو پیا،
وەزیر زوو دا پێشییا وانا،
ئەو برنە ئۆتاخا باشقە،
تەک دەریک لێ، بێ ڕەواقە.
ئۆتاخ نۆلانی چەعلا نان،
تێدا دانی حەڤت جی بۆی وان.
دەری سەر وانا کیپ دادان،
هەر حەڤت برا ناڤ وێ دا مان.
وەختا بانگ دا دیکێ شەڤێ،
هێدی هات بینا کەزەبا.
تەک دهات دەنگێ لەوەندا،
وەزیر خولاما عەمر کر،

دولێ ئاڤێ سەر وان ڤەکر.
فتل دا خوە نۆلی ڕووڤیا
و هات کەتە ئاڤا جییێ خوە.
ل تێرنەخار نهێرین،
گۆت: - نیشندە تو چ مێری!...
وی دەڤێ خوە دا بەر دولێ
هلچاندە خوە ئاڤا جەوێ،
وی جەو ئوسا دچقاند،
دلۆپە ئاڤ نە درژاند.
وەختا ڕۆهلات گەش ڤێکەت
و تەعڤا سۆر هێدی دەرکەت،
پەنجێ خوە هەوێدا وەردا
و ڕژاندە حەموو عەردا،
وەزیر پێنج-شەش خولام هلدان،
هاتنە بال ئۆتاخا گورگان،
کو مەیتێ وانا کەفەن کن
و کەرە-لال ببن چەعل کن.
وەختا وەزیر دەری ڤەکر، -
عەجێبا گران مێزە کر...
هەر حەڤت برا سەر دێمێ خوە،
سەر بەنگزێ خوە، سەر قامێ خوە...
برا دا وەزیر خۆش و بێش
دلێ وەزیر تژی کول-ئێش،
حەڤت برا هەما وی چاخی
زوو دەرکەتن ژ ئۆتاخێ.
ناڤ شەهەردا خوەڕا گەریان،

چوونه جەم هۆستێ گورگان.
هۆستا ئەو دیت پێڕا شا بوو،
دەنگ حەدادخانێ بەلا بوو.
یەکی کوورا ئاگر دادا،
یەکی هەسن سۆر کر لێدا
و خزمەتا حەموو گوندیا
وان خلاز کر سێ سحەتا.
خووت وێ دەمێ گۆت گوهسەکر:
- چ پادشێ گۆت، من تەڤ سە کر.
پادشا، وەزیر، قازی، لەلە
وێ ژەرێ تێکن ناڤ خارنا مە:
نها هوون وەرن ڤێ جارێ
ئەمێ خوە بکن چ چارێ؟...
بلوورڤان گۆت: - تو گوهسەکر،
نها سریا منە، شکر.
وەختا وان بەر مە نان دانین،
هوون دەست نەدنێ، حەتانی
ئەز بلوورا خوە دەرنەخم،
ورا مقاما لێ نەخم.
کۆما برا زوو ڤەگەریان
بەر دیوانا پادشێ جڤیان،
قەستا کەتن مسلەتێ،
چکا ژ پادشێ چ دەرتێ.
پادشا زوو گۆتە خولاما،
کو نان داینن بەر مێڤانا،
ماقوول ڕوونشتن دۆرا سفرێ،

خولاما خارن نانێن ب سرێ.
بۆلما عەولن دان بەر پادشێ
یا گرمگرا هات پاشێ،
لێ کوتاسیێ یا حەفت برا،
کو کەر ڕوونشتبوون ورا
بندا برنج، سەر وێ قەلی
مرنا خاینێ ناڤ هەر پەری.
پادشا هەمین بەر فەنێ خوە،
خومگومان نانێ خوە دخوەر.
بلوورڤانێ چێ وێ دەمێ
بلوور دەرخست ژ بەر پشتێ
و لووڤاندێ قەیدێ نێرییا،
ترێ عەرد، عەزمان دزێرییا.
دیوان ور کەتە حەواسێ،
پاشێ هات قەیدێ ڕەقاسێ.
بلوورێ هەی دوگوژاندێ،
کرەگر کەتنە گۆڤەندێ.
پادشا کەتە سەرگۆڤەندێ،
دەزمال پێچا دۆرا زەندێ
چەپ لێخستن، ڕاست لێخستن،
ترێ حەیفا خوە دەرخستن.
ل سەر سفرێ بۆلە و نان
هێدی-هێدی ژ جی لەقیان،
ئێد ژەر تێدا چوون ئالیێ دن،
ئێد تەمز هاتن بەر گورگان.
بلوورڤان برا نەهێری،

زوو دەنگێ بلوورێ بری،
چەعف کرە وان خەما مەکن،
نان بخون، بۆلما ڤالا کن.
وەختا وانا نانێ خوە خوەر،
حەفت مێر پێش وانا تەنگەزار،
ناڤا خوە گرتن و زێریان
و بوونە مەیت، ل عەردێ مان.
وەزیر ل پادشێ نهێری،
نۆلی ژژوویێ ل بن دری،
کو وان تەربی ئەو تڤدیر،
لێ سورا خوە دیهار نەکر،
تەنێ گۆت : "خودێ ئوسا کر!..."
حەفت مەیت ئانین کەفەن کرن،
وێ ڕۆژێ برن، چەعل کرن...
سبەترێ برێ ئەڤین
وەختا ڕابوون ژ خەوا شیرن،
سەر چەعڤێ خوە تەزە شووشتن،
دۆرا قەواتێ ڕوونشتن،
خووت وێ دەمێ گۆت گوسەکر:
- چ پادشێ گۆت، من تەڤ سە کر.
هەما خووت ل بەر دەرگە
کۆلانە چەعلەکە فرە.
و کولاڤێ خورستانی
ل سەر وێ چەعلێ ڕاخستی.
پش دەرگە ڤا چل پەلەوان،
دەست دا مەرتال، نزێ گران

هیڤییا مه نه، نۆلی گورا.
وەختا کو ئەم هەرنە ورا،
وەزیرێ بێ پێشییا مه،
سەر کولێف را ئەم دەرباز بن.
و زۆر دا چەعلێ دا خار بن،
پەلەوان زۆر دا مێزە کن
و وێ لەزێ مە خەزا کن.
تەمیا من وە ئەز چاوا دچم،
هوون حەموو ددنە پەی من.
لێ هوون ژی رند هاژ خوە هەبن،
چەکا دەستێ خوە بەرنەدن.
گورگان هلدا شوور و مەرتال،
کرگوهێز مەرا خوە دەلال،
تێرنەبەز شداندن بەراش،
سمێلپووس - دا کێرانێ کێر،
بلوورڤان - بلوورا سێر،
دانە پەی برا گوهسەکر
کو بەلەدی ل وان دکر.
وەختا دەرکەتن مەیدانێ،
وەزیر وانا ڤا هات خانێ.
نۆلی رووڤیا ب ڤێلبازی
ل حەڤت برا کرە گازی:
- هوون خێر هاتنە مێرێد چێ!
وەرن، ئەم هەرنە دیوانێ!
پادشێ نها سڤرێ ڕاستکە
و وێ وە حەموویان خەلات کە.

جهێزێ دیلبەرێ بار کن
و وێ هلدن، ئیرۆ سیار کن.
کو ئەو هاتنە بال کولاڤ،
وەزیرێ کنی دەلک–دۆلاڤ،
کر کو ورا خوە ئەگلە کە،
ب سینچێ گوری مێزە کە:
چاوا برا بەر وێ تەلێ
سەر سەری دکەڤنە چەعلێ.
لێ گوهسەکر ل پشتێدا
پێ ناڤملا وەزیر دەف دا،
ئەو گولۆل بوو ل سەر کولاڤ،
پێڕا کەتە چەعلا خوناڤ.
بوو هەیتەهۆل و هێوررزە...
بوو قیرە–قیر، شین و گری...
قەواز لڤین، خولام ڕەڤین،
کو زوو بکن، وەرس بینن
وەزیر ژ چەعلێ دەرینن.
لێ گرگوهێز زوو مەر هلدا
بن دیوارێ دیوانێ دا،
ئانی ل سەر چەعلێ ڕۆ کر،
ل بەر برا ڕیا دووز ڤەکر.
پادشا گۆتە پەلەوانا،
کو هات ئیدی سریا وانا.
ئەو دەرکەتن مەیدانا شێر
دەستادا گورز و شووڕێ کێر
و ڕمێد چاردە مۆڤکی.

هەر یەکی قاسی دێوەکی،
و دەست شەر بوو، شەرێ گران،
ڤرا ڕابوو هێرسا گورگان،
ئەو پێشدا هات نۆلی شێرا
و بەرێ خوەدا حەڤت مێرا.
ئەو ل دیوێر هاسێ کر،
مەیتێ وانا عەردێ ڕەز کر.
کرکوەێز پێ مەرا گومان
دەربەکێڕا حەڤت پەلەوان،
پێڕا ژی عەردێ بن پێ وان
هلدکشاندە ناڤا عەزمان،
ئەو بوونە مەیت و ورا مان.
تێرنەبەز هلدا حەڤت بەراش،
کەتە ناڤ وان وەک دەقێ ڕەش.
حەڤت ژی ورا کەتن نەحش.
تێرنەخار پێ گورزێ گران
مالا حەڤتا ژی کر وێران.
سمێلپووس دەرکەتە ڕووکی
ب زەخمی خوە ئەوی هوو کر،
و هەر دەرێ ڤر قشا سار
سەر مەریادا ژۆردا هات خار.
حەڤت پەلەوان زوو قەرمین،
ژ مەیتا ئیدی عەرد هەرمی.
ڤرا هات سریا بلوورڤائان، –
وی بلوورێ خست–پێنج پەلەوان
ل بەر وی کەتن ڕەقاسێ،

حەتا چوون سڤدەرا هاسێ،
گورگان، گرگومێز، تێرنەبەز
مەیتێ وان ژی ڕێز کرن لەز.
و دادانە پادشێ، قازی،
کو ڤردا، وێدا دبەزین،
گورگان گورزێ خوە زۆر با کر،
سەرێ وان جەعنمێ شا کر.
و داکەتە کۆچکا ڕەنگین،
کو دیلبەرا وی یە ئەڤین
پش حەڤت دەرێ کلیت کری
ڕوونشتبوو و دگری.
وی پێ سەلفا شوورێ پۆلا
ب بائێ خوە کلیتێ دا،
کلێت زرزێ ڤا دفرین.
ل بەر وی ڤەدبوو دەری.
وەختا دیلبەرێ گورگان دیت،
دەزمالا شل وێدا ئاڤیت،
خوە ئاڤیتە حەمێزا خۆرت،
کو موحبەتێ دل دسۆت.
گورگان گرت دەستێ دیلبەرێ،
هێدی دەرکەت ژ سڤدەرێ،
هاتن ئاڤا کۆما برا،
بەرێ خوە دان مالا هۆستا.
گورگان دیا خوە ژی دیت، ئانی
و دا وێیا ئەو مزگینی.
ورا تەزە دەعوات کرن،

شەهەر پێدا خوە شا کرن.
حەفت ڕۆژ، حەفت شەڤا بلوورڤان
دگوژاندیێ ب دل و جان...
ل ڤێ فێزێ، ل وێ فێزێ
مقام دوو هەڤ دانە ڕێزێ
و مقامێ ئوسا دەلال،
بەر ساخ دبوون سدقێ بەدحال،
دبێن بلوور وێ ڕۆژێدا
بوو حزکرییا حەموو کوردا.
ڕۆژا حەیشتا گورگان و دێ
خوەڕا هلدان نالبەندێ چێ،
دیلبەرا دەلال سیار کرن،
قەوم و پزمام خوەڕا برن،
براڕا تەڤ چوونە کەوشەن،
کو تونە پادشا فێل و فەن.

یێرێڤان ۱۷. ڤ ۱۹٦۹ س.

ڕێداکتۆر: جاسمێ جەلیل
شکلکێش: گ. ئا. گاسپاریان
ڕێداکتۆرێ بەدەوتیێ: ئان. ڤ. گاسپاریان
ڕێداکتۆرێ تەخنیکیێ: ئال. ئۆ. مارگاریان
کۆرێکتۆرێ کۆنترۆل: لەتیفە عەمەر

# ئەز و تەبییەت

## تێمووری سادق

---

نەشرەتا "سۆڤێتاکان گرۆخ"

سالا ١٩٧٦، یێرێڤان

ТЕМУРЕ САДЬQ

# ӘЗ У ТӘБИЙӘТ



Нәшьрәта "Советакан грог".
Сала. 1976, Ереван.

## چەند گلی

تێمووریێ سادق شەمیلزادێ سالا ١٩٢٢- ئا ل قەزا وانێ گوندێ ئامۆکێ (ل توورکیائێ) ژ دیا خوە بوویە. سالا ١٩٢٦ ئا مالا باڤێ تێموور تەڤی گەلەک ئەشیرەتێ کوردا مهاجری وەلاتێ سۆڤێتێ دبن.

تێمووریێ سادق ل ئێرێڤانێ سالا ١٩٣٧ - ١٩٣٣ئا تێخنیکووما کوردایە پێشکاڤکازێ یە پێداگۆگیێ دا خوەندیە و خلاز کریە.

دوو کوتاکرنا تێخنیکوومێ ڕا ئەو ل گوندێ ساماکاشێنێ نەهیا شاهوومیانێ دا (رسس ئەرمەنیستانێ) چاوا دەرسداریێ زمانێ کوردی دخەبتە.

وەختێ شەرێ وەتەنیێیی مەزن دا سالا ١٩٢٤ - ١٩٤١ ئا ئەوی مەکتەبا ئەسکەریێ دا دخوەند و زووتریێ ئەو ب ڕازەدلیا خوە ڤا بۆنا خوەیکرنا وەتەنێ سۆڤێتیێ دچە ناڤا دەستێ پارتیزانایە کۆڤپاک و پاشێ کاراسیێڤ و ب مێرخاسی مقابلی دژمنا شەر دکە.

دوو خلاز بوونا شەرێ وەتەنیێیی مەزن ڕا سالا ١٩٤٥ ئا ئەو ئوونیڤێرسیتێتا ئێرێڤانێیە دەولەتێ یە پارا فارسیدا تێ قەبوولکرنێ و سالا ١٩٥٠ ئێ ل باژارێ دوشەنبێ (پسس تاجیکستانێ) خوەندنا خوە خلاز دکە.

تێمووریێ سادق وەختێ تێخنیکووما کوردایە پێشکاڤکازێ یە پێداگۆگیێ دا دخوەند، هزکرنا وی بەر ب ئەدەبیەتێ پڕ دبوو و ئەوی هێ وێ هنگێ شێرێ لیریکیێ دنڤیسی. ژ وان شێرێ وی یە نڤیسی هنەک گازێتا "ریا تەزە" دا نەشر بوونە. سالا ١٩٦١ ئێ شێرێ وی کتێبا "ئەفراندنێد نڤیسکارێد کوردێ سۆڤیتیێ" دا هاتنە چاپکرنێ.

ئەم ڤێ کتێبا تێمووریێ سادقێ "ئەز و تەبیەت" ڕابەری خوەندەڤانا دکن.

تێمووریێ سادق ١٩ ئێ ئاڤگووستێ سالا ١٩٧٤ ئا ل باژارێ دوشەنبێ دا وەفات بوو.

جاس مش جەلٚ

## سەهەتا دلێ من

سەر دەستێ من
سەهەت هەیە،
دلێ من ژی
مینا وێ یە
یەک سەهەتا
خوونا منە،
لێ یا دنێ
ژ هەسنە
هەردو هەڤرا
دخەبتن،
یەک و یەکە
بەتال ناکن
هەر پارەکە
دنیالکە،
وەدێ وانا
نە فۆرمەکە
هەرەک جوورێ
خوە لێدخە،
شەڤ و ڕۆژا
هەڤ دەردخە
یەکە گولان،
یا دنێ ئەڤار،
یەکە ناڤرۆژ،
یا دن نادار.
گولانا مە

مۆسکڤا ئاڤا،
سەھەت دسترە
مینا سازا.
بەلا دبە
ئەرد و ئەسمان،
تەمام دڤە
ب وێ گومان.
سەھەتا من،
مۆسکڤا زۆرە،
خوونا من دا
گەش دگەرە
ئەو ئەدلایە،
ئەشق و شایە،
مراز، بەختە،
تەک رِیا راستە

## ئەرمەنیستانێ را

ژ شمالێ
ئۆکتیابرا نار،
تە را ئانی
بەخت و باھار.
دا تە پسق،
ئیزن، دەستوور،
رِۆژا تە
شەمالدا، بوو نوور.
مزگین گھیشت
شڤان، ئەھلی،

بوونە خایێ
مال و خوەلی.
خەتێ ئەردێ بوون
پێلێ بەرێ،
گوندێ شا بوون
هەموو دەرێ.
دەرکەت دەشتێ
دێوێ هەسن،
کەد، خەبات بوو
بەخت و پەسن.
گول دەرکەتن
وارێ تە دا،
بوویی گولستان
سەردا پێدا.
ڕیا تە ئازا،
شەوق و شەمال،
ئەرمەنیستان
ڕوە و شەمال!
نها خەون، مراز
جنەتی تو،
ئەمرێ ئازا
بەختەواری تو.
تو باهاری
سینگێ زەمین،
گولا ئازا
پەرێ ئەسمین.

خرخال تژی
نەرگیز، بەیبوون،
برێ پانزدە
ڕەوش و هەبوون،
ڕیا تە ئازا
شەوق و شەمال،
ئەرمەنیستان
ڕوهـ و شەمال!

س. ١٩٦٧

## تاجیکستانێ ڕا

ئەسمانێ تە ئازا
وەک چەڤێ یارێ،
بەژنا تە ئال
گولێ باهارێ.
چینارێ ب ڕێز
بەژن و بالا تە،
بازارێ دوشەنبێ
خەت، خالێ تە
زێڕێ قەرقاش
دەسمالا بەرجێنیک،
چیایێ پامیر، ئالاتائۆ
کۆفیا تە تیک.
مەیدانا لێنین
بەختێ تە یی گول،
بەرا نۆریکێ
تەرا بەخت، بلبل.

پاییزا زێرێ سپی
ژ ته دەرتێ،
دوشەنبە کانە
خووت بەرا جنەتێ.
ئیرۆ تو خەونی،
ئیرۆ هکیاتی،
وارێ تاجیکێ
مێرخاس، ئەگیتی.
وەلاتێ چیا
تاجیکستانا ئازا،
ئیرۆ تو بەختیاری
تەڤی برا.
و ئەز لاوەکی
ملەتێ کوردا،
سەر تە دسترێم
کلام، بەیت و بەندا.

## ئەز و چەمێ مە

١

هوب خەونن و چیرۆکن،
مالیڤانێ قورنانن،
رووسپیێ رووسپیانن،
شەدێ دەور، زەمانن،
چەمێ مە!
هوون ل سینگێ چیایێ مە،
باهارن و ئاشقێ مە.

هوون روحن، ڕوحا ددن،
ڕەوشا باخ و بۆستانن،
چەمێ مە!

کانیێ مە زەلالن،
ئاڤلهەیات، کەوسەرن،
ئەو دۆختر، دەرمان و هەکیم،
بۆی هەر بەندەکی هەمین،
چەمێ مە!

هەزارا ئەرق تەڤ تە دبن،
دبن چەم، دوخولخولن.
وەک پۆرێ منی سپی،
شەڤ، ڕۆژ دکشن ڕووسپی،
چەمێ مە!

هوون دستریێن، دکن قال- جەنگ،
شەل-پەلا دخن خار، تەنگ،
شێر و بەیتا هەڤ تینن،
هوون ژی نۆلی من شایرن،
چەمێ مە!

٢

چەم گۆت:
- وەکە ئاڤا منە گور،
ژ چەڤێ دیا هلدشیا دور،
زێرین و نالینا وان،
هەیلۆ دگهیشت ئاسمان.

مرن، تالان و تووژان،
خەلایی، نەخواشی و ئان،
بووبوو قسمەتێ ئینسان،
ڕەش خەملی بوو دەوران.
زولمکارا کێف دکر،
هەبوون ژی بەرەڤ دکر،
ها ژ دنێ تونە بوون،
و وێ بن مەلوون...
وێ ڕابن پالە، گوندی
شەرکن مێرخاسی، جندی،
قەیدە-قانوونێ گەنی،
هیم ڤا هلشینن گەندی.
هات ئۆکتیابرا سۆرە، نار،
وە ڕا ئانی ئەمر، باهار،
ب سایا لێنینێ زۆر،
ئەم ژی بوون کان، خەت و مۆر.
چەمێ مە.

٢

هەزار کولیلک، گول، سۆسن،
مێشە، ڕەهان و هاون،
باخ و بۆستان، تەرازن،
هێشین دکن ب سایا
چەمێ مە!
گەلی، نەوال، بەست، چیا دا،
بازار، ئاڤا، گوندا دا،
لەهەنگ چێبوون، برق ڤەدا،

ـخەمێن ب ئاڤا

چەمێ مە!

ـژێر. زاڤۆد، گوند، مەیدان،

ماڵ. سۆقاقا، فابریکا، ئاڤان،

ڕیا هەسن، چۆل و بەستان

شەمال ددن ب ئاڤا

چەمێ مە!

خووت وێ شانەشینێدا،

وێ لەتیف بەرستانێدا،

ژ دێ بووم، مەزن بوومە،

و گهیشتم ڤێ ڕۆژا مە،

چەمێ مە!

بن هورمینیا تە دا،

نازک سازبەندیا تە دا،

دەفرینم و دهوونم،

مقامێ تە هەڤ تینم،

چەمێ مە!

تو بسترە و شا ڤە،

تو یازیا ئەمرێ من،

برا وەلات تە شێن ڤە،

تو قەلەما شێرێ من،

چەمێ مە!

## چیا و چەمێ مە

پامیر، قەرەتاخ یان قەتەر

کایهایێ توورکستان،

هوون ئه کەرن، خەبەر نادن، تاریقا
کەڤن وە دیتییە،
برقا شوورا، دووێ گولا، دەنگێ
تۆپ، تیر و کەڤان،
ئەو قیرینیا ژنەبییا، کا
قسەکن وە دیتییە؟
ئەرد دلەرزی ژ خوونا نەهەق،
ل بن نەعلێ باسمەچیا،
وە تاقەت کر زولمێ گران، مە ڕا
بێژن گەلی چیا؟
یان قسەکن چەمێ مەزنە قەدیمی
فەخش، زەرمفشان،
چقاس وە شووشت خوونا نەهەق کو
مینا چەم تەڤ وە دبوو؟
چقاس هێسرێ زارێ ئەتیم درژیان،
ژ قەستێ خانا،
هوون بەختیارن ڕۆژا ئیرۆ بەیراقا
سۆر سەر وە ڤەبوو،
ڕۆژا ئیرۆ هەزار ڕۆستەم ل سەر
وە نە، دەست دا قەلەم،
کوور و کوبارا مژوول دبن ژ
کانیا وە ئاڤێ دەردخن.
ئاف و هەوا وە یە زەلال، ئەو
دکشیان سەهەت و دەم
ل دۆرا وە باخ، گولستان ل
ئەردێ دێم ئاف دکشن،

ڕۆژا ئیرۆ ل بەرمکێ وە هەزار
شەمەرێ گەشە تەزە،
چقاس هۆستا و ئینژینێر ب وە
مەشخوولن، وە ڕا فەرزن.
ل سەر تاجێ وە یی سپی بەیراقا
سۆر دفرفرە،
ل کوورایا خەزنێ وە دا هەزار
ماشین گورە-گورە.

## ئەز و تەبییەت

من تەبیەت هەمێز کر
- وارێ کال و باقا،
پاخلێ دا ڕازام
مینا زارا ساقا.
و وەختەکی شەڤێ،
ستەیرک کەتن ڕەقاسێ،
شەمال دا ئەرد، ئەسمان،
وەک شەمدانێ تاسێ.
هەر دەرا بوو ئیشق،
مێشە ژی هشیار بوو،
بەلگا هەڤ ڕامووسا،
ئەینی شانەشین بوو.
بێ ژی نەرمک ویلاند،
بەدەن، پۆرێم، ماچ کر،
بینا هەزار یەک گول
تژی قەفەسام کر.
گەل تەبییەت هکیاتە،

بەدەوی ڕەوشا وێ،
ئیسان گول، جەواهر
دکە ناڤ بەژنا وێ.
هەر فەسلەک تەریقە،
تەریقا ئەمرێ وێ،
جارنا دکە سەرما،
جارنا تیرنجێ وێ،
ب فۆرم و جوورێ خوە،
خەملێ ل خوە دکە،
ژ کەسی ناپرسە
و هیڤی ژی ناکە
ئیسان، تەبییەت برا نە،
تەبیەت پاتشائێ دەورا،
ئیسان وەدەلی یە
مینا بەلگێ دارا.
باهارا هێشین دبە
پایزا دادوەشە.
خەما تەبیەتێ نینە
و خوە ڕا تم دمەشە.
و من ژی چەند سالا
ل وێ ڕند مێزە کر،
پر هندک کەد دانی،
ئەمرێ من ژی قۆل کر...

## پۆرێ من کەو بوویە

پۆرێ من کەو بوویە،
ڕەشایی هندکە،

بۆنا من ئەجێبە،
تەبیەت یا خوە دکە.
دبە ئەو پێشکێشن،
یارێ ئەو شاندنە،
و هەر تێلەکە سپی
گازنێ وێ نە؟
نا، تەبیەت زۆرە، زۆر،
هەر تشتی زانە،
بەرفێ ددە چیا،
مژ پارا گەلیانە..
دبە پاییزە، وەختە،
لەما باران دبارە،
خوەستن هاسل بوویە،
سەرێ چیا بەرف دگرە؟
ئەز پۆر مێزە دکم،
ڕەش سپی دادخوە
قەلبێم خراب دبە،
بیر تینم جاهلتیا خوە
بەر چەڤێم دبە با،
بۆبەلیسک و دوومان،
پێلێ سپییە زەخم
ڕادبن چا تۆفان.
لەز کەندالا دخن،
دهەژە ئەرد، ئەسمان،
پۆرێ سپی زۆرە
یا وی یە دەوران.

بێ وەدە یە، بێ کێر،
ئەو تۆفانا پاییزێ،
تەبیەت هوکومدارە،
خوە ڕا لێدخە جازێ...

## دێ

پێشکێشی دیا خوە جەمیلا
خەلیفەئوسف دکم

بیرا من تێ بچووکتیا من،
تو یە کوبار ناڤ زەریا دا،
ب ئەشیری کۆفی، کتان،
خەملا گولیا د زێرا دا.
دێمی ب خال، بسکێ بادای
کنجێ ئەتلەس و گولافتوون،
شنگینیا پیژ، کەرکیتا
ب شەڤ و ڕۆژ پێشێ تە بوون.
تو بوویی بەربوویا بووکا،
جریدا ب سیارا ڕا،
گەلەک وەختا سیلە دێست دا
تو دەرکەتی پێش نەیارا.
بوویی بێریڤان و خازگینچی،
چا ئەدەتێ ژنا کورد
د شەرێ مقابلی دژمن،
ژ بۆی بەخت و نامووسا کورد
بیرا من تێ، تە چا نازک،
ئەز ددامە هەمێزا خوە،
وەختێ چەتن و فرمیێ،

من دهانی ئەو بیرا خوە.
ئەو نۆڤەتا تەبیەتێ بوو،
ئوسا ژی تە دەین ددا من،
زارو هەنە جەگەرێ دیا،
نەجێرباند دلێ خوە دا من.

دوورکەتنا دونزدەهـ سالا،
من ئەزیەت دایە تە، دایێ،
پیر بوون، ڕوویێ قەرمچی،
و پۆرێ سپی ل تە نایێ.
ژ تەیرێ سیمر بێ ڕەهم
تونە هەیوان کو خوونێ دوخە،
جووجکێ ئەو ل بن سیا
باسکێ خوە دا فرێ دخە.

چقاس هەیوانێ بێ ڕەهم بە،
ڕەهما دلێ وی یا دێ یە،
دییا ئەزیز، بباخشینە،
من جێرباند دلێ تە یێ،
پیر بوون، ڕوویێ قەرمچی،
و پۆرێ سپی ل تە نایێ.

## کلاما بێ نۆتە

ئەز ژ مووزیقێ هز دکم،
بێ وێ ئەز بەدهال و مەستم.
ڕۆژەکێ ژی پڕ فکریم،
من سترا، ئەز پێ سێوریم.
گەلۆ، کلام بێ نۆتە هەنە؟

نا، ئەو یەک قەت ناقومە...
ڕۆژەکێ شەڤ چووم نێچیرێ،
گەریام چیا بانی هەر دەرێ،
وەستیام، ڕوونشتم، هێسا بووم
مەنزەرێ ڤا بەرک مژوول بووم.
من نێچیرڤانی لاپ بیر کر،
خوە ڕا تەبیەتێ مێزە کر.
ئید شەڤ قامێ خوە دەرباز بوو،
من ژ ئەشقا قەت نزانبوو.
من بهیست مووسیقە، نۆتە،
بێ دیریژۆر و بێ هۆستە.
شەڤ، شەڤەکە تاڤەهیڤ،
پەنجێ هیڤێ یە زێر و زیڤ،
ڕاوەشیا ل سەر ئەرد، ئەسمان،
گوند تەر ڕۆ خەملین هەمین.
دوومان دیریژۆریێ دکە،
سورا هەر تشتی ڤەدکە.

کلامێ چەم و کانییا،
دچن بەر ب دەشت و زەڤیا.
ڤێ شەڤا کەرە، کبیر دا،
ڤزینا بائێ سەرێ چیا،
دەنگێ کەو و بلبلا،
خوشینا بەلگێ دارا،
مکینیا پەزکووڤییا
و زووکنیا ڕووڤییا،
و وەژە- وەژا واویکا،

چڤتینیا چووچک، چڤیکا،
کاکینیا قاز و قولنگا،
وەژینیا شێر و پلنگا،
و ئێد دن، هەر کەس جوورێ خوە،
هەڤ تینە سازبەندیا خوە،
تەبیەت ئاشق و سازبەندە،
دستری بێ نۆت و بەندە،
دیریژۆری نە لازمە،
چ بێژی ناڤ وێ دا هەنە،
بەلێ، تەبیەت زۆر ئە، کانە،
شێر، نۆتە گشک ناڤ وێ دا نە...

## تە ئەز سۆتم

ژ هویا تە،
ئەزی مەستم،
و سۆتیمە،
پڕ زێراندی،
بلبلم
ل بێخ جەنگم،
مەجنوونێ
تە گولێ مە.
ب تیرا
ڕۆستەمێ زال،
بریندارم،
جەگەر ژمندی،
سەد مەرتال
چەپەر بن

تالبم
تيرم، لێ مه
هوب تيره، ناترسم، تو باوەر بە،
ژ دەردا نەيارا،
و ئاشقم، نه مژوولم، تێر نابم
ژ هويا يارا.
وان ترێ بەرا ئەشقێ يە،
د خوەنێ دا سۆبەكارم،
ديتنا سييا ئەسمەرا
ئەم دەميندارن، پاتەدارم.
هەر دەما
ئەشقێ مژوولم،
سفەتێ دۆستێ
ببينم،
دەست دا فينجانا
فەرفوور،
دانيە سەر
سنيا سەدەفێ،
چار هەوال
شەراڤا خاسە،
ل ئۆرتێدا
گولێ بينن،
ساقی يە، ئەو
ڕابەر دكە،
گرتييە فينجان
ناڤ كەفێ.

ج نەڤینم
کو نووش نەکم،
ب هەر دو دەستا
وێ فینجانێ.
پانتە نەدم،
ل بەر دەستا،
بێن نەکم
گولا باهارا.
هەرشیە
جەگەرێ نەڤین،
ژ هوبێ و
ژ لێدانێ.
نە مەست دبم
ژ وێ شەراڤێ،
نە تێر دبم
ژ هوبا یارێ!..

## بلبلا من

ئیشەڤ، شەڤ تاڤەهیڤە،
ڕوونشتم، چەڤێ منی ڕێ،
باقێ گولا من چرپاند،
هیڤا تە مە یار کەنگێ بێ؟
هیڤ، ستێرکا ئەرد خەملاند،
دەنگێ دیکێ سبێ دەرتێ،
هال پەژموور، تاقەت ناکم
ئینساف بکە، ژ مال دەرێ؟
باقێ گولا بدە وی،

کی قەدرێ بینێ زانە،
ڕاموسانا بدە وی
کی قەدرێ هویێ زانە!
تمێ لاوکێ کۆتی
هویا کەچێ چێ نزانە،
تو خەلقێ ئینا نەکە،
ئەز گونە مە، پێپەز نەکە.
تو هاتی خاپاندنێ،
ژ هویا من باوەر ناکی؟
هەر گیها، ئەو گول ددن،
ژ هەر مێرا نایێ پاکی.
مەرلێدایی وەریس ترسە،
هەر وەریسەک ئەو مەر نینن،
نالینێم بەرا خوونێ،
چما ژ من باوەر ناکن؟
ئیشەڤ، شەڤا هویێ یە،
هیڤ بلند بوو وەکە ڕما،
سەبرا دلێم بوو زەرداڤ،
تو خەیدی، نزام چما؟
ئەز ئەتیم، هیڤا تە مە،
تو دەرکەڤە سەیرا شەڤا.
بلبل من خەییدی یە،
ڕوو گوهەزتیە، نزام چما؟
ب شەرت، تە هەیە دەستوور،
بکەڤ ناڤا باخێ گولا،
گولێ هویێ بدە هەڤ

خێنجیم هز نەکە تو دلا!
دلێ من سەقەت نەکە
ڕاموسانێ گەرم، شرین،
دمردێتم ژ نالا دلە،
تو دمرکەڤە سەیرا ئەڤین!
ئیرۆ بلبل گازنە،
پەرتاند ئەوێ دلێ من،
وێ هەباندیە یەکی دن،
برن سەبرا دلێ من؟
دمقە ل من بوون شەڤ، ڕۆژ،
ڕۆژێ من بوون سال و زەمان،
ئەز بووم دارا شیلانێ،
دین بووم، کەتمە چۆل و بەستان.
تە بری چا سۆرانی،
تە ئەو کر ناڤا دلێ من،
تە کۆلاند مینا شامەر،
جیوار بوویی ناڤ قەفەسا من.
قیزێ بکر ژ نەزانی
قەول-قرارا باوەر ناکن،
ژ خەداری، نەمەردی،
تە شکێناند شووشا دلێ من!
وان شەڤێ هیڤا جاهل
باهار ب من ڕا نەکەنیا،
شەرمەندە مە، تەنگەزار،
چەتن و دژوار نە ئەڤ قەزیا!
هەموو گول هێشینایە

گولڤەدان وەختێ خوە دا،
فەسلا وێ ئید دەرباز بوو،
ئەشق و هویا من ژی سەر دا...

## سەنەم

پانزدە زڤستان دەرباز بوون،
چەڤێد بەلەک من ژ بیر نەکر،
پانزدە باهارا گول ڤەدان،
قەت تو گولا، دل گەش نەکر.
چما بەختێ مە ل هەڤ نەهات،
من سەنەمێ هەڤ ئوندا کر،
تەهرێ تیرێ د دل دا ما،
سەنەم گولا باخێ کێ یە؟
پانزدەهـ سالێ کو دەرباز بوون،
من گول چنین گەلە باخا،
گولێ ئەتر، گولێ سەدبەلگ،
کو کەوێ بدنە برینێ داخا.
گولیلکا مینا سەنەمێ
نەگهیشتبوو، ل تو باخا.
گولا من پەرڤەریش دکر،
ئیرۆ خەملا باخێ کێ یە؟
چەڤکێد بەلەک و خالا ڕوو
کەتمە کەمینا بورییێ ڕەش،
دلێ من دسۆت لێڤێ شرین،
قەد و قامەت، ئەو دێمێ گەش.
ژ نێچیرا نازەنینا،
سەنەم بوو گولا منە گەش.

گول گهیشت بوو بچرپینم،
ئیرۆ نەخشا باخێ کێ یە؟
چاوا کو شێخێ سەدانی
دۆدا گورج کر مەخسەد و قەسد،
ئووسڤێ ئیبنی یەقووب بوو دیلێ
زوولێیخا پووتپەرەست،
کەتمە کەمانا سەنەمێ
ئەز بوومە قوولەکی بندەست،
ئەو رِهانا مێرگا من بوو،
ئیرۆ گولا بەر بینا کێ یە؟
تیرا سەنەمێ ل من کەتیە،
چاوا نەیار دەست بکوژە،
ژ نێچیرا نازەنینا،
تەک سەنەم دل دسۆژە.
چاوا سیابەند خەجێزەرێ
نێچیر نێچیرڤان بکوژە.
گول ژ مێرگا خەییدی بوو،
ئیرۆ خەملا مالا کێ یە؟
د خوەنێ دا من سەنەم دیت،
رِوە ژ قەفەسێ جودا بوو،
من دەست ئاڤیتە کەمبەرێ
سەنەم هەژیا، ل من تا بوو،
ب لێڤێ نازک ئەز رِاموو‌سام،
ژ من رِا گۆت: – تو تێموور نینی
بینا خەریڤا ژ تە تێ،
بلبلێ باخێ من نینی؟

## ئەسمەر

تو ئەسمە را ناڤا
چیا و بانییا،
هویا من و تە
بەلا بوو هەموو جیا.
تو وەرە ل من
کەرەمەت و ڕەهمێ،
بەلکی دلێ من
ڕەهەت ڤە وێ دەمێ.
ئەز ئاڤدێلیێ بەلەنگازی،
ناڤ زەڤیا،
ئەتیم ئم، سەوییێ
ناڤا سێوییا،
مەسکەنێ من بوویە
قوومستان و بەستە،
ئەز بەنگی مە، قودوومێ
منی سستە.
تو لەوزێ خاشخاشکا
ئال و گەڤەزی،
قەت کێف–هالێ من
ناپرسی؟
ئەز دین نە بوومە،
لێ خەلق من دکەنە،
هەزار ڤر دەرەوا
پەی مە دخینە.
تو خەون چیرۆکی،

شەمدانا منی،
تو ڕۆ، هیڤ، ستەیرک،
شەڤا منە ڕۆژانی.
وەرە دلێم نەدە
بەر کێر، خەنچەرا،
گەل پرتی-پرتی
نەکە، ل وان دەرا...

## خەزال

زولفێ زێرین،
بەنگزێ نارین،
بەژنا ڕهان،
سەدەف دران،
لێڤێ کاخەت،
تلی مەدەت،
کۆفیا زێرین،
کنجێ ڕەنگین،
سوورتێ قەرقاش،
چەڤێ بەراش،
بوریێ قەیتان،
ئەنی مەیدان،
پۆزێ پیژین،
گوهار زێرین،
کەمبەر زیڤە،
خزێم هیڤە،
تو جیا تونە،
قیزا چیا نە،

ملەت کوردە،
رندا گوندە
ناڤ خەزالە،
روهێم بالە...

## سادەتی رندە

خالێ سادە یە دێمێ تە،
چاوا رەوشا باهارا،
پۆرێ پەریشانی بێ شە
ناخەملینە بەژنا یارا
ژ هەر چار رۆزگارێ سالێ،
تو یی کولیلکا باهارا،
پۆرێ بری، هەزنیتییە،
کولی یە رەوشا نیگارا!
کەنێ تە مسلا باهارا،
باهار من را چ لازمە،
شیرە، کاسا شەرافا خاس،
بەرچەڤکێ سووت چ لازمە!
مەعریفەت، ئاقل و کەمال
ب سادەتی تێ کفش کرن،
سۆرە-سبی، چەڤێ کلدای،
خالا چێکری نە لازمن!
تەبیبەت چ دایە خاشە،
بۆنا من بەخت و باهارە،
ئەز نە گازنم، ناخەیدم،
ئەو زۆر نە و هوکومدارە!

میکائیلێ ڕەشید

٢١١ ئیساف: شێر، - ئەر.: سۆڤێت. گرۆخ، ١٩٨٤ - ١٢٠ ڕوو

میکائیلێ ڕەشید، شڤێتا بەرێ، ڤێ بەرهەمۆکا عەفراندنێ خومیە شێرتیدا پەسنێ ژیانێ ددە، تەڤی عەڤدا شا دبە و دپەرتە، دنیا ڕوحێ وانە باتنی بەر مە ڤەدکە، دەرهەقا پرسێ ژیینێ و مرنێ دفکرە، ب خەمێ ڤێ دنیا گرانڤا دژی. ڤێ کتێبێدا هوونێ ب چەعڤێ شاییر دینا خوە بدنە دنیایێ.

نەشیرەتا "سۆڤێتاکان گرۆخ ١٩٨٤

## ڕۆژا وه خێر

### سبه

ئه‌ز خلاس بووم ژ زیندانا شه‌ڤێ،
پێ نوورا سبێ سه‌ر-چه‌عڤێ خوه شووشت،
تاڤ که‌ته مالێ و ڕاست وێ ده‌مێ
قولچێ مالێدا سیبیا پاشن ژی کوشت.

دعه‌واتا حه‌زار ڕه‌نگا بوو ده‌رڤا،
من پێسیرا خوه به‌ر تاڤێ ڤه‌کر،
تاڤێ ڕامووسا سینگێ من قه‌مه‌ر،
و تاڤێ زه‌ریا دلێ من سه‌کر.

ته‌یر و ته‌یره‌دا سلاڤ دانه من،
بینا خوه بۆی من کولیلکا ژی شاند،
و تاڤا ده‌ڤکه‌ن، تاڤا من خانم
گه‌رما خوه یه که‌ژ پێ تیرێنجا چاند.

١٩٧٦

### ڕیا بهارێ

تو دبێژی من: - ده‌ست پێ بوو بهار،
مه‌ها ئاداری ئیدی دگه‌ره،
ئه‌زێ چ ژێکم ڤێ ڕۆژکارا هار،
ئه‌ز هیڤی دکم ژ من ڤه‌گه‌ره.

یەکی دمستەمەل عەورا ددۆشە،
عەرد دخەنقە ژ ئاڤا بارانێ،
بۆی دلێ عەڤدا ئەڤ ڕۆژگار بۆشە
و ژێ قە نایێ بینا بهارێ.

ئاخ، بێ لەگلەگا، بێ چەعڤبەلەکا،
بێ قولنگا و دوومەقەسکێ ژێر
بهارا ئوسا دلا ڤەناکە،
عەرد ناخولقە، نکارە بژی.

ئەز هەرم، ومختا، گازی تاڤێ کم،
بلا بەلا ڤان عەورێ ڕەش بدێ،
بۆی ڕەڤێ تەیرا وێ ڕێ ئەز ڤەکم،
کو دبە خەملا عەزمین و عەرد ێ.

١٩٧٦

## دوومەقەسکێ من

هوون کەنگێ هاتن، دوومەقەسکێ من،
وە کەنگێ بۆی من ئەڤ بهار ئانی؟
خەیسەتێ خوەڕا هوون مانە ئامن،
وە هێلوونا خوە دیسا ور دانی،
ل کو ئەز دژیم.

پێ باسکێ خوە چووک وە چا جەعنماند،
عەورێ سور–سەرمێ، ئەو عەورێ تاری؟
پێ باسکێ خوە چووک، تەیرێ من لەواند،
وە ئانی بۆنا دلێ من حەیری
سلاڤەکە شین.

ڤێ ئێڤارا خوەش ئەز ژ مال دەرتێم
و بهارا وە دپیڤم بێ زار،
دبهێم دەنگێ وە، کو ژ عەزمین تێ،
دینا خوە ددم، حەیران-حژمەکار،
فرینا وە ژیر.

١٩٧٦

## حەتا ئێڤارێ

من پەردە ڤەکر و نوورا سبێ
ژ پەنجەرێ من مینا سێلاڤێ،
کشیبیا ئۆتاخێ و من وێ دەربێ
خوە کر ناڤ وێ سێلاڤێ.

ژ تاریستانا شەڤا خوە بێخەو
دەرکەتم دلشا، کەتم ناڤ عەڤدا،
وانا کووڤی کر ژ من دەرد و خەم،
بۆ من کەنییان کولیلک کۆل و دار.

و نوورا تاڤێ حەتا ئێڤارێ
ب گەرما خوەڤا منرا بوو هەڤال.
ئێڤارە ئیدی و سیا سپنداری
هێدی دەرە بێ گازن و لال.

١٩٧٦

***

بارانێ ئیشەڤ بازارێ من شووشت
و تەمز و تەر، ب هێشنایا گەش
تەسلیمی سبا خوەش و هێنک کر
بەر گریداخا ب هەچێ قەرقاش.

هەو زانی زارە، ب چەعڤێ زەلال
بەر تە دکەنە ڤێ سبا عەدل،
و تو حزمەکار و تو کەر و لال
سۆقاقێ وی دا دگەری بێ کول.

١٩٧٦

## خومام

ڤر سییا عەورەکی کشییا و چوو،
قە جیکی هێنک بۆنا من تونە،
با ژی هێ بەری نیڤرۆ جان دایە،
و کەس نزانە کودا جەعنمی.

تاڤ ڤرا بوویە ئاگر و ئالاڤ،
دقژلینە ڤرا و چۆلا،
نها وێ بەر تە بێ خانێ میراژ
و وێ تە ببە دنیاکە هێشین.

من خومام دایە پشتا خوە، دچم،
و دلێ مندا مرازەک هەیە،
کو پریسکەکە شین و قودرەتی
ڤرا وێ ڤێخە ئالاڤەکە شین.

و بایێ دیسا ڤرا هشییار بن،
و سیێ بکەڤە کۆڤەندێ ب ناز،
و هەرکێ نە ئەز، دبە کورێ من
ڤرڕا بمەشە بن بارێ هێنک.

١٩٧٦

***

ئوسا قەومی، وەکی نشکێڤا
پەردا عەورێ ڕەش منا بوو بەر من،
عەزمانێ تەمز ستەیرا هیڤێڤا
ڕێ ڤەکر بەر ب جهانا بێ بن.

شڤێتا شمێ ستەیر دنقتن
سەر گۆلا زەلال قەراخێ مێشە،
جۆلانگا گۆلێ با دحەژینە،
بۆی ستەیرێ تێدا لووری دبێژە.

خوەڕا ڕوونێیی بەر دەڤێ گۆلێ،
حەیران-حژمەتکار ببهێیی ڤرا
وان پستەپستا و دەنگێ شەڤێ،
کو ڕەحەتییێ تینن بۆی دلا.

١٩٧٦

## ئەو کەنگێ بوو

ئەو کەنگێ بوو
دهات دەنگێ قولنگانە،
ڕەفێ وانا
دچوون بەری-بەریستانا.

با، شڤێتا
هەرمباشییێ سەرێ ڕێ،
دار و کۆلا دشێلینە
و دهێلە ڕووت و تەعزی
بەر سر-سەرمێ.

و هێسترا عەزمانێ سار
نقتی سەر سوورەتێ من.
عەزمانێ من،
تە چما رەش گرێدایە،
چما دگری؟

پێشبەری من
سەقرییە دەشتا مەزن،
بەست ڤیرینا
رەفێ قولنگا هێ دبهێ.

ئەز وێ دەمێ
حەمێز دکم
بەدەنا دارا گێلازێ،
کو لوورییا ڤێ پاییزێ نها دبهێ
و کارێ خوە دکە رازێ.

١٩٧٦

## پاییز

بەق ئیدی نە مانە، لەگلەگ فرینە،
و شەڤ درێژ بوونە مینا حکیاتێ،
پاشلا وان شەڤادا خەو چ شرینە،
هەر قولچەکی مالێ بینا ئێمیش تێ.

بلا هێسابن دەست، پشت بلا راستبن،
حەتا کو عەرد و باغ هشییار بن دیسا،
وەرن مسلەعتکن، وەکی چ خوەستن
هەر ئۆجاخەکێدا هات سێری ئیسال.

بلا سۆبە سۆر بە و ئێڤارێ خوەش،
منا مسلەعتا، درێژبن، عەدل،
برا ژ مە دوور بن، خەم و کولێ ڕەش،
دعەواتا خوە بکن گونددا کەچ و کور.
١٩٧٦

## ڕەجا

وەعدەیە ئیدی، لێ بەرف نابارە،
گەلۆ چ بوویە، فەعم ناکە مەرڤ،
بێ وێ بەرفا چیل دل زارە-زارە،
بێ وێ بەرفا چیل حال نەما، مرم.
کودا فرییە ئەو تەیرێ سپی،
دوورستانادا
ئەو چ چیرۆکا دبێژە نها.
فر-ڤان دەشتێ گەرم و ل عەردێ ڕەش،
تامارێ وانە بینخوەشدا دها
ئوسا سست بوومە، حال کەتمە ئەز،
وەکی من ترێ - توولەکێ ئاوا
وێ لال بالێسە دەست، سوورەتێ من.
و ب چەعڤێ خوە، چەعڤێ خوە توولا
بەر دلێ مندا وێ بێ چا هەڤال،
وێ بێژە: - بنهێر، عەزمیندا نها
عەورێ سپینە، عەورێ بەرفا تە.
لێ باوار ناکم ئەز ژ گلییێ وی.
گەرما دەشتێدا
ئەز دپەرپتم بێ خەو و بێزار،

بیرا وی تەیرێ سپی ئەز دکم،
کو ژترا دبێن- بەرفا چیل-قەرقاش.

عەزمانێ عەورێ بەرفێڤا حەملە،
تو ل ئارانێ
هنە بەرف بدە عەڤدێ ژ چیبا.

١٩٧٦

## بەرف باری

ئیشەڤ باری بەرفا چیلە،
تو هەو زانی کەفا شیرە.

قاتێ بەرفێ قالن-قالن،
بەیتک مانە بێ نان، خارن.

بن بەرفێدا دار دنالن،
دارێ جاهل قەی بێ کالن.

عەورێ سپی هێ گرانن،
عەورێ سپی قە نزانن،

وەکی بەیتک - دەلالێ من
ڕووێ بەرفێدا کارن قربن.

١٩٧٦

## حسرەتا من

ڕابم، هەرم
حسرەتێ خوە تۆیکم، بینم
ژ ئۆتاخا بچووک و تەنگ،

بێ پەنجەرە، بێ تاڤ و ڕەنگ،
ژ وێ حەوشا بچار گۆشە،
کو بۆنا وێ جیکی بۆشە،
ل کو دارا هێژیرێ خار
گەرمێ بۆی مە دبوو ستار.
خوەڕا دلیست زارەکە چووک.

ڕابم هەرم،
حسرەتێ خوە تۆپکم، بینم
ژ وێ کووچا سەلکری، تەنگ،
ل کو هەبوون سپنداری شەنگ،
ژ وی شەهەرێ شەرقیێی کەڤن،
ل کو هەوا خوەشە و نەرم،
ئێ کو گەلیکی مەزندا
دهێنژە باغێ شیندا.
ئۆرتا شەهەرڕا ڕۆ و شەڤ
چەمێ کورێ نەرم دکشە.

ڕابم هەرم
حسرەتێ خوە تۆپکم بینم،
بکمە دلێ وەستیایی،
بژیم دیسا ئەشق و شایی،
ئەشق و شایا زارا بێ فەعم،
ئەشق و شایا دلێ بێ خەم،
بیرکم دەعو و دۆزێ دنێ،
شووندا بینم دەنگێ ئنێ،
کو ئێڤارا گازی منکە،

و کورێ وێ خوەرا ڕازێ
بێ دەرد، بێ خەم، و بێ شکە.

١٩٧٦

## گولانا شل

شەڤ باران دبارە،
ڕۆژ باران دبارە،
شەڤ و ڕۆژ برینا دل دێشە.

و ژ بارانێ ئیدی
عەرد خەنقی، گدی،
ژ عەردێ خێرە عەزمانێ بێ شەرم؟

گیها وەک چۆکا من،
گیها هێ دگهیژە،
باران هێ چیرۆکا دبێژە.

گولانا سەرگدان
خالفی ناڤ عەورا،
بستانێ عەورێ ڕەش دمژە.

شەڤ باران دبارە،
ڕۆژ باران دبارە،
شەڤ و ڕۆژ برینا دل دێشە.

١٩٧٦

## شەڤ کەسری بوو

شەڤ کەسری بوو،
کەسری بوو ژ قیرینا دلا،

وێ ساوێ، وەکی کەتبوو چەعفا،
ژ تەنێتییێ، ژ متالێ ڕەش،
ژ برینا کەڤن، کو ملدا مایە،
ژ شکا بێ بەخت، کو مینا ژەعرێ
ناڤا مەژوودا دنقتە لال،
و نزام ژ چ شەڤ کەسری بوو،
هیڤیا تاڤێ بوو،
قە نە ما ئیلاج.

١٩٧٦

***

ئەز ڕێدا دچم،
هەردو لنگێ من
عەردێڕا، خوەڕا مسلەعت دکن.
گیها و کولیلک،
مووری و کێزک،
کۆکێ بن عەردێ و ئاڤێ زارخوەش
دەرهەڤا سورێ خوەدا دبێژن،
هەردو لنگێ من
خەم-خیالێ وان
دبن دگهینن هەیلۆ دلێ من.

ئەز ڕێدا دچم،
ڕێدا سەرێ من
عەزمانێ سووتڕا مسلەعت دکە.
تەڤ عەزمانێ دوور خوەش-خوەش دکەنە،
لێ عەورێ کۆچەر قەراخا عەزمێ
دکەڤن دلقێ حەزار تشت، کەسا

و من دبنه دنیا وان شکلا،
کو ئەز خەونێدا دبینم جارنا.

ئەز ڕێدا دچم،
سینگ و بەرێ من
وێ ئەشق و شایێ،
وان دەرد و کولا دگهینن تا دل،
ئێد کو دنێدا هەر سەحەت و گاڤ
دخولقن و دمرن هێدی.
چاوا پێل کو خوە کەندالا دخن،
ئەوانا شەڤ-ڕۆ
تێن و دلێ من دکەڤن عەسە،
لێ دل تەڤی وان شا دبە چا زار،
دکەوکرە و دپەرتە لال.

ئەز ڕێدا دچم،
لنگێ من عەردێ نەرم تیمار دکن.
سەری ستەیرارا مسلەعت دکە،
لێ دل گوهێ وی سەر دنیا مە یە
و تەڤی دنێ،
تو کەس نزانە ڕۆژێ چەند جارا،
دمرە و دیسا دخولقە ئەو.

١٩٧٦

## مێرگێ عەزمیندا

مێرگێ عەزمیندا ستەیرک دچێرن،
ئێڤارێ ڤرن،
قەرمبەربانگێ دچن دمرا هان.

و هیف، چا شڤان
هەر سبەکە نوور
کەرێ ستەیرکا ژ وان چێرێ دوور
دبە گوهێرێ.

ئەز شەڤێ بێخەو ژ مالێ دەرتێم،
دێنا خوە ددم عەزمانێ سایی،
و ئەو رۆژێ خوەش بەر چەعڤێ من تێن،
وەختا ئەز مینا بایێ بێ خایی
شەڤ-رۆ چۆلا بووم تەڤی شڤانا،
تەڤی سەیێ وان و کەرییێ وانا.

نیڤێ شەڤێ بە،
تەنێتیا من تەڤی من مایە،
دەنگێ سۆقاق و مەیدانا مرن،
لێ مێرگ چاییرێ عەزمانێ دووردا
ڤێ دەمێ دیسا ستەیرک دچێرن.

١٩٧٦

## دوورڤا عەورا

جارا پێشن دەڤا خوە خست
و بێ تاقەت بەرە - بەرە
گورینا وان سەقری، مر.

باران باری،
نقتکێ وێ
سەر روویێ ئاڤێ،
شڤێتا زارا رەقسین.

وەستییا بووم،
وەستاندنا دل و چەعڤا
بارانێ شووشت و خوەڕا بر.

ئەڤ قورنا مە
هیڤیا بارانانا خوە دژی،
کو خوە بشۆ، حەمامیشکە
وێ قلێرێ،
کو تۆپ بوویە ل ڕوو دنێ
ژ زراڤێ ئادەمێ ڕەش

١٩٧٦

## پاییزا دەرەنگ

عەزمان نمزە و گەورە عەزمان،
و هەوا نەما و نەما عەرد،
بهار و هاڤێن ل کی دەرێ مان
کێ ئانی ڤرا ئەڤ کول و دەرد؟

بەلگ وەشییانە و، چاوا ئێتیم،
تۆپ بوونە سەر هەڤ، بەر هەوا سار،
خلاز بوون تونە بۆی وانا ئێدی
و مانە فەقیر، مانە بێزار.

ڕووت تەعزی بوونە دەشت و باغێ شین،
قەی فرە بوویە دنیا نها،
بینا پاییزا دەرەنگ وێ دژی
دوورستانادا ڤان ڕۆژا دها.

١٩٧٦

## ڕۆژا سالێ یە پێشن

سالەک ژی بوهوری،
سالکێ ژی فتلی تۆیا دنێ،
نزانی شابی تو یانێ بگری
سالکێ ژی فتلی تۆیا دنێ.

چقاس کەن گول ڤەدان سەر دێمێ مە،
چقاس برین ڕەش بوون ژ چەعڤا دوور،
ئیرۆ سالا تەزە مە بوو مێڤان،
بلا ژێ ببارە مراز و نوور.

دنێ دا تا نها مەری بێ مال،
خەریبێ بێ وەتەن، بێ چار هەنە،
بلا دلێم بۆ وان ببە شەمال،
چمکی دلە، وەکی خەمێ دلا زانە.

کێم بوون، یان زێدە بوون خەمێ دنێ؟
کێم بوو یان زێدە بوو ئەشقا دلا؟
نکارم بێیڤم: عەمرێ مە نە درێژ
دبێ چا مێر بژی، نە کو چاوا خولام.

سالەک ژی بوهورێ،
سالکێ ژی فتلی تۆیا دنێ،
نزانی شابی تو یانێ بگری
سالکێ ژی فتلی تۆیا دنێ.

١٩٧٦

***

قراڤێ دانیە سەر عەرد و گیهێ،

قرافێ دانیه سەر بانێ تاما،
ڤێ سبا عەدل هەسپەکە کحێل
هەوا سار ڤرا ڤەدخوە بێخەم
تامار ب تامار.

حیرینا هەسپێ دچە دگهیژە
سەرێ چیایێ دوور، شووندا ڤەدگەرە،
قەنتەر سەر ملا وێ دەمێ قیزک
ئاڤێ دبە مال، لێ دۆرا مالێ
سەیێ وان قافرەش فەسال دگەرە.

دیکەک وێ فری سەر کادینا خار،
چ دیک، تو بێژە - ئاگر و ئالاڤ.
نزانی ژ کو ناڤا هەوا سار
بەلا بوو بینا نانێ گەرم، تەزە،
دلدا لپتی حسرەتا سالا.

نزانم چما، وێ دەمێ ترێ
ژ زارۆتیێ هات بینا وی نانی،
وەختا نە عەمر و نە ژی دنێ
تو پرسێ چەتن نە ددانە مە،
چمکی ئنێ بوو بۆنا مە دنێ.

١٩٧٧-١٩٧٦

## بیرانین

پێخاسە گەدە. دەست و لنگ قلێر.
دێمێ وی کەنە، شڤێتا تاڤێ.
دیسا سیار بوو ئەو شڤێ، چاوا مێر،

و ئاژۆت ناڤا حەریێ، ئاڤێ.

ڕۆ دخەبتە، گەدە دلیزە،
دێ بادلهەوا گازی وی دکە،
مالێ سەر دبە هێکەروونا زەر،
سی درێژ دبن هێدی، کەرە - کەر.

و ڕۆ چوو ئاڤا، پش چیێ ڤا دانی،
دوورڤا ئەو چیە تۆزە، یانێ مژ؟
ئێڤار بەردده گولییێ خوە تاری،
ئێڤار شەدکە پۆرێ هەڤرمش.

ئنێ تەشتێدا زارۆتیێ دشۆ،
ژێ منا دبە قرێژا ڕۆژێ،
(خوەزل دنێ ژی خوە ئوسا بشۆ،
کو ئەم ژی شابن و ڕازی بن ژێ).

ئاوا زارۆتی ناڤ جی - نڤینا
چەعڤێ خوە دگرە، ڕادزێ بێخەم
و ئەو زارۆتی قە هاژ پێ نینە
چڤاس بهایە بۆنا وێ ئەو دەم.

دایێ ڕاست دکە لحێفا گەدە،
ڤاسەکێ جیدا کەر دهێنژە،
و بۆنا گەدە ناڤ هشبوونێدا
چرچرکێ دنێ لووری دبێژن.

ڤێ شەڤێ بێ خەو
زارۆتیا خوەرا من کر مسلەعت.

١٩٧٧

## ل نەخوەشخانێ

کێ یە، ژ کی دمرێ، تەنێ خودێ زانە،
خۆرتە، دارا شینە، باڤێ جاهل،
سڤدەرا سپیدا ئەو باڤ زارەزارە،
زارا وی مرییە – بهارا دل.

بەر دلێ ویدا تێ دێپیرەکە دلخەم،
دوورڤا لێ دنهێرن زارۆ و ژن،
لێ ئەو تەنێ سەرێ خوەیی ڕەبەن دخە،
دگری، دکە گازی: – لاۆ، بەرخکا من.

پەنجەرا مەزنڕا ڕۆ کەتییە هوندور،
ڕەش بوو ڕۆژا ڕۆنک، بۆنا باڤێ دێران،
زارا وی پێشن بوو، جووجکا وی پێشن،
ئەوێ چاوا داینە سەر هێلوونا وێران؟

حەکیمنۆ هوون دبهێن، زار گۆتی نەمرن،
بهارا دلێ مە نەدن بەر بایێ سار،
وەختا زار دمرن، ئەم دمرن ب خوە،
زار گۆتی نەمرن، گونەنە زار.

١٩٧٧

## پاییز جان ددە

ئەز پاییزا دەرەنگ ژی حز دکم،
وەختا بارانا سار درەقسە بێ تەم،
وەختا ڕۆژا مەلوول، ب عەمرێ خوەڤا کن
مە دکە دیل، ئێتیم ئۆتاخێ مەدا گەرم.

و تو تەنێ تەڤی متالێ خوە درێژ
مسلەعتا دەورێ دجوویی کەر و لال،
و دەرڤا رۆژ ئیدی، مینا زارا شیرمژ،
خوەرا دچە ناڤا تاریبانا بێزار.

مالێ تو کەس تونە، دەرڤا شلی شۆیی،
مێڤان نایێن هلبەت، یا تە یە ئەڤ ئێڤار،
و تە ترێ دەرڤا باران بوویە شایر،
- پاییز وێ جان دنە، - دکە گازی، هەوار.

ناخوەزی جی ڕابی، ڤێخی چرا مالێ،
گوهێ تە سەر دەنگێ پاییزێیە نها،
و بەر پەنجەرا تە قەرمتوویێ دارێ
قەی نمێژێ دکە، وەکی زوو بێ بهار.

١٩٧٦ - ١٩٧٧

***

چقاس بەدەوە بەنی ئادەم،
وەختا ئەو تەنێ، بۆی خوە دسترێ،
ئەو قەی بیر دکە وەعدە و دەم،
و دنێ بۆی وی تونە ترێ.

کەس زۆرێ نادە ڤر دلێ وی،
ئەوە گوهدار و دەنگبێژێ خوە.
سەر ڕێ و دربا بۆنا ڕێوی
هەڤال و دۆستە کلاما خوەش.

١٩٧٧

## مەها ئادارێ

ناڤ گەلەک دارێ حەوشا مەزندا
هەر تەنێ دارا بیێ شین ببوو،
ومختا هەر سبە ڕۆیێ پەنج ددا،
دارا بیێ ب بەلگێ شین و چووک
گەرما تیرێنجا زێرین ڤەدخار
و ناڤ دارێ دن، دارێ ڕووت-تەعزی،
کو بهارێڤا حەملبوون بێزار،
ب بەژنا خوە شین دکرە گازی.
باران دباری، دیسا ڤەدکر،
جارنا ئێڤارا با جنا دکەت،
دارا بیێ شین خوەڕا سە دکر
دلدا حوبا شین، زمندادا - تاقەت.

سبەکێ دەوسا تیرێنجا زێرین
سەر کوچکێ شین بەرفا چیل باری،
و ب کولا دل تو لێ دنهێری،
تو بێ تاقەتی، تو چ دکاری.
و بەرف دبارە، بەرفا ئادارێ
سەر بەدەوییا نازک و هێشین.
ئیرۆ مەلوول بوون نەفەرێ مالێ،
تە چ کر، چ کر، ئادارا دین؟

١٩٧٧

***

بلا شەڤ بێ،
و شەڤ بۆنا وەستاندنێ،

بێ حس، بێ دەنگ،
بلا داینە جی-نڤینا.
ڕابە تو ژی خوە درێژکە
و چەعڤێ خوە بگرە هێدی
و ببهێ وێ هشبوونا تیر،
کو وێ دەمێ
دەرڤا، مینا کەچا پێخاس،
نەرم دگەرە
دل دا حەزار سور و خییال.

وەستاندنا هەردو لنگا
بار نیبوویە بۆنا دلا،
وەستاندنا هەردو لنگا
دەرباز دبە،
لێ وەی ل وی،
کێ کو ب دل، ڕوحێ خوەڤا
ئاجز بوویە ژ ڤی عەمری،
تو جی-نڤین
توجار کۆمەکێ نادن وی.

شەڤێ بۆی تە
ئیدا دانییە جی-نڤین،
خوەڕا ڕازێ مینا هەرجار،
بلا نەرم بە بۆی تە بەلگی،
سبێ بۆی تە خەبات هەیە،
و ڕێ هەیە بۆی تە سبێ.

***

و من کوچکێ بیرانینێ خوه
ئیرۆ ژی دادا.
و شەڤا ئیشەڤ، مینا من بێخەو،
سەر بەلگی پال دا.
نزانم چما تلبیسا خومام،
کورا خەرقی،
دەڤەکی مەلوول، بێ زار و زمان،
ب سیبیا تەرکی
هاتن بیرا من.

وی چاخی وەعدە بۆنا مە-زارا،
ب مەشا دەڤێ
هێدی و بێ لەز دکشییا و دچوو،
و وەعدە تمێ
تێرا مە دکر،
کو ئەم ئیشێ خوە زارۆتیێ بکن.

ئەز بەر کوچکێ بیرانینێ خوە
نافا متالا
پرسێ ددم خوە ڤێ شەڤا بێ خەو،
کو چاوا سالا
قیمەتێ وەعدە بۆی مە بها کر،
ئەو چ کو بەرێ
بۆی مە ئارزان بوو، تێرا مە دکر،
نها بەر دەرێ
پاییزا رەنگین، زڤستانا مە

تێرا مە ناکە،
کو ئەم شوخلێ خوە - مێرا بکن.

١٩٧٥-١٩٧٧

***

وەختا پشئ سەر پشتێ ڤەدلەزە،
کورێ من پێرا - پێرا دپرسە:
- باڤۆ جان، دیسا دلێ تە دێشە؟
ئاخر سبێ وێ باران ببارە.
ڕاستی ژی دلێ من ڕەبەن دێشە،
ڕاستی ژی سبێ باران دبارە،
وەختا پشئ سەر پشتێ ڤەدلەزە.

١٩٧٧

## ڕیا عەمر

بەربانگا سبێ گیها هێ تەرە،
و ئەزێ وەکە کیلۆمێترەکێ
لنگێ خوە بشۆم ناڤا گیهێدا،
هەرم بگهیژم ڕیا ڤەراخێ گوند،
هەرم بگهیژم ڕێ و بنهێرم،
کو چاوا دنیا مە هشیار بوویی
وێ دەما شرین ڕێرا تێ دچە.
بن لنگێ عەڤدا، بن تەکەرا دا
خەوا هنگۆری ڕێ هشیار دبە
و کلامێ ڤێ ڕۆژا نوهـ دبهێ،
کو دنیا دژی و دخەبتە.
و سووراڤێلکەک عەزمانێ سایی
ئوسا بلند کو ئانجاخ تێ خانێ،

پەسنێ ڤێ سبێ و عەمر ددە.

لێ ئێڤارێ گوند ژ دەشت و باغا
ڤەدگەرە و تێ ئۆتاخێ ڤالا،
چەعڤێ پەنجەرا ئیشق درژە،
لێ ئۆتاخا دا دیوار کەر و لال،
کو بیرا خومیێ مالێ دکرن،
ب دل دخومزن حەمێز کن وانا.

ئێڤارا هێنک ڕێ ئاجز بوویە،
دێنا خوە ددە ل عەزمانێ دوور،
دفکرە کو ڕێیێ عەزمیندا
ئیدی ستەیر نها خوەڕا تێن دچن.
دێمەک جهان ژی،
دحەژە، دژی
و ناسەکنە عەمر تو دمقا.

١٩٧٧

***

ئیرۆ تاڤ چ ڕمە،
دار کر خومیا سیێ،
دارێ ژی سی دا من،
و نها ڤێ گەرمێ
ئەز، ڕێویێ ڕۆژێ،
تی و وەستایی،
هێسا دبم ڤرا
بن سیبیا دارا مەزن،

کو تاڤێ دا دارێ،
دارێ ژی دایە من.

١٩٧٧

## ناسێ سالا

نزام ژ کێ و کو
ئەوی بهیستبوو،
وەکی نەخوەشم ئەز.
و ژ گوندێ خوە دوور
ئەو هاتبوو شەهەر
و ئانیبوو بۆی من
هنگڤێ زێر و زەر.
نە هەقێ خوە هلدا،
نە ژی نان خوەر پاکی:
- بباخشینە، برا،
مۆز مانە بێ خوەیی،
ڤەخوەر شەلبکە ئاڤ،
لێدا چوو گوندێ خوە،
نە برا بوو، نە باڤ،
ناسێ سالا بوو ئەو.

١٩٧٧

## ئینفارکت

کشک ڤەلەزیانە ڤرا سەر پشتێ
و ئیزن تونە ژ جی بلەقن،
دەربا خەدارە بۆی وان لەقاندن،
چکن، دەستێ وان قە تو تشتەک تێ؟

ڕێنگا وان دچوو دنیا ڕەش، تاری،
ژ وێ ڕێ ئەوان شووندا ئانینە،
ژ من نەپرسن ئەوانا کێ نە،
گولێ ئینفارکتێ سەر واندا بارین.

سبا ڕادبوون و : – سبا تە خێر.
خێر و خوەشییێ هەڤڕا دخوەزن،
پاشێ سەر پشتێ ئەو زارێ مەزن
لال تەعشتێ دخون ب دەستێ خەلقێ.

ئێزار کێف – حالێ هەڤدو دپرسن،
– شکر باشم ئەز، شەڤ ڕند دەرباز بوو،
لێ شەڤ ئێشێ دل قاییم گرتبوو
و بەرنەددا ژ چەنگێ هەسن.

لێ شەڤ هنەک ما ئەو تا بقەتە،
کو ڕیا عەمر بوو بۆی وی دنێدا،
لێ شەڤ حەکیمێ ناڤ خوودانێدا
دەفا سینگێ وی مزددا بێ زار،
کو دل نەدە دەر.

سبە ڕۆن دبە، هەڤ سلاڤ دکن،
دل ددن هەڤدو، دخاپینن هەڤ:
– شکر باشم ئەز، ڕند ڕازام ئیشەڤ.
تو شکیات، گازن. جابێ وان یەکن.
ئەوانا زانن بهایێ عەمر،
هەڤ دهێڤشینن.

١٩٧٧

## مقامێ هز دکم

نەهیشتن ئەز ببهێم مقامێ باغ،
(گۆتن: - پاشدا مایی ژ ڕۆژێ مە).
من ژی قارەقارا سترانێن وان ئانجاخ
سەرێ خوە خلاز کر، هاتمە جەم وە.

ئەز هاتمە جەم وە، چرچرکێ من دەلال،
(زانم هوون نە باغن، نە ژی هێندێل)،
بۆنا سەرێ ئاجز مقامێ وە زەلال
مەلهەمە ناڤ گورین-گرمینا نە ب خێر.

ناڤ سترانا وەدا ئەز هشبوونێ دبهێم،
هشبوونێ ڤەدوخوم ڤێ ئێڤارا مەخمەر،
ئەز دترسم بۆی وە، دبە کو ڕۆژەک بێ،
هوونێ ژی برەڤن ژ ڤێ دنیا مە کەر.

١٩٧٧

## ژ سووکێ

مەرڤەک ژ سووکێ دچە مال،
دەستێ ویدا چەلتەکی تژی،
مەرڤەک ژ سووکێ دچە مال
و دۆرا لەعدەکێ خوەش دژی.

چەلتە دا بینا باغ - بۆستانا
و بینا خوەلیێ دبە مال،
هێدیکا ناڤ خەم و متالا،
مەرڤەک ژ سووکێ دچە مال.

مالێ ژنه، مالێ زارێ مەزن،
چقاس چوو بوهورین مەهـ و سال،
من ترێ وێ کافێ ب گازن
باڤێ من ژ سووکێ دچه مال.

١٩٧٧

## لنگ

چقاس هێدی دچن،
چقاس پنتی دچن،
چقاس سڤک دچن،
چقاس هوورک دچن،
چقاس گران دچن،
چقاس دژوار دچن،
چقاس فەسال دچن،
چقاس بێزار دچن.

و تێ بێژی، برا،
لنگن، تێن و دچن،
لێ سەر لنگا ڤرا
دنیانه تێن–دچن.
کاری بێژی کێ نه؟
خومیێ مەشێ ئوسا؟
تو بنهێره دیسا،
دبه بێژی کێ نه؟

## تاڤا من

و شەڤ شڤێتا عەرمبێ زەنگی،
شکەڤتا تاریدا سەرێ خوە دانی،
پش چیبێ هلات تاڤا من بەنگی
و ئەز رامووسام سەر بانێ خانی.

و ئەڤ رۆژا من ب تاڤێ ڤەبوو،
و دل تژی بوو ب تاڤا شیرن،
لەما ژی وەختا دچم ناڤ عەڤدا،
ئەز دلدا گەرما وێ تاڤێ تینم.

١٩٧٧

***

ڤان دارێ پاییزێ
دیسا ڤێخستنە کوچکێ خوە.
شەڤ بارانا دزێ
و ژ باغا هێ تێ بینەکە خوەش.

سبا مژ و دوومان
ناڤا دار و کۆلا نەرم دچێرن،
پاشێ رۆ چا شڤان،
کەریێ مژێ دبە ئاخلێ ژۆرین.

رێ بەتالن دها،
ب گومانا سالا وێ بێ دژین.
ئەم رێکەڤن نها،
رێ مە دبن مالێ تێر و تژی.

١٩٧٧

## سێ ڕۆژا باران باری

سێ ڕۆژا پەی هەڤ باران دباری،
و دەرڤا نەما تو جکی زها،
و شەهەر خوە کر ڕەنگەکی تاری،
عەورێ سەر شەهەر نمز بوون دها.

نەمایا ناڤا عەرد و عەزماندا
کەتە هەستوونگێ بەنی ئادەما،
بوو زارە-زارا هەستوونگا ئیدا،
و شەڤ بۆ خەوێ تو ستار نەما.

سێ ڕۆژا پەی هەڤ باران دباری،
لێ ڕۆژا چارا
تاڤێ خوە گیهاند عەردێ شل، تاری،
و عەزمانێ سووت
چەعڤێ خوە ڤەکر شڤێتا زارا.

هەو زانی خەون بوو ئەو سێ ڕۆژێ شل،
و دلێ تەدا عەیدا تاڤێ یە،
هەستوونگێ فەقیر چڤاس ژی بێشن،
لنگ ناسترن، هەڤالێ ڕێنە.

١٩٧٧

## ئێڤارا متالا

ئێڤارێ تەنێ مالێ بمینە
و تارییێدا تو خوەڕا ڕوونێ،
و بلا ئێڤار بۆنا تە بینە
دەڤێ هشبوونێ، دەمێ دینجبوونێ.

بلا منا بن خەمێ چووک-مەزن
و تە خلازکن قەید-چیدارێ خوە،
بلا دلێ تە قە نەکە گازن،
بلا ئەو ببهێ کلامەکە خوەش.

تە ترێ کەتی جنەتا زێندی،
خوەرا پال ددی تو سەر تەختێ نەرم،
نزانی ژ کو وێ دەمێ هێدی
عەورێ متالا تۆپ دبن بێ شەرم.

گۆڤەکا دنێ مەژوویێ تەدا
لەز دفتلە وێ دەما عەدل،
خەم هشیار دبن و مینا هەداد
قەید - چیدار دکن دەمێ خوەش بێ دل.

دەرڤا ئێڤارا نازک دگەرە،
بینا گیهایێ درووتی وێ تێ،
چا باوەرکی، کو جیکی هێ شەرە،
و خوون درژە ڤێ دەمێ عەردێ.

١٩٧٧

## خوەستن

خوەستن بێ حەدن و بێ حەسابن،
خوەستنەک هەلا تەزە تێ سێری،
حەزارێ دنێ
دل-مەژوویادا وێ دخولقن،
گەلۆ، کیژانێ تو بینی سێری؟
بەر ئۆردییا وان هنەک دمینە

تو جنا کەڤی،
لێ مەرف دژی، جنا ناکەڤە،
ئەو سایا خوەستن و خیالێ خوە
دها تام دبە.
رێنگا خوەستن و خییالێ بلند
وی دبە هەیلۆ جهانا بێ بن،
و بۆی خوەستنا تونەنە حدوود.

١٩٧٧

## ئێرێڤانێ دا پاییزە

ماسیس حەتا لنگا ئیدی
خوەکرییە کورکێ بەرفێ،
بایێ ئەلەگەزێ هێنک
بوویە جەعنما سور-سەرمێ.
ژەنگا پاییزێ گرتییە
ل ڤان کۆلێ بەر دەڤێ رێ.
وەختا کو با مقامێ خوە
دبە باغ و باغچێ سەیرێ،
بەلگێ دارایە حەزار رەنگ
تێن دکەڤن ناڤ گۆڤەندێ.
مەرڤەکی تەنێ بێغدا
رەنگێ پاییزێ تۆپ دکە،
کو ژ دارا نقتینە،
خوەرا دکە باقێ بەلگا.
دنێ بەر من تەعزی دبە،
خالی دبن باغ و باغچە،
و باغ و باغچێ ڤالادا،

چاوا خیال و چاوا خەون،
ڕوحێ پاییزێ دگەرە،
ڕوحێ پاییزا پرەمەک.

ئێریڤانا من دەلالدا
ئیدی پاییزا دەرمنگە.

## متالا ئێڤارێ

ئێڤار دکەڤە ناڤا متالا
چاوا دەرباز کر ڕۆژا خوە درێژ؟
عەردێ دالیسن سیێ دارا، مالا،
هشبوون وێ دەمێ ڤەی بوویە نمێژ.

و ئێڤار هێدی دکەڤە مالا
و پێ لێڤا خوە، هێنک و نازک،
رادمووسە دێمێ کەسری و گەرم،
دەستێ خەباتکار، کو ناکن گازن.

پاشێ ڤەدوخە ستەیرێ چووک، مەزن،
پش چیێ هیڤێ دەردخە، تینە،
بلبل کۆلادا ئەو چ دخوونە؟
هەو زانی دنێ ئالەم هاڤینە.

ڕۆژا وێ دیسا خێر بوو، بەرەکەت،
ڕێ ژ بارێ خوە عەدل ڕازینە،
و دۆرگەرەک ژی جهانێ ڕێکەت،
کو بەعسا خێرێ عەڤدا ڕا بینە.

ناڤ متالا دا ئێڤار دگەرە،
و متالێ وێ عەدلن و گەش،

و ئەو ئیشەڤ ژی ڕەحەت دکارە
ڕازێ بن سەوتێ چرچرکێ زارخوەش.

١٩٧٧

## دەنگێ باڤێ من

دەنگبێژ، ماشۆقێ کلام سترانێ
باڤێ من ڕەبەن بۆی من ساز کری،
کو ڕۆکێ ئەو ساز شابە، یان بگری
بن دەستێ کوردا. کا ئەو بەخت کانێ؟

ئەز نە بووم سازبەند، زۆرێ تشت نابە،
ئەز مام ماشۆقێ دەنگێ باڤێ خوە،
و سترانا وی خووت ڤێ دەما خوەش
وەک بەرێ ل من تەسەلە دبە.

و تێن دسەنن بەر چەعڤا دیسا
چەندک مەم و زین، سیابەند، خەجێ،
وەردێ و وەتێ دایکێ لاوێ چێ،
کو خێر نەدیتن دنیا بێ ئیساف.

من ترێ، ژ قورنێ قەدیمی و دوور،
دەنگێ باڤۆ تێ و دگهیژە من،
و ب دەنگێ وی خەلقێ نەمر
ڤەدکە بەر مە دلێ مەرد و نوور.

گشک نینن، وەکی دبن دەنگبێژ،
لێ هەر کەس گۆتی گوهدار بە عەسە،
کو دەنگ و بینا جماعەتێ کەسە
دلا ڕا هەرە سەر ڕیا خوە درێژ.

١٩٧٧

## ئەز چ دخوەزم؟

دخوەزم، وەكى ڤە نا هنەكى
دلێ خوەدا تو زارا بەرێ بى
و دەرێ مالا دايكا خوە ڤەكى،
ئاخر چەعڤێ وێ ڕيا تە قەڕمى.

بۆنا لاوێ خوە دايێ وێ ديسا
خوەرنا، كو تە حزدكر، چێكە،
وێ بێژە، وكى خرابا، پيسا
تو خوە دوور بگرە. تو گورا وێ كە.

دايێ وێ ڕوونێ تەڕا خەبەردە،
دل دا وێ شابە بۆنا لاوێ خوە،
و ئەوێ بيركە كو دلى دەردە،
و ئەوێ بيركە شەڤێ خوە بێخەو.

جى نڤينێ تە وێ داينە ئنێ،
و پێ دەستێ خوە لنگێ تە مزدە،
و وێ دەما خوەش ڤەى بێژى دنێ
دانە دايكا تە و دنێ مەردە.

ئەوێ شەڤ ڕابە پێخاس و ڤەسال
ڕاستكە لحێڤا تە يە شمتى،
وێ بێنە بيرێ ئەو ڕۆژ و ئەو سال،
دەما كور دەرڤا دهات جەمدى.

لێ تو هەر تەنێ پەرا دشينى،
پێ پەرا ناكرى تو دلێ ئنێ،

و هەرکە مەلا بێئیساف نینی،
هەرە جەم ئنێ، هەرە جەم ئنێ،
تویی بۆنا وێ ژیین و دنێ.

١٩٧٧

## مالێ

ئاڤ ما ئاڤدانگێدا،
کەسی ڤەنەخوەر ئاڤ،
سەقری دەنگێ تە،
تەمری ئار – ئالاڤ.

تۆزا وەعدە دانی
سەر هوورمووریێ مالێ،
و پش مالێ کانی
مەلوول بوو وێ سالێ.

کەتن سێڤێ دارێ
و ناڤ گیهێدا مان،
حەتا دەر بهارێ
تو جاب و تو گومان.

لێ تو شووندا هاتی،
ڕوح هاتە بەر مالێ،
دیسا ڕەنگێ شادی
برقین ناڤ مالێ.

و بینا تە ڤەبوو،
گەرم بوو دلێ ئێتیم،

چ کو بۆی ته کێم بوو،
ته عەردێ خوەدا دیت.

هەره دنێ بگەر،
دنێ خوەشه هەمن،
لێ بێ مالبی هەگەر،
تێ بێژی: - وەی ل من.

١٩٧٧

***

وەختا رۆ هلات،
من ترێ جێر بوو کو ژۆرێ شکەست
و ئیشقا خوه رێته سەر دنێ،
دنێ وێ دەمێ خوه ئیشقێدا،
حەمیش بوو ژ تاریێا شەڤێ،
هێشنایا زمرووت هشیار بوو خەوێ،
برقی ناڤا تیرێنجێ تاڤێ.

هەرکێ قەومی، کو دەرکەڤی رێ،
تو بسەنه تا بەربانگا سبێ،
وەختا رۆ، چا جێر، عەزمیندا دشکێ
و ئیشقا خوه درێژه عەرد ێ،
تو ناڤ ئیشقا بکردا عەسه
خوه حەمیشکه ژ تاریێا شەڤێ،
پاشێ رێکەڤه.

١٩٧٨

## ٤ ئێ یانڤارێ سالا ١٩٧٨ ئا

ئیرۆ سبێدا باران دباره،
بەرف زوو دحەلە، تشت نەما دها،
و دارا ترێ ئیدی بهاره،
لێ لێنە شین بن ژ ئەشقێ نها.

جەو کووچا دشۆن، دکشن بێ خەم
و خوەرا دبن قرێژا شەهەر،
خەوێ ڕابوویە و هێرس بوویە چەم،
و دلەرزن وێ دەمێ کەنەر.

تو لەز نەکەڤە و باوەر نەکە،
کو زڤستانێ بهارێ ڤەبە،
بارانە باری، دبە حەنەکە،
یانێ تەلەکە، ئوسا ژی دبە.

باران تە خوەش تێ؟ خوەرا بگەره،
یانێ پەنجەرێ مالا خوە ڤەکە،
و باران بلا بسترێ تەرا،
لێ ڕۆژا سبێ توجار بیر نەکە.

هەر تشت دنێدا وەختێدا باشە.

١٩٧٨

## دقەومە

دقەومە، بەلێ.
وەکی تو نزانی کودا دچی،
و لنگ دبژێرن بۆنا تە رێ،

و لنگ دبژێرن بۆنا ته وار و جی،
و تو دچی.

تو حشێ خوه توجار نەدە لنگا،
لنگ دکارن دنێ، ئالەمێ بپیڤن،
تە بن بال حەزار ڕەنگا، دەنگا،
لێ ئوسا ژی دنێ تو نابینی،
تو حشێ خوه نەدە لنگا.

١٩٧٨

## کورێ من نەخوەش ئە

کورێ من بچووک گەلە بەدحالە،
دەنگێ خوه ناکە،
نابێژە، وەکی ژێرا دژوارە،
و تەنێ چەعڤێ مەلوول دبێژن،
وەکی بۆنا وی چقاس گرانە.
ئەز هەردو دەستێ وی چووک ڕادمووسم،
ڕادمووسم عەنیا وی سپیچۆلکی
و ژێ دپرسم:
– چاوانی، لاۆ...
– تو زانی، باڤۆ،
هنکی نەخوەش بووم،
لێ نها باشم.
زانم گلیێ وی ڤر و دەرەون،
لێ ئوسا دبێ،
کو مەلوول نەبم،
بەر خوه نەکەڤم.

١٩٦٩-١٩٧٨

# ئنێ

کلاما ب دل دنێدا ئەوە،
کو بەر جۆلانێ ئنێ سترایە،
نانێ هەری تەعم دنێدا ئەوە،
کو ئنێ پەعتیا، گەرمەگەرم دایە.

دایکا خەلقێرا بۆی خاترێ دیا خوە
-دایێ، - دبێژی ب حورمەت و دل،
دایکا خەریب ژی بۆنا کورێ خوە،
تەرا دبێژە : - لاو، چارا من...

گەرمێدا نەخوەش دکی نالەنال،
و بەر چەعفێ تە رەش دبە دنێ،
وێ دەمێ گران دکێ گالەگال،
ناڤێ دێ ددی: - ئنێ جان، ئنێ...

زوودا خوەی مالی، خوەی زاری و مێر،
دایکا تە پیردا قە نەما تو حال،
و تو، مێرێ خورت ڕۆژا ئۆغرمێ
دچی بال ئنێ، دچی چاوا زار.

تمێ هەر دمرا سەر ڕێنگێ دنێ،
سەر بەرێ بێ بن، سووتا عەزمیندا،
چاوا زیبارمت، خەبەرا "ئنێ"
دژی، دکوتە ناڤا دلادا.

١٩٧٨

## تو ژی، دلێ من

ئەم تێنە دنێ ب ڕوحێ خوەڤا،
شڤێتا بەرفێ، تەمز، بێقوسوور،
لێ حەزار قرێژ تێ مە دکەڤە
و تەمزایا مە منا دبە زوو.

بەرف قرێژ دبە ناڤ پاشلا ڕۆژا،
لێ دبە ستار بۆی خەوا عەردێ،
وەختا ڕۆکێ ژی عەجەلێ وێ تێ،
دکەڤە عەردێ بۆی ڕۆژا دژوار.

عەردێدا دیسا ئەو تەمز دبە
و ژێر ڤا دیسا دەرتێ ڕوو دنێ،
پێرا شا دبن هەر دەرا ڕوحبەر،
ڕازیبوونا خوە ب دل ددنێ.

تو ژی، دلێ من، شڤێتا بەرفێ،
قرێژا دنێ توجار نەترسە،
تا ل دنێیی، چ دەستێ تە تێ
بدە مەرڤا، دنیایێ، عەردێ،
دەرهەقا هەقێ خوەدا نەپرسە.

١٩٧٨

## ب خوە دبی زار

وەختا دخوەزم قاسەکێ بێقەلپ
بۆنا دلێ خوە ژ ئادەم سەکم،
ئەز دەرێ دنیا زارا ڤەدکم
و دسەنم بەر چەعڤێ وان بێتەلپ.

زارۆ ناترسن، کو بۆی گلیبێ خوه
وێ جابێ بدن بەر عەڤدێ مایین،
تو ژی تەڤی وان "سەودەسەر و دین"
دلیزی بێ خەم، دکەنی خوەش-خوەش.

چ ناڤ دلانە، سەر زارە ڤرا،
ناترسی فەنا و جەزێ نەهەق،
بیر دکی وەکی هەنە دەعو، فەلەک،
ژهنگا کو ژێرا دبێن: کار زرار.

قەی تەمز دبی ناڤا زارا تو،
ب خوە دبی زار، بێ قەلپ، مینا وان،
و دها سووتە بۆنا تە عەزمان،
تو و ئەوانا فەعم دکن هەڤدو.

۱۹۷۸

## تاڤێ دفرۆشن

وەرن چارسووێ، هوون پۆشمان نابن،
ڤرا ل عەرد ێ، سەر دەغلێ درێژ،
ناڤ ئوجرا، تێرا، ناڤ هیزێ بێ بن،
ناڤ قالمەقالما سەودەسەر و گێژ
تاڤێ دفرۆشن.

دفرۆشن بین و بوغزا پاییزێ،
دفرۆشن تەعما تاڤێیە شیرن،
ڤرا گۆڤەندا رەنگا دلیزە،
دەستێ زارادا تری دگری.

ژ کەڤچی ئاوا شرکا هنگڤ
وەک پەنجێ تاڤێ ژۆردا تێ خارێ،
مۆز سەر ترییا دکن گڤەگڤ
و تەرکینە لێڤێ هنارێ.

تاڤا گەش عەزمین دێنا خوە ددە
ئەولەدی حەزار تەعمی و ڕەنگی،
شا دبە، وەکی ئەڤ دنیا ڕندە،
خوەش-خوەش دکەنە ب دل و بەنگی.

بێن بوغزا تاڤێ ناڤا چەلتەدا
دچە و دەرێ مالا ڤەدکە،
و شەڤێ هنەک تاڤ وان مالادا
دعەواتا بێن و بوغزا دکە.

١٩٧٨

## سبە سافی دبە

پەنجەرێ حەوشێ، چەعڤێ خوە ڤەکن،
وێ ساف دبە سبا جان - جوان،
گوپک سەر چقێ دارا دتەقن،
و ئالاڤا شین دپەکە ژ وان.

بینا دنیایێ تەمزە هەلا،
سبە هێ خوەشە، هێنک ڤێ دەمێ،
بەسە خوە حەبسکن هوون ناڤا مالا
و بەسە ببهێن چیرۆکێ شەڤێ.

هێنکە سبە، هنەکی سارە،
لەزەتێ هلدن هوون ڤێ دەما خوەش،

دنێ ڤێ دەمێ هەلا بێ زارە،
ڤێ بێزارتییێ هلدن بۆنا خوە.

قورنا بیستی یە، دەورەکە بێ خەو،
گورین گرمینە سەر ڕێنگا دنێ،
ڤەخون هشبوونا دەما سبێ خوەش،
ڤێ چێتر تونە تشتەکی دنێ.

١٩٧٨

## خەیسەت

ئیدی جان ددە مەها ئادارێ
ب هەوا سار ڤا، ب بارانێ ڤا،
و سەرما دکن بەلگێ سەر دارێ،
عەور گرانن، مەلوولە ئێڤار.

دوهـ تاڤ بوو، جنەت، حکیاتا ڕەنگا،
گیهێ قول دکر ئاسفالاتا ڕەخ ڕێ،
تە ئاڤ ڤەدخوەر ئیدی ب چەنگا،
تە بیر کربوو دەرهەقا سەرمێ.

لێ ئیرۆ، ئیرۆ چ کاری بێژی:
مەرییێ بێ ئیتبار چقاس خوە خوەش کە،
ئاخرییێ مینا گەدەکی خشیم،
وێ خەیسەتێ خوە خراب نیشانکە.

ئیدی جان ددە مەها ئادارێ.

١٩٧٨

## یەکێ نیسانێ

ئیرۆ ڕۆژ - ڕۆژا خاپاندنێ یە،
مقابل نینن هنەک بکەنن،
حەنەکا بکن ل ڕوو دنێ یە،
خلازکن دلا ژ خەمێ کەڤر.

شابە، بکەنە، دلکەڤر نینی،
لێ توجار نەبە شڤانێ بێ حش،
عەمر نکاری تو بخاپینی،
دارا مرازا نەکە دارا حشک.

١٩٧٨

## پاییزا خوەدا

ئەز پاییزا خوەدا ئیرۆ
خەونێ بهارێ دبینم،
دبهێم کلامێ بهارێ.

ڤێ کووچێڕا زەریک دچە،
مەش سڤکە، بێخەمە مەش،
ئەز کەنێ وێ زنگین و خوەش
دلێ خوەدا دبهێم نها،
دل دلەقە ژ کەنێ وێ.

دەما بێرەعم، بەر جێنیکا
دەفێ سپی زێدە دکە،
لێ دل ئاوا ناڤ کولێڕا،
شەڤا بێزار و بێ خەوڕا،
ناڤا ڕۆژێ نەم و شلڕا،

خەبەر ددە
چەعڤێ عەزمینی زەلالرا.

پاییزا من دکە خشین –
ڕۆکێ تاڤە، ڕۆکێ باران،
لێ دل مینا بەرێ دژی،
و شا دبە مینا زارا،
لەما پاییزا خوەدا ئەز
خەونێ بهارێ دبینم،
دبهێم کلامێ بهارێ.

١٩٧٨

## وەتەن

ئەم زەعفن – بچووک و مەزن
ئەم زەعفن ڕووبارێ دنێ،
تو یەکی و ئەم دخوەزن
تو خوەش بی، شڤێتا ئنێ.

دێ دێ یە و تو مینا دێ،
شرینی بۆنا ئەولەدا،
زۆرێ ژی ببنە جنەتێ،
هەر تو یی دلێ مە گشکادا.

تو یەکی بۆی مە، چا عەمر،
تو خوەشی و ئەم ژی خوەشن،
ئەو ئەولەد، کێ ژ تە دوور دمر،
دگۆت : – ئەز چقاسی بەخترەشم.

پاشلا ته بۆنا مه گەرمه،
خوەلیيا ته سڤکه سەر مه.

١٩٧٨

## مقامێ بارانێ

ژ عەزمین مقاما بارانێ دباره،
بن وێ مقامێ دا عەرد خوه دشۆ،
دنیا هشیار دبه، سبه یه، بهاره،
و بینا بهارێ گرتیه ژێر و ژۆر.

بیێ گولیێ خوه درێژ بەردایه سەر ئاڤێ،
پێ شەیێ بارانێ پۆرێ خوه شه دکه،
و عەزمان گەش دبه ژ ئیشقا تاڤێ،
وا یه، هندک مایه و بارانێ ڤەکه.

لێ ئەز هەلا دبهێم ڤێ مقاما شرین،
ئەو مقام یانێ جاهلتیا منه تەر،
کو دباره ئوسا ب دل و ب ئەڤین
سەر ڤی عەردێ عەزیز، عەردێ حەمله و نەرم.

١٩٧٨

## بەلگ خەبەر ددن

ئەم گشک بهارێ خولقین،
ومختا مه چەعڤێ خوه ڤەکر،
مه دیت عەزمانەکی هێشین
و عەزمیندا تاڤا شرین.
دنێ خوەش بوو،
ئەم ڕادبوون،

مه گەزۆیَ تاڤیَ دخوەر،
پاشیَ هەڤڕا قسه دکر
دەرهەقا ڤیَ دنیا مەدا
و ژیینیَ،
حوبا ئۆرتا مه و تاڤیَ،
ئۆرتا مه و عەردیَ دیَدا.

ئەم ئەولەدیَ تاڤا گەرم بوون
و عەردیَ ڕەحم.
ژ حویا وان
ناڤ سیا مەدا خولقین بەر
عەجیَبا ڤیَ دنیا شرین،
و چقاس ژی کو ئەم بیَژن،
ئەم بیر ناکن،
ڤیَ عەجیَبا پاشلا خوە دا.

مه مسلەعت دکر هەڤڕا
حەتا تاری دکەت عەردیَ،
ئەم ڕادزان،
خەونیَدا ژی ئەم بیَ سەبر
هیڤیا عەجیَبا لاپ مەزن –
هیڤیا تاڤیَ بوون هەر سبه.

پاشیَ پاییز مه بوو میَڤان،
و مه بیر کر خەم – متاله،
جنا کەتن ئەم سەر دارا،
مه خوە گەش کر، خوە خەملاند
ب وان حەموو ڕەنگ – ئاوازا،

وەکی تاڤێ مەڕا دشاند.
عەیدا ڕەنگا، بێن بوغزا بوو.
شکلکێش ژ شەهەر هاتن
و سبێدا تا ئێڤارێ
ژ مە هلدان
حەموو ڕەنگ ئاوازێ عەجێب.

پاشێ دەم هات،
و خلاز بوو عەیدا مە ژی،
چاوا تمێ پەی عەیدێڕا،
مە خاترێ خوە ژ هەڤدو خوەست،
ئەم بەلا بوون،
و مەلوول بوو
دەمخاترێ.
ئەم ئیدی چوون،
هوونە خوەش بن.

١٩٧٨

## دەم

زارۆتی بەرخا بۆنا کێرێ یە،
لێ ئەو کێر دەمە،
و دەم بەرخا من ڕۆکێ شەرژێ کر.
زارۆتی چی یە؟
تاڤ، ستەیر دکەڤن بن ڤێ کێرا تووژ،
و هەر دەمە کو توجار نامرە،
چمکی دەم تمێ
بێ دەستپێبوونە و بێ خلازبون.

١٩٧٨

## شەڤا من

دنێ خەورا دچە،
دسەقرە کووچە.

ئاڤا بەلگێ دارا
سی ڕازانە خوەڕا.

لووری بێژە، دایێ،
ئاخ خەوا من نایێ،

بەلکی دیسا چا زار،
ڕازێم لال و بێزار.

لێ نایێ ژ ئاخا سار
دەنگێ دایکا من ژار.

١٩٧٨

***

باران سوورەتێ بهارێ دشۆ،
لێ تاڤا شرین بێ پێژگیرا گەرم
نەرم زها دکە سوورەتێ زمرووت،
چڤیک دسترێن، زارشرین، بێ خەم.

بیرانینەکە ماشیایی و کەڤن
ژ جی – نڤینێ مەهـ و سالێ دوور
خەوێ ڕادبە. ئەز خوە دبینم
بەر باران، تاڤا زارۆتیکە نوور.

و دایێ، مینا ڤێ تاڤا شرین،
نەرم زها دکە سەر چەعڤێ من شل،

و ئەز، شڤێتا بهارا پێخاس،
درهڤم کووچێ، دلیزم ب دل.

چیڤ چیڤ. چڤیکا قاسی دلێ من
خوه ناڤا نوورا تاڤێدا دشۆ،
چڤیکه – دلۆ، سەرخومبه، فەسال،
وێ تەلییایه بەر دارێ پشۆ.

١٩٧٨

## سلاڤا گوند

تو کەسی تە ڤرا تونه،
تو کەس تە ناس ناکه،
تو هەو زانی کەسەک تونه،
کو دلێ تە شا که،

کووچا گونده – هاڤینێ تۆز،
پاییزێ شل، حەری،
و تو دچی و نزانی،
کو تێ کودا هەری.

نیڤرۆ تاڤێرا دلیزه،
دار سی ڕاخستنه،
تو هەو زانی، کو وێ دەمێ
گونددا تو کەس تونه.

لێ وا کالەک ڕاستی تە تێ،
دبێ : – ڕۆژا تە خێر.
قەی تو ڤرا مەزن بوویی
و ڤر بوویی تو مێر.

کورک ئەجەلە ڕێ دچە،
تو دیتی و چا مێر،
گران سلاڤێ ددە تە:
- ئاپۆ، ڕۆژا تە خێر.

زەعف ژی وەکی تو خەریبی،
زەعف ژی نەناسی تو،
ئاخر بەنی ئادەمن ئەم،
دۆست و برێ هەڤدو.

و هێنکایا مالەکێ ڤر
تەڕا دبە ستار،
هەو زانی تە نکاندنە
ڤێ حەوشێدا ئەڤ دار.

و تو دچی، دلدا دبی
سلاڤ - کلاڤا گوند،
ب خوە سلاڤێ تو ددی
ب وی عەدەتێ ڕند.

١٩٧٨

## کلام

زەعف ژی وەکی ئەڤ کلام مەلوولە،
ئەو خەریب نینە، ژ خوونا منە،
ئەو بیرانینا وان ڕۆژێ دوورە،
وەختێ تەنێ بووم، بەکۆمەک، گونە.

و خەبەر کەتن دلقێ دەردێ من
و منرا بوونە کلاما مەلوول،

وەکی ئەز تەنێ بارێ خوە نەبم،
وەکی سفک بە ڕێنگا منە دوور.

ڕاستە، مەلوول بوو، لێ هەڤال بوو ئەو،
گومان بوو دەما بێگومانتیا من،
و شەڤێ بێ خەو ئەو منرا بوو خەو،
ئەز دینج دبووم بن سەوتا وێ ئامن.

و وێ ئیمداد دا، کو ژ جمجما
بەرخومکەتنێ عەسە دەرکەڤم،
ببینم جابا وێ پرسا "چما"،
کو، شڤێتا کورم، دکۆت دلێ من.

هەما ئەوێ ژی منرا ئەشق ئانی،
کو پێ وێ جانکم دێمێ خوە مەلوول،
کو خوە بحەسم، وەکی مێرانی،
ب نامووس قەداند من ڕێنگا خوە دوور.
١٩٧٨

## باران دبارە

باران دبارە، شکر ژ عەورا،
ئەم بیر نەکرن ڤێ ڕۆژا خومام،
دیسا زمرووتێ بکەنە مەڕا،
دیسا وێ مەرد بە ئەڤ ڕۆژا تما.

و ئەزێ پێخاس دەرێم ژ مالێ،
لنگێ خوە شل کم ناڤا گیهێدا
و داوەشینم ژ چقێ دارێ

وێ بارانێ کو هێ مایە پێڤا.

و پێ دەلنگا شالێ شل کری
بێم مالێ و وێ سەر من خەبەردن،
چاوا وان سالێ دوور نەبیرکری،
وەختا شل دبوو زارۆتییا من
بن بارانەکە هاڤینێیە دین.

١٩٧٨

## هشبوونێ دا

فکر هشبوونێ حز دکن.
جولەعت نەکن
دمری ڤەکن
بەر گورینا کوندرڤالا،
هشبوون بلا
خوەڕا بژی ناڤ متالا.

ئێڤارا خوەش
ناڤا پێلا هشبوونێدا
فکرێ گران دخولقن
دمرهەقا مە و دنێدا،
دمرهەقا ڤی عەمرێ مە کن،
کو ئەم ب خوە

نزانم چا دمرباز بکن،
چمکی چەعقی هەلا قولە،
چمکی دلی هەلا قولە
دەستێ ترسێ و خۆفێدا.

فکر هشبوونێ حز دکن.
هشبوونێدا
بفکرە، خوە بحەسە،
کو کێیی تو ڤێ دنێدا،
و تو عەسە
بگەر، بکوژ وی جەلاتی
روحێ خومدا،
کو ناهێلە، وەکی مەرڤ
لاپ لاییقی ناڤێ خوە بە.

١٩٧٨

## ئیشەڤ

ئیشەڤ خەونێدا من بوو قیرینە،
هشییار بووم مالێ تو کەس تونینە،
سەر عەنیا قەمەر خوودانا سارە،
دل بێتابەتی، قەی زارمزارە.

خەونێدا هەلا هێ سالێ شێرن
و ئێتیمێ شێر هێ من دنهێرن،
قورنا بیستی یە، قورنا کول-دمردا،
شەڤ دخەنقە خەونێ گراندا.

١٩٧٨

## ئەم هاتنە دنێ

ئەز هاتمە دنێ، ئەزێ رۆکێ هەرم،
ئەز هاتمە، وەکی شابم و وە شاکم،
دلێ من تەمزە، کێ وێ بێژە مەعرم،
ئەزی دوروو نینم، ئەز کو هەمە - یەکم.

هەر کەس، کو تێ دنێ، زەلالە، چا کانی،
نەهێلن شێلوو بە ئەو کانینگا زەلال،
نەهێلن زوو کال بە دل و ڕوحێ جانی،
بلا حوب ژی، نان ژی تمێ مەرد بن، هەلال.

ئەم هاتنە دنێ، ئەمێ ڕۆکێ هەرن،
و ئەمێ چ ببن خوەڕا ژ ڤێ دنێ؟
ئاخر ئەم مەرڤن، ئاخر ئەم نە مەعرن،
دنێ خوەشە، چما ئەم ژەعرێ بدنێ.

١٩٧٨

## شکر سبێرا

و سبە ڕۆن بوو ئیرۆ ژی ل من،
و بلا ڕۆن بە سبە ل وە ژی،
بلا ئەڤ می ژی بکالە دیسا،
بلا بۆرینا چێلەکا ئاڤس
ببە کلاما ژیینا تەزە،
کو مالسەغەلا تاری دا نها
هلتینە بینا گیهێ درووتی،
بلا جەوا ژیر بۆنا مە ڤەکە
سورا هەیینا کۆکا ڤان دارا،
و کەنێ زارا خەوێدا بێژە،
کو دێ-باڤ بادە دنێدا نازین.
سبە سافی بوو، شکر سبێرا.

١٩٧٨

## تەنێتی

شەڤە، شلە، شلۆپە یە،
ئەزم، یەک ژی جڤارە یە،
شەهەر خرمخرە دها،
عەزمان بێ دەنگ-هسە نها،
هەر لنگێ من بێ خەو مانە.

مالێ چ کم، کەس ور تونە،
عەزیزێ من کو دا چوونە؟
ئەزم، یەک ژی جڤارە یە،
بۆی من شەڤا بێخەو مایە،
و لنگ ئیدی وەستییانە.

١٩٧٨

***

بۆی تەنێ نەمینم دچوومە ڤاکزالێ،
شەڤ ڤاکزالێ چڤاس بێژی مەرڤ هەنە،
و تو ور بیر دکی دەرهەقا ڕازانێ،
بۆنا هاتنا تە هەو زانی ور شانە.

جڤارە دمرە ناڤا تلیێ تەدا،
مسلەعتا شەڤێ دریژ دبە دها،
تە بێخەوتییا خوە ڤان سەرادا بەردا،
و نزانی کو یە ئەو بێخەوتی نها.

و هەر تەنێ وەختا سبە سافی دبە،
سەرێ وەستیایی گران دبە ئیدی،
و کووچێ تەمزڕا تە دەعف ددە سبە،

دبیّ: - هەره، رازیّ، هەره رازیّ، گدی.

مال جی-نڤینیّ بی شایه، کو تو هاتی،
حەمێزا خوه تەمز ئەو ڤەدکه بەر ته،
تو هەو زانی شوون دا ڤەگەرییا زارتی،
ڕەحەت دبه سەری، ڕەحەت دبه بەدەن.

١٩٧٨

## پاییز

دنیّ دینج دبه، پاییزه، بەلگوەش.
خلاز بوو ئیدی حکیاتا هێشین.
ڤەخوه تو هەوا پاییزێیه خوەش،
ببهیّ - بن لنگا بەلگ دکن خشین.

دیواریّ هێشین ناڤ مێشیّ سخدا
هلشییا ئیدی بیّ تۆز و خوبار.
دنیا مەزن بوو. باییّ بێستار
ڤرا دەست پیّ کر ڕەقاسا خوه پار.

بهار بوو، ڕۆ هات، هشییار بوو مێشه
و حوبا خوه شین دا بەنی ئادەم،
نها تەنێیه و لال دمێژه
شیریّ مژا تیر خەونێدا هەر شەڤ.

خوەرا دمێژه مێشه مژا تیر،
مینا تڤالیّ بەر بستانیّ دیّ،
ڕۆکیّ ژی ویّ بیّ زڤستانا پیر،
و ئەویّ بێژه: - خەوا من تیّ.

١٩٧٨

## نەکە گازن

و دیسا بەلگەک، دیسا هێسرەک
چەعفێ پاییزا گەور ژۆردا هات خار.
ئارامەکە لال، خەمەکە دلتەنگ
مێشەدا هەیە و ڤرا بێزار
هەر نیشانەکە سەر رێ دبێژە،
کو عەمرێ مەدا هەر تشت تێ-دچە،
لێ ئەڤ خەما نوور، ئاراما بێ بن،
شیرن و خوەشە. تو نەکە گازن.

١٩٧٨

## رۆژا زڤستانێ گەرم

ڤێ زڤستانێ چ خوەشە ئەڤ تاڤ،
چ باشە گەرما ڤێ تاڤا شیرن،
هەر چییانن، وەکی، چا سلاڤ-کلاڤ،
برقا خوە قەرقاش مەرا دشینن.

عەرد سەرما ناکە، دلێ تە گەرمە،
سڤکی، مینا خۆرتانیا خوە دین،
و دنێ، ئالەم، تە ترێ رەحمە،
دنێدا تونە تو خەم و برین.

کنج، پینێ زارا سەر بەن حەوشێدا
بەر بایێ سڤک دململن نەرم،
دنێ قەی بینا تفالا هلدا،
بینا شیرێ دێ ڤێ رۆژا نوور، گەرم.

١٩٧٨

## عەزیزێ من

و چوو ئەمینێ عەڤدالی دلزار،
کو مینا زارا دنێ دنهێری،
گەرم دبوو بۆ مە ڕۆژا هەرە سار
ژ دل و بینا ئەوی جامێری.

و چوو ئووسڤێ بەکۆیی دلرەعم،
کو شێردا حەزار جارا مرن دیت،
لێ شێرێ خومدا هیشت دلەکی گەرم،
گۆت: - دنێ خومشە، وێ خومیکن، گدی.

و چوو شکۆیێ حەسەنی دەلال،
بەنگیێ ڕۆیێ، زار-زمانێ مە،
وی دخوەست یەکا مە بکە حەزار،
لێ ڕیا وی بری مرنا نەمەرد.

و چوو عەرەبێ شەمۆ-دنێدی،
ئەوی ب زارێ خانی دلزێرین،
گۆت: - ب تفاق بن، هەی، کوردێ جندی،
هەکەر دخوەزن دنێدا بژین.

١٩٧٨

## سینۆر کانێ

### خەبات

تو تەنێ دمینی، لێ بەر خوە نەکەڤە،
هەرکێ هەڤال-هۆگر، هەرکێ قەوم و پسمام
تە فەعم ناکن و ڕۆژ بۆنا تە قەی شەڤە،
تو بەر خوە نەکەڤە، نەبێژە: - تەنێ مام.

دنێ ئالەمێ دا بۆنا ڕوحێ زێندی،
بۆنا دلێ شەوات و سەرێ نەرحەت
هەڤالەک تم هەیە و تەڤا وی ئێدی
تەنێ نینی تو جار، تو گاڤ و تو سەحەت.

ئەو کێلەکا تە یە، فکرێ تەدا دژی،
خوونا تەدا دکشە. ڕەحەتیا مەزن
و لەزەتا ئوسا تینە بۆی دل، مەژی،
کو دخوەزی بێژی، کو بەختەوار ئەزم.

خەباتە ئەو هەڤال، هەڤالەکە ئامن،
کو تو جارا بۆی خوە تو کارێ ناگەرە،
چاخێ ئەم دوەستن، ئەو هم تە و هم من
دکە جی-نڤینا، لووری دبێ مەڕا.

ئەو، چاخێ دخوەزە، چییا وەلدگەرینە،
نێزیکی مە دکە حەزار ئستەیر و تاڤ،

ئەو بەر دلادا تێ و عەڤد تەنێ نینە
جهانا مەزندا و سەر ڕێنگا بێ ناڤ.
١٩٧٨

## خوە نیشان نەدە

خوە نیشان نەدە، وەکی ئاقلی،
مەرڤێ ئاقل خوە نیشان نادە،
ئەو بەلا ناکە گلییێ بادە،
خوە نیشان نەدە، وەکی ئاقلی.

تە خلاز ناکن تو خەبەر گلی،
چ هەیی ئەوی نە کێم، نە زێدە،
خوە نیشان نەدە،
وەکی ئاقلی،
مەرڤێ ئاقل خوە نیشان نادە.
١٩٧٨

## ئەز دخوەزم

ئەز دخوەزم، وەکی ئەڤ ڕوحێ من زێندی
ڕووت و تەعزی بژی و بژی بێ زری،
و خوە ڤەنەشێرە، و نەترسە ئێدی،
و نەگری.

خوە ڤەکە بەر دنێ، تمێ،
مینا زارۆ، بێ دەلک. بکێلمە، بستری
و زانبە، وەکی حەموو کەسن جامێر،
بێ دەعون ڕێ.

کرنەکە بێفەعم و گلیکی نەتێ،
چا ڕم، برین دکن ڕوحێ تەی بێ زری،
و هشبوونا شەڤێ دبهێ، کو ڕوح تەنێ
چاوا دگری.

١٩٧٨

## ئاقل بژی

باران باری، هەوا سارە،
قژکا قرک بێ ستارە،
لێ عەمرێ وێ چەند سەد سالە.

مالا تە گەرم، تێر و تژی،
توێ مینا خوە دوکوژی،
لەما هاقاس هندک دژی.

تو عەمرێ خوە ئاقل بژی.

١٩٧٧

## ئەم

ناڤ جەهانێدا
چقاس چووکن ئەم
هەبەکی تۆزێ
و ئاتۆمەکن، کو نایێ خانێ،
و ئەو ئاتۆم ژی
دمرهەقا مەدا دکارە بێژە:
ئەم هەنە یان نا؟

لێ ئەم ئوسا ژی گوجلینە، مەزن

بێ حەد و حدوود،
بێ سەری، بێ بن،
ماتلێ خوە ڤا نەرمحەت و گەرم،
و ئەم جەهانێ
ناڤ مەژووێ خوەدا ها ئەلەک دکن.

## کانێ سینۆر

ئەڤا ڕەشە، لێ ئەڤا سپی یە،
ئەڤا باشە، لێ ئەڤا خرابە،
ئەو شا یە تمێ، دلێ تە تییە،
تو لەزی، لێ ئەو نکارە ڕابە.

و تو هەو زانی هەر تشت زەلالە،
تو پرس و تو شک دنێدا تونە،
ب دلێ ڕەحەت تو هەرە مالە
و ڕازێ مینازاڕا بێ گونە.

لێ تێ چ بێژی، وەختا سال-زەمان
دل دەلالا خوە حز دکە ب کین،
وەختا ژەعر دبە مەلهەم، دوو-دەرمان،
وەختا شابوونێ مەرڤ دبە دین.

کا کانێ سینۆر، وەختا دبینی
ناڤا شیرنایێ تەعلایی هەیە،
لێ تەعلایێدا شیرنایی عەینی،
ئەو تەعل و شیرن خووت عەمرێ مە یە.

تو شەر دکی، کو شەر بێ هلدانێ،
جان ددی، وەکی مەرڤ نەمرن،

و تو نزانی ئەو سینۆر کانێ،
کو هەڤ باشقە کر ژییین و مرن.

١٩٧٧

## دژمن

دژمنێ من بلا خوەڕا ڕەحەت بژی،
قە مووکی وی ژی ئەز ناکەڤم تو جارا،
بەر ڤێ تاڤا شیرن هەیە ئیزنا وی ژی
خوەڕا شابە بێخەم تەڤی ژن و زارا.

تو نکاری ببی دەلالی هەر کەسی،
تو چ مێری، هەرکە دژمنێ تە تونە،
سایا دژمنە، کو ڕۆکێ خوە دحەسی،
وەکی قوسوورا تە یانێ یا وی هەیە.

کێ دلدا ژەعرە لاپ، کێ ڕۆژا گەلەکا
دکە دەرد و هێسر و ناکە تو خەما،
بۆنا وان دلێ من دەرێ خوە ڤەناکە،
ناباخشینە وانا دلێ من تو دەما.

١٩٧٨

***

هەرکێ دخوەزی کو تە فەعم بکن،
ژ کەنەرێ خوە تەنگ تو دەرکەڤە،
دەرێ بەر تاڤێ ب دل و فکر
و بدە بەر بێ عەنیا خوە کەڤەر.

دنێ بۆی تە یە، توێ دنێیی،
خوە کەسیب نەکە قالبێ خوەدا،

نەبێژە، وەکی عەڤدێ خودێ یی،
ئەولەدێ شەمسی، کو شەمال ددە.

تو، مینا تاڤێ، مەرد بە، دلفرە،
و، مینا تاڤێ، بۆی ئادەم بژی،
ژ ڤی عەمرێ گەش خوە نەکە فرار،
ئای ئوسا، قوربا، بکەنە تو ژی.

١٩٧٧

## مەرڤێ چاخێ من

جاهل دبێژن، وەکی ئەز کالم،
من قەبوول ناکن ناڤا کۆما خوە،
کال دبێژن کو، ئەز هێ جاهلم،
نکارم فەعم کم خەم و کولێ وان.

بەنی ئادەمێ یاش و چاخێ من
بۆنا سەیرا خوەش، سۆهبەتا شیرن
ئێڤارێ ژی قەت وەعدە نابینن،
ئێڤار بێ وانا شا دبن، دگرین.

زار مەزن دبن، ب ڕیا خوە دچن
و ڕۆژەکێ ژی دمینن مەتەل،
کو دێ – باڤ زەعف کێم جیادا دچن،
هندک تێن جەم وان هۆگر و هەڤال.

و فەعم ناکن زار، کو سەر ڕیا درێژ
مە دمما خوە گشک قوربانا وان کر،
خەمێ ڕۆژێدا ب کول و ب ئێش
ژ هەڤ دوور کەتن هەڤال و هۆگر. ١٩٧٨

هەرکێ ناخوەزی، سلاڤێ نەدە،
مێر بە و مینا مێرا بمەشە،
ئاخرییا گشکا دیسا ئەڤ عەردە،
چما دکەنی وەختا دل دێشە.

سلاڤێ نەدە تو قولخا من،
ئەو ئیرۆ هەیە، لێ سبێ تونە،
ئەز حەزار جارا جیدا دمرم،
وەختا قەدرێ من قولخا منە.

١٩٧٧

## مەرڤێ بێبەخترا

دلێ خوەدا شابە، دژیکا بکەنە،
سەر من و سەر ڕۆژا من ڕەش،
عەڤدێ شڤێتا تە عەمر دا هێ هەنە،
خوەڕا دژین بێخەم، دژین سەرخوەش.

چەرخا عەمر ئیرۆ بۆی تە دفتلە،
سبێ کا بنهێرن تێ چ بێژی،
و بەخت نە قاپووتە، باڤێژی سەر ملە،
کو هەرکێ ماشییا تێ بگوهێزی.

مەرڤ بۆنا مەرڤ دژی ڤێ دنێدا،
مەرڤ سایا مەرڤ کوبارە و سەربەست،
تە خوە حەبس کرییە وێ قالبێ خوەدا،
کو ئیسانا دکە چەعڤنەبار و دەخەس.

وێ هەڤال هاتنە هەوارا من نها،
با وێ بەلا دکە کەرییێ عەورا ئیدی،

لۆ، بێبەختۆ، بێژە، وەختا بکەڤی حال،
تێ گازی کێ بکی، تێ ناڤێ کێ هلدی؟
١٩٧٧

## ڕێ

کێ ڤێ ڕێڕا چوویە، ئەز نزانم،
تێ ژی ڤرڕا هەری،
ئەزێ ژی دەرباز بم،
و کەس پێ ناحەسە کو کێ چوویە.
تو بەر خوە نەکەڤە،
تویشێ خوە بکە،
ڕێنگا خوەدا هەرە
تا ئاخرێ.
دنێ دا ڕێ زەعفن،
ڕێ سایا مە دژین،
ئەزم، توی، ئەوە خوەیێ ڕێنگا.
بلا ئەم بمینن
نە عەیان و بێ ناڤ،
نزانبە تو کەس،
وەکی ئەم هەبوونە،
لێ هەرکە ڕێ هەنە،
و هەرکێ ڕێ دژین،
دێمەک ئەم ژی دژین
تامارێ وان ڕیا دا.

١٩٧٨

***

شەڤێ بێخەو، شەڤێ بێخەو
بوونە جۆلانگا متالا،
متاله ژی چا کول و خەم،
ناسترن، بوونە بەلا.

تو چ بکی، تو چ بێژی،
بۆنا ڕازێن ئەو متاله،
متاله، چا برین، دژین،
بۆی برینا دەم ژی ساله.

تەیر سەر دارێ ڤەجنقی،
و تەیر ژی شەڤ ڕەحەت نینە،
لووری بێژە، لووری بەلکی
بۆی متالا خەوێ بینە.

١٩٧٧

## مى دکاله

مى دکاله،
مى بەرخکا خوە دگەرە،

کور چوو شەهەر، گۆت: - ئەزێ بێم
وی دەستێ دێ کەر ڕامووسا،
کشیان و چوون چا ئاڤێ چێم،
هاڤین، پاییز و زڤستان.

دیسا بهارە بەر دێری،
عەوتینا سێ دێ مال دەرتێ
و هەو زانی کو وێ دەمێ

کورێ وێ یە ژ شەهەر تێ.

می دکالە،
می بەرخکا خوە دگەرە.

١٩٧٨

## بێخەوتی

تاری یە، خەمە،
شەڤ چ بێرەعمە،
کەس تونە بێژە
چما درێژە
شەڤا من بێخەو؟

کا کو یە سبە،
کو خەما دبە،
کو پێ نوورا وێ
بشۆم وێ دەمێ
شەڤا خوە بێخەو.

١٩٧٤

***

تەنێ بۆی ڕۆژا ئیرۆ ئەم ناژین،
ڕۆژا ئیرۆ ژی وێ جاندە، هەرە،
ئەم بارێ سبێ سەر ملا دبن
هم بۆی خوە، هم بۆی ئەولەدێ سبێ.

کەس زۆرێ نادە تو کەسێ ژ مە،
چەندکێ مینا مە هاتنە - چوونە،
وەعدە بۆنا مە ڕیا خوە کڤش دکە،

و ئەم رێچا خوە تێدا دهێلن.

چقاس گرانە بارێ مەرڤا،
هاقاس ژی کوورە دەوسا لنگێ وان،
ئیز و رێچا مە دها مەزنە
سەر قورنا بیستی.

١٩٧٦

***

وەختا جاهلی،
تە ترێ عەمر بێ حەد درێژە،
تو لەز ناکەڤی،
شوخولێ ئیرۆ داڤێژی سبێ.

وەختا جاهلی...
لێ جاهلتێ ژی
ب قەیدێ عەمر و دنێ دژی،
ئەو ئیرۆ هەیە، لێ سبێ تونە،
وەختا سالێ تە سەر هەڤ دچڤن،
تە ب رێکە دن عەمردا دبن،
تو خوە دحەسی، کو عەمر کنە،
تو لەز دکەڤی،
شوخولێ ئیرۆ ناڤێژی سبێ،
و تو دبینی،
کو تەدا ئیدی
ئەو هەرمکەتێ بەرێ قە تونە.

١٩٧٦

## چ زوو بوهوری

تە ترێ، وەکی وەعدە بۆنا تە
نایێ گوهاستن، تێ دیسا ئەو بی،
تە ترێ، وەکی تو ئەشق و خەتا
ناگوهێزن بەژن و بالا تە عەقدی؟
لێ عەمرێ مەدا سال دبوهورن،
شڤێتا عەورا، یەک لەز، یەک هێدی،
و تو فەعم دکی، کو چییە مرن،
و مینا بەرێ لەز نینی ئێدی.
دبینی وەکی مەزن بوویە کور،
ژ تە بلندترە ب بەژنا خوە نوور،
و مالێ، وەختا تو دچی هوندور،
دبینی، وەکی پر بوونە هوورموور،
لێ سەرێۆرا تە هێدی دمەشە،
دها گوهـ ددە سەر زارا ئێدی.
دەرڤا پاییزا پربین دخوشە،
جیکی دمرە دەنگەکی زێندی،
چ زوو بوهوری بهارا تە خوەش،
چ زوو حەلییا هاڤینا تە گەرم،
و تو، ژ بینا پاییزێ سەرخوەش،
هەسپێ خوە ئێدی ناژۆیی بێ گەم،
ناژۆیی بێ خەم.

١٩٧٦

## ب دەنگێ خوە

شارووڕ دخوونە
ب دەنگێ خوە،
دخوەزی ببهێ،
دخوەزی - نا.

ئوسا دخوونە،
قەی دنیا زێندی
ب حەزار ڕەنگا
تەڤ دانە وی.

کلاما خوە نوور
وەختا دهوونە،
عەسە دبێژی
- شارووڕ دخوونە.

تو ژی وەک شارووڕ،
ب دەنگێ خوە
عەمردا بستریێ،
بەنی ئادەم.

١٩٧٦

***

تو پەنجەرا ڤەکە بەر چار بایێ دنێ،
تو خوە ڤەنەشێرە پش حەڤت دەرگا،
کولیلکێ ئۆتاخێ، چقاس قنیات بدنێ،
ناگهیژن تو جارا کولیلکێ ناڤ مێرگا.

دەنگ، سەدایێ دنێ تو نەترسە توجار،

بلا تاڤا شیرن ته ڕامووسه،
بلا زیپک ته خه، ژ وێ نابی هه‌ژار،
و بلا دێمێ ته به‌رفا سار بالێسه.

کێ ڕێنگا دوور دبره، لنگادا قه‌واته،
دنێ زانه، خه‌مێ وێ دکشینه،
کێ بۆنا خوه دژی، بێ قام و قاناته،
مه‌رڤێ ته‌نێ خوه‌یێ به‌خت مرازا نینه.

زمرپێ ئیرۆ بکه تو زمرپێ دلێ خوه
و خوه ڤه‌نه‌شێره پش حه‌ڤت دمرگا،
تو نه‌به کولیلکا ئۆتاخێیه بێخه‌م،
شین به به‌ر تاڤا گه‌ش، شین به ناڤا مێرگا.

١٩٧٦

***

وه‌ختا ددن چێرا،
تو ببهێ وان چێرا،
جارنا ناڤ چێرادا،
ڕاستی دهار دبن.
چاخێ په‌سنێ ته دان،
تو گوهـ نه‌ده په‌سنا،
که‌ر سه‌رێ خوه هلده،
خوه‌ڕا لێده هه‌ره،
چمکی په‌سن باره،
هه‌ر که‌س پێ نکاره.

١٩٧٦

***

ڕووڤی گشک عەسە
ڕووڤیتیا خوە وێ ڕۆکێ بکن،
تە ژ ڕێ دەرخن،
حشێ تە ببن.

و وەختا ڕۆکێ ڕووڤی ببینن
تو جیدا کەتی، ئیدی ڕانابی،
و وەختا ڕۆکێ ڕووڤی ببینن،
کو کۆڕێ خوە ژی قە نا دەمەکێ
نکاری تو بەر ئیشقێ ڤەکی،
وی چاخی ئەوان
ڕووڤیێ قومسی،
کو تاریستانا شەڤێدا بوونە،
لێ مەزن بوونە بەر تاڤا شیرن
بێ ساو و بێ ترس
وێ ڕابن، بێژن،
کو ئەوە شێرن.

١٩٧٦

***

تامارا مندا
خوونا زراڤێ ڕەش ئیرۆ دکشە،
و هوون نێزیکی من نەبن ئیرۆ،
هنکی سەبرکن،
تا زراڤێ من ب ژەعرا خوە ڕەش
خوە کەر بکوژە و منا بە لاپ.
بەنی ئادەمنۆ،

کول و دمردێ خوه جهم خوه بهێلن،
هوون ڤێ دنێدا
دارێ ئەشقێیه شین بنکینن،
و ب کەنێ خوەی تەمز و زەلال،
کو ژ دلا تێ،
وان دارێ ئەشقێ ئاڤدن ل دنێ.

١٩٧٦

***

وەختا تو دلێ یەکی دێشینی،
وەختا تو قەدرێ یەکی دکەڤی،
تو نە مەرڤی،
هەما سێریدا دژمنێ خوە یی،
هەما سێریدا دحەرمینی
تو ناڤێ ئادەم.

ب تەلایا دل ژ زارێ تەمز
گلی دبارن:
– ئەو نە مەرڤە! –
دێمەک نزام کو، کەنگێ، بۆنا چ
یەک گرییایە، یەک مەلوول بوویە،
بەر خوە کەتییا،
یانێ ئێشا خوە پشت حەڤت دەریا
قاییم دادایە،
کو نەکە قیرین،
یانی کولا خوە بێ زار برییە
شەڤێ بێخەودا،
و ئەوێ خەرێب، ئەوێ نە مەرڤ

خوەرا شا بوويە.

رۆژ پاشلا خوەدا
گەلەک سورێ مە ژ دنێ ڤەدشێرە،
لێ ژ خوە توجار تو ڤەناشێری
خرابیێ خوە.

و هەرکێ ئیرۆ
تو گازنێ خوە ژ یەکی دکی،
زانبە، وەکی ئەو یەک خووت تو یی،
ئاخر تو بوویی دلێ وی کەتی،
لەما ژی ئەوی وا چەعف دایە تە،
جابا تە ددە.
تو گازنێ خوە خووت ژ خوە بکە.

زارۆ زمانۆ، فەسال خەبەردە،
دلی نازکە،
ئاخر برینا ژ تیر - خەبەرا
توجار قەنج نابە.

١٩٧٧

## هەڤرا تاب بن

تو گونەهکار نەکە، وەختا مەرڤ
دلێ خوە رووت تازی دکە بەر تە،
تو ژی شا بە، بۆی ئەشقا وی دلی،
وەرە بەر دل، هەرکە دلی کول و دەردە.

مەرڤ کارە زار بە ناڤ شابوونا خوەدا
سەر دلساخیا وی تو نەکەنە توجار،

گلیکی تە تەنێ، مینا دەربا خەدەر،
دکارە بکوژە دلێ تەمز و زار.

عەمرێ مەدا شابوون مینا تاڤا گەشە،
شابوونا مە دبە تاڤەکە چووک،
لێ عەزمانێ عەمر جارنا ئوسا ڕەشە،
کو ناگهینی بێژی: - تاڤا من کودا چوو؟

تو پارەکە بارێ خەم و دەردێ عەڤدا
هلدە سەر ملێ خوە، سەر دلێ خوە بێخەم،
و بیرکە وێ دەمێ، وەکی تە کۆمەک دا،
و باڤێژە ئاڤێ تو وێ قەنجیبا خوە.

لێ هەرکێ نکاری تو کۆمەکێ بدی،
وەرە بەر دلێ وی ڕۆژا بۆی وی دژوار،
گلییێ ب دل بۆنا مەرڤ دبە مەلهەم،
سڤک دبن بۆ وی عەمردا خەم و بار.

وەرە، نەبن دیلێ چەرخا فەلەکێ ئەم،
هەڤڕا تاڤ بن سەرمێ، خەو بن شەڤا بێخەو،
وەکی کولا سالێ مەڕا ببە تەک دەم،
و دنێدا شابن هەم دل، هەم چەعڤ.

١٩٧٧

## دنێدا

وەختا زک ڤالایە،
خەو ناکەڤە چەعڤا،
خوەزی قە نا پاری نانێ تسی بخوی،
ئەو پاری ژی تونە،

و تو بادی هەوا
حەموو کونجێ مالێ ل هەڤ دخی،
تشتەکی نابینی.
زکێ ڤالا، برچی
خەو ناکەڤە چەعڤا.

و وەختا سەرێ تە
فکرا دفەتسە،
خەو ناکەڤە چەعڤا،
فکر مینا کورما،
دکۆژن مەژوویێ تە،
تە ترێ مەژوویێ تە ڕاستی دێشە،
و ئەو ئێشا مەژوو
دگهیژە دلێ تە،
و دل ژی وێ دەمێ
ئیدی نە کو بۆی خوە،
لێ بۆی وانا دێشە،
کێ کو بێپار مایە
ژ وێ ئیزنا مەرڤ،
کو چا مەرڤ بژی.
فکرێ تە چا ئیساف،
مەژووێ تە دکوژن،
و شەڤ حەتا سبێ
خەو ناکەڤە چەعڤا.
لێ وەختا تێری تو،
سەرێ تە ڤالایە، مینا کوندر،
و ڕازایە ئیساف،

نه کو هەر تەنێ شەڤ،
ڕۆژا شەمال، نوور ژی خەو تە دبە مێڤان.
١٩٧٧

***

ئاڤ تێ و گۆل دبە،
ئاڤ ناکشە ئیدی،
گەنی دبە ئاڤ
و دمرە هێدی.

خوە حەبس نەکە بادە
ژ مەرڤێ سادە،
حورمەت، ئاڤ و قەوات
وان مەرڤا دا تە.

دەستێ تەنێ دنێ
دەنگ ژێ نائێ توجار،
ئەگەر ڕێکە دنێ،
تێ فەقیر بی و ژار.

ڕۆژا شین و شایێ
ئەوە بۆی تە هەڤال،
کێ قەدرێ نان زانە،
قەدرێ کەدا حەلال.

بکشە مینا ئاڤێ،
ئەسەقرە سەر رێ،
تێ هەری بگهیژی
حەجا خوە نوور بەرێ.

١٩٧٨

دو دنیا هەنە - ڕۆنک و تاری-
و تێ ژی ڕۆکێ ژ دنیا ڕۆن هەری،
تو ئوسا نەکە، وەکی پەی تەڕا
نفرا بکن، تە بدنە چێرا.

مەرڤ هەیە کو وی نە تالاشە،
کو دوو ویڕا وێ چ بێژن پاشێ،
دلا دێشینە، دچینە کولێ،
وەکی دلێ وی شابە ل دنێ.

تو تەنێ نینی، زارێ تە هەنە،
چا ژی دەربازکی، ئەو زار گونەنە،
ئوسا نەکە کو واناڕا بێژن، -
باڤێ وان چ بوو، ئەو زارێ چ بن.

١٩٧٨

## متالێ شەڤێ

تو دپرسی، وەکی شەڤێ بێ خەو
مالا خوەدا تەنێ ئەز چ دکم؟
دپەرتم، ئەزێ ئیدا چ کم،
ڕۆژ بەس نینن، نها شەڤ بوونە خەم.

دنێ زوودا چووکە و زوودا تەنگ،
قاسی مالا مە یە دنێ ئالەم،
و نالینا وێ کەر بۆی مە هەر دەم
دبە قیرینا زیز، شەڤا بێ دەنگ.

و متالێ شەڤێ دبن نفر،
مەژووێ تە دکۆژن حەتا سبێ،

تو نزانی ئەو دەم وێ کنگێ بێ،
کو شەڤ بۆی مەرڤا نەبە نفر.

١٩٧٨

## تەگلیف کرن

تەگلیف کرن: – وەرە.
جارەکێ، دودا.
تەگلیف کرن: – وەرە،
لێ ئەز نە دچووم.

و من جابا خوە دا،
ئەز نەچووم مێڤان،
چاوا هەرم ئەز بال،
کاڤا حز ناکم.
ئاخر ناچە خارێ
ئەو ئاڤ و ئەو نان،
کو وێ داینن بەر من
بێ جان و بێ دل

١٩٧٨

## شێرێ شاییر بخوونە

تو جارنا شێرێ شاییر بخوونە،
ب چەعڤێ شاییر مێزەکە دنێ،
بلا دلێ تە سار، یانێ بێخەم
ژ قالبێ خوە دەرێ جار دنێ.

بلا دلێ تە بۆی خەلکێ بێشە
و بلا شابە بۆی مەشا وەلێت،

بلا زانبە، شەڤ چ درێژە
سەبا دێ، کورێ کیژانێ شێردا
بۆی وەتەن خوونا خوە گەڤەز رێتییە.

ب چەعقێ شاییر دنێ مێزمکە،
خوە بشۆ ناڤا نوورا تاڤێدا،
و بلا کولا چڤیکا سەقەت
دلێ تەدا چا هەیدادە لێدە.

تو جارنا شێرێ شاییر بخوونە،
پێ وانا زار بە، جاهل بە، کال بە،
توجار نەبێژە: - ئیشێ من نینە.
نەهێلە وەکی دلێ تە سار بە.

١٩٧٨

## چەعڤ نەدە جینار

تو چەعڤ نەدە جینارێ خوە،
جینارێ تە چەعقی قولە،
تو چەعڤ نەدە جینارێ خوە،
جینارێ تە چەعقنەبارە،
تێرنەخارە.
شەڤ بۆنا وی خەوێ نایبنە،
شەڤ نەیارە.
جینارێ تە،
هەگەر روونێ بەر تاڤا گەرم،
وێ بێ سارە.
تو چەعڤ نەدە وی جیناری،
کو خێنجی خوە

کەسی مەرڤ حەساب ناکە.
ڕۆژا بۆی تە تەنگ و تاری
ئەو، باوەرکە،
دەرگێ هەوارێ ڤەناکە.
زەعف ژی مالا وی جیناری
تێرە تژی،
دلێ ویدا تمێ ترسە
ئەو قە ناژی.
تو چەعف نەدە وی جیناری،
کو بیە قوولێ مالێ دنێ،
کو هازرە بۆی وی مالی
بیرکە یەکجار باڤ و ئنێ.

١٩٧٦

## ئیساف

هەگەر مەرڤی،
هەگەر دخوەزی
تو چاوا مەرڤ بمینی عەسە،
دەما خوە تەنێ تو خوە بحەسە،
کو چ دبێژە ئیسافا تەعزی.

ئەگەر دخوەزی گومان بی سەر خوە،
ئیسافێ خوەڕا تو بکە هەڤال،
و تو نامینی توجار بێ پەرگال،
و حەرام نابە تو شەڤا تە خەو.

ئیسافە، وەکی شێن دکە دنێ
و ڕوحێ مەرڤ دگهینە ستەیرا،

مال، سەر خەباتێ و وەختا سەیرێ
کانییا وێ ڤەخوە،
تە لازم نینە ئاڤەکە دنێ.

١٩٧٦

## بەر خوە نەکەڤە

عەزمان تارێ بوو و باران باری،
تە ترێ پووچ بوو ئەڤ رۆژا تە خوەش،
خەییرین رەنگێ سبێیا نارین،
منا بوو بینا تە دکە سەرخوەش.

لێ وێ بارانێ، چاوا دەست پێ کر،
ئوسا ژی ڤەکر و برقی تاڤ،
بەر خوە نەکەڤە، خرابی شکر،
درێژ ناکشینە، دەرە بێ ناڤ.

١٩٧٨

## پرس

ناڤ مندا تمێ ئاقاس پرس دژین،
وەکی بۆی وانا، قافێ من تەنگە.
تێن و نەوێری تشتەکی بێژی،
خەما وان نینە، وەکی دەرەنگە،
و جارنا خەوا نەرحەت دا ژی
ژ من ناقەتن، ئەو پرس چاوا خەم.
ژ چووکتیا من پێخاس و خشیم
حەتانی نها هەر دەرا، هەر دەم
منرانن ئەو پرس و سایا وانە،

کو سەر ڕێنگا خوە نەبوومە گەنی،
وەکی دلێ من وێ خەمێ زانە،
کو دەورا ئاتۆمێ بۆ عەڤدا ئانی.

مەژوو ژ پرسێ پر دفەتسە،
بەر عەڤدێ مایین ئەز ب خوە پرسم.

١٩٧٨

## مرن

ئەم عەزیزێ خوە،
وەختا ئەوانا دچن ڕەعمەتێ،
نە کو تەسلیمی ئاخا سار دکن،
لێ دلێ خوەدا ئوسا حز دکن،
وەکی ئەوانا نە کو دمرن،
لێ دیسا دژین،
دژین حەتانی وێ ڕۆژا نەمەرد،
وەختا ئەم ب خوە ژ دنێ دچن.
هەما وی چاخی
ئەوانا ڕاستی دمرن ئیدی.

١٩٧٥

## نەرحەتی

دقەومە شەڤا تاری هشیار دبی
و نزانی ژ کی دەرێ، چ تەهەری
نەرحەتی دنقتە ناڤ دلێ تە
و تا سبێ تو نکاری خەوڕا هەری.

نە دەیندار ئی، نە خووندار ئی، نە ژی نەهەق،

شەڤ - ڕۆ بۆنا عەڤد - ئیسانا دخەبتی،
لێ شەڤ جارنا هشییار دبی لال، بێ کۆمەک،
دنقتە ناڤ دلێ تە نەرهەتی.

١٩٧٨

## گونێ من تە تێ

گونێ من تە تێ، ڕەبێ ئالەمێ،
نە دیا تە هەیە، نە ژی باڤێ تە،
و خوەڕا دژی تو ناڤا دەمێ
بێ ڕەحما ئنێ، بێ هەقیا باڤێ.
نە ئێشێ زانی، نە کول و دەردا،
بەر شینا عەڤدا دلساری تمێ،
قە ڕۆکێ چما نەهاتی دنێ
و نەدیت توجار تە تەعما خەمێ.
جماعەت قر دبن ژ دەستێ زولمێ،
ژ قورلخیێ دشەوتە عەرد،
شڤێتا زارا دگرین شێر و مێر،
تە نە تالاشە، نە کولی، نە دەرد.
تو هاتی دنێ
بێ باڤ، بێ ئنێ،
لەما نزانی تو ڕەحما ئنێ،
هەقییا باڤێ،
گونێ من تە تێ، ڕەبێ ئالەمێ.

١٩٧٨

## خەبات و مرن

کالێ دخەبتە سبێ حەتا ئێڤارێ.
کالێ چەند سالی یە؟ خودێ زانە.
ڕۆکێ مرن هات و گازی وی کر: – وەرە،
وەعدە تەمام بوو، بدە جانە.

کالێ گۆت : – بجەعم، وەعدێ من تونینە،
چ دگەری ڤرا چا عەوارە.
جا ڤێ مەرێ بدە، هەرە ئاڤێ بینە،
زوو کە، ڕۆ خلاز بوو، وێ ئێڤارە.

و مرن خەبتی بن دەستێ کالێ ژیر،
تو حال تێدا نەما، ژ توتار کەت.
ومختا دیت بەر دەستێ کالێ دبە هێسیر،
مرن دزیکا ڤا حەوشێ دەرکەت.

و هەستوێ وێ کرن شنگەشنگ، ئەو ڕەڤی،
بینەفشکی چۆلێ کەتە عەرد ێ.
لۆ، کەڤتارا حەرام، کێ تەڕا گۆت ڕاڤی،
هەری جەم ئیسانێ سەر خەباتێ.

١٩٧٨

## بەرف

تەمزە مینا ئیسافا مەرڤ،
و وێ قلێر بە مینا ئیسافێ،
ژ لنگێ عەڤدا.
لێ باوەر دکم سەر وان هێلانا،
کو خەبەر ددن دەم و دەورارا،

ئەوێ تەمز بە،
چاوا ئیسافا وی ڕوحێ بلند،
کو شەڤێ تاری توجار نامرە،
دژی چا سبە.

١٩٧٨

## شاییر

پەرتینە،
ژ مەژووێ وان، ژ دلێ وان
سەر کاخازێ نقتینە
متالە و فکرێ شەڤان،
مینا خوونا زێندی و گەرم،
وەک هێسرا شۆر و گران.
و ناڤ واندا هەیە مەلهەم،
و هەیە تاڤ، هەیە باران.

ڕەعمە ل وان مێرێ مەرد، چێ،
ڕەعمە دلێ وانە مەزن.
وەختا ڕۆژا تە دبە چێر
و وەختا دل دبە گازن،
هەرە ڕوونێ بال وان مێرا،
ڤەخوە ژ کانیا وانە زەلال
و برەڤن ئەو خەم بلا،
کو بوونە بار بۆنا دلا.

تو خوە تەمزکە ب وانا،
وانڤا مەزن بە، ببە مەرد،
بلا دلێ وانی زانە

بێژە چییە شابوون و دەرد،
بلا شەمدانا ئیسافێ
دلێ تەدا ڤێخن ئەوان،
د ڕۆژێ ئۆغرمێ گران
پەرتینە، کو ئەز و تو
فەعم کن هەڤدو.

١٩٧٩

## بەرف نەکەت

و دل نەرحەتە،
ئیسال قە بەرف نەکەت،
نانێ دنێ ئیسال
دبە کێم بە.

ڕۆژە گەرمن، خومشن،
تاڤ ژی مە مێڤانە،
حزکی بێ پۆت دمرێ.
ئەڤ چ زڤستانە؟

و دل نەرحەتە،
تە دیت سرێ لێدا،
و عەردێ ڕووت-تەعزی
هاڤینێ بەر نەدا.

١٩٧٩

## مرازێ کەچێ

چ کو دکانێ دنێدا هەیە،
ئانینە تژی بەر من کرنە،

قه کەس نابێژە: – ئەڤ کەچ گونە یە،
ناپرسە، گەلۆ ب دلێ منە؟

هەر کەس کلاما خوە دلیلینە،
بهێلن ئەز ژی یا خوە بسترێم،
ئاخر دلێ من دلێ وە نینە،
ئەز ژ دلێ خوە نکارم دمرێم.

ئەز مالێ دنی وەڕا دهێلم،
ئەز دوا دکم – کو ژی بمینە،
بلا ڤێ دەمێ کەلەش لاوکێ من
گولەکە چۆلێ منڕا بشینە.

١٩٧٨

## بینا بنەڤشێ

### بینا حوبێ

پستەپست کەتە ناڤا کولیلکا،
وەکی دو دلێ ئەڤین وێ هاتن،
خۆرتێ ج بێژە، قە چا گلیکە
دەرهەقا حوبا خوە بێ سەرۆ بن؟

خۆرت کەر و لالە، ئەو دۆستا خوەرا
ناڤ کولیلکادا هێدی دەمەشە،
دوورڤا تێ دەنگێ چەمێ بێخەوە.
سپندارا تەنێ نەرمک دحەژە.

ئێڤارا هێنک خێلیپا خوە نازک
هێدی ڕادخە سەر عەردێ هێ گەرم،
هنەکی شووندا هێڤەکە مەزن
لال بەلا دکە ئیشقا خوە نەرم.

و دو قەراتوو وێ دەمێ ب سور
همبەری هەڤدو بێ زار سەکنین،
بەر چەعڤێ هیڤێ، چەعڤێ ستەیرێ دور
هەڤدو ڕامووسان ب دلێ ئەڤین.

ڕجافەکە خوەش ڤر پێرا پێرا
وێ دەمێ کەتە دلێ کولیلکا،
با فری و چوو، وەکی دنێڕا

دەرهەقا حوبا وان دا گلیکە.

و بینا حوبێ بەلا بوو دنێ،
دنیا سەرخوەش بوو ب وێ بینێڤا،
وەختا ل عەزمین هیڤ تێ خانێ،
وێ ژی تێ بینا حوبێ هەر ئێڤار.

١٩٧٦

## رێچا تە

سەر بەرفا چیل قەرقاش
من دیسا دیت
دەوسا لنگێ تە چووک
و ب دلێ سەرخوەش
پەی رێچا تەرا چووم.
چووم کو بگهیژمە تە،
ببهێم دەنگێ تە خوەش،
لێ دەوسا دەنگێ تە
دەنگێ باگەرا هار
تەسەلە بوو ل من.
نە رێ ما و نە ژی
دەوسا لنگێ تە چووک،
و باگەر چا تەعژی،
دبە پەی تەرا چوو.
باگەرێ هەر تەنێ
پێ زمانێ خوە سار
دەوسا لنگێ تە چووک
ب دینانی ئالاست،

پاشىَ خوه خەنقاند
سەر بەرفا چيل - قەرقاش.

ئيرۆ من ديسا ديت
دەوسا لنگىَ تە چووک.
تو باگەر نكارە
هلدە وىَ ئيزا تە،
كو تو سەر دلىَ من
دهێلى عەمردا.

١٩٧٦

## منرا تو لازمى

ڤىَ بەربانگا سبىَ،
وەختا شيرنە خەو،
هەوا هێنكە خوەش،
ئەز ناخوەزم دەستىَ خوە بدمە
سينگ و بەرىَ قەرقاش،
ناخوەزم ڕامووسم
ئەز لێڤىَ تە بێزار،
تو ڕازىَ، تو ڕازىَ
عەزيزا چەعڤخەزال.
ويتينا چڤيكىَ
خەوىَ دا تو ببهىَ،
بينا بايىَ هێنک
بلا ڕامووسانا من بە بۆى تە.
ديسا خەونا خوەدا
تو بكەنە شيرن،

دیسا نەفەسا خوە
نەرم بکشینە.
لێ ئەزێ دێنا خوە
بدم ڤێ ڕۆژا خوەش،
کا کێ یە ڤر بەدەو
تو یانێ ئەڤ سبە؟
سبە تێن و دچن،
حەزار جوورەنە ئەو،
حەزار ڕەنگی.
منرا تو لازمی،
چاوا سبا هەرتم و ئامن،
یا کو توجار، توجار
ڕەنگێ خوە ناگوهێزە.

١٩٧٦

***

ئەڤ دەڤ و لێڤ
گەرما لێڤێ تە ڕند زانن،
ئەڤ دەست، ئەڤ دەست
ڕجافا سینگ بەرێ تە نوور
زەعف ڕند زانن،
وی دلی، کو سەر ڕێنگا دوور
تمێ تەڤی من دەمەشە.

١٩٧٦

## مینا کەڤا دێست

تو کەڤا دەستێ من دبینی؟
ئەز نها مینا کەڤا دەستێ خوە
بەر تە مە تەمام – بێ سور، ڤەکری،
ب دلێ قورنا بیستی خولقی،
کو بەر تو کولا دلسار نامینە.
ب دلێ خوە ڕووت ئەز نها بەر تە
هـم قەواتم، زۆر و هـم بێکۆمەک،
شووڕێ خوە دەرخە و دلێ من خە،
دەربا شووڕێ تە دبە بۆنا من
ڤە خەدار نیبە،
لێ تو دکاری گلیکی بێژی
و پێ گلیکی بکوژی تو من،
لێ تو دکاری گلیکی بێژی
و پێ گلیکی دنێ بدی من.
ئەز نها مینا کەڤا دەستێ خوە
بەر تە مە تەمام تەنێ، بێکۆمەک،
پرسێ حوبێدا ئەز نزام کێ مە،
دەستێ تەدانە میر بم، یانێ قوول،
لێ پرسێ دندا مەرڤم عەسە.

١٩٧٦

***

ئیرۆ کەسری بووم، ئەز ژ گەرما ڕۆژێ،
و ئیرۆ کەسری ئەز هاتم مال،
و ڕێدا لنگێ من تۆز دخوەرن.

و تو ناڤا گونێ ئێڤارێڕا هاتی،
و تو بخوه سەری حەتا لنگا سووجکار،
تە پرتی سلاڤ ژی قە نەدا من.

همبەری تە دها ڕمحم بوو ئێڤار،
ئەوێ هێنکایا خوه کرە تامارێ من،
و دینج بوو قاسەکێ خوونا من گەرم.

تو چقاس برمڤی، تو نارمڤی ژ خوه،
بەر من قورە دبی، لێ فەقیری بەر خوه،
تو زانی ئەز کێ مە، ئەز کێ مە بۆنا تە.

تاری وێ تیر دبە و دبینم ئەز ڕند
بەژنەکە ڕووت تەعزی ناڤا تارییێدا
ڕۆکێ سپی دکر و بەر ب من دهات.

١٩٧٦

## ڤیزەکە دەلال

ڤیزمکە دەلال پەنجەرا همبەر
دینا خوه ددە پەنجەرا مە بەر،
ڤیزا سالەکێ کورێ من چووکتر
ئێپێجە ومختە شەرمۆکە، ب ترس،
دینا خوه ددە ل پەنجەرا مە،
ئەز زانم، چەعڤا ئەو کێ دگەرە.
بۆنا دلێ وێ نازک نەکەڤم،
خوه ئوسا دگرم، قەی وێ نابینم،

نکارم بێژمێ، ومکی کورێ من
نە مالە، بلا نەگەرە وی ڤر.

لێ قیز دزیڤا، ب سەبر، گومان
دینا خوە ددە پەنجەرا مە لال.

لۆ، دلۆ، بێژە، تە کی دەرێ هشت
پەنجەرا خوە نوور
و قیزا مینا ڤێ قیزا دەلال
ژ وان سالێ دوور.

١٩٧٦

***

سەر دارا ڤرا
ئەشق شابوونا من
سێڤ دبرقن.
بلا قیز و کور
بێن شابوونێ من
سێڤا بچنن.
بلا ئەو شابوون
دلێ واندا نوور
هەلوونێ بەخت و مرازا چێکن،
و حەتا رۆژا پەسناندنێ
ژ وان هێلوونا
بلا چڤیکێ شابوونێ دەرێن،
بفرن، داینن
سەر دارێ سێڤا،
وان دارا خوەی کن،
وەکی سێڤێ سۆر

شابوونا دلا
تمێ برق ڤەدن.

١٩٧٦

## بێیی تە

دخوەزم ئیرۆ مێڤانێ تە بم،
تو تەگلیف ناکی.
ئیرۆ ژی ئەزێ تەنێ بم هەمن.
چقاس نە پاکی.

ئەزێ هەرم جەم وان دار و کۆلا،
کو مە ناس دکن،
و ڤێ ئێڤارێ ئەوانا بلا
بەعسا تە بکن.

بلا پستەپست بکەڤە ناڤ وان،
ناڤێ تە هلدن،
ئەز وانا سەکم ب دلێ حەیران،
بیرا تە بکم.

و بلا ئێڤار درێژ بە بێی تە،
تێ ژی وێ دەمێ
پۆشمان بی بۆنا خەبەرێ خوە تەعل،
کەچێ، بێ ڕەعمێ.

١٩٧٦

## کەلەشۆ ، جانۆ

چما دهێلی،
کو حەمێز کە من ئەڤ سر و سەرما،

کو بایێ بێشەرم
سوورەتێ من سۆر دیسا ڕامووسە،
ئەز شەرما بگریم،
و هێسرێ من هێ سەر سوورمتا
لاپ بقەرمن
و، چاوا گوهار،
ژۆردا بێنە خار.

کەلەشێ، جانێ،
تو چ بێ فەعمی،
خشیمی چقاس،
من نزانبوو چەعڤێ دلێ تە
کۆرن تا نها.

١٩٧٦

***

ژنە. بەدەوە. دمەشە.
دێنا خوە بدنێ، وێ هەرە.
خوون تامارادا دکە شەر،
دلێ، ئەڤ چی یە، چ شەرە؟

جیدا مخ بوومە، نالەقم.
لێ ئەو بەدەوا دوور کەت، چوو،
شکلێ وێ هلدم، خومیی کم
چەعڤادا بۆی ڕۆژێ مەلوول.

بلا سلاڤێ نەدە من،
لێ دل ڕازێیە کو بێخەم

دژی و دمەشە ل دنیٚ
ژنەکە دەلال و بەدەو.

١٩٧٦

## بینا بنەڤشیٚ

بهاریٚ باقە بنەڤش دایە من،
بینا تە نینە کو ڤیٚ باقیٚ تیٚ؟
ئەز ئیدی مینا بەریٚ نە خامم،
و تو ژی ئیدی زوودا بوویی دیٚ.

گەلۆ کەنگیٚ بوو؟ بهار بوو، ئێڤار،
جنا کەتبوون بلبل کۆلادا،
لنگیٚ مە هەڤڕا ببوونە هەڤال
و خوەڕا دچوون کیٚ زانە کودا.

بینا بنەڤشیٚ پۆریٚ تە دهات،
دەستیٚ مە فەسال هەڤدو دکەتن،
و مە قە نەدیت چاوا هیڤ هلات،
سییٚ مە دوو مەڕا بیٚ زار دهاتن.

مە فەعم نە دکر، زاریٚ دلیٚ خوە،
مەڕا بەس بوو، کو ئەم هەڤ ڕا دچن،
دۆر مە پێل ددا ئێڤارمکە خوەش،
نزام کیٚ چۆلیٚ دادابوو کوچک.

بینا بنەڤشا گەلۆ کیٚ دا تە،
ئەز سەرخوەش بووم ویٚ بینیٚ سەرانسەر،
قەی بێژی ئاڤا بنەڤشیٚ دا تە
شووشتبوو گولییێ خوە یە زێر و زەر.

ڕێ درێژ بوونە ژ وێ ڕۆژێدا،
هەر کەس عەمردا ب ڕێنگا خوە چوو،
و تە ژ عەمر پارا خوە هلدا،
ئەز ژی بۆ یەکە دنێ بووم مەجنوون.

بهارێ باقە بنەڤش دایە من،
بینا تە نینە کو ڤێ باقێ تێ؟
ئەز ئیدی مینا بەرێ نە خامم،
و تو ژی ئیدی زوودا بوویی دێ.

١٩٧٧

## سبا بهارێ

سبە سافی دبە، چاوا عەجێب،
و وێ دەما شیرن گونێ من تێ
ژ خەوا هنگۆری هشیيارکم تە،
چمکی تو ژی ب خوە عەجێبی وێ دەمێ.

و زار ژی مینا تە خەوا خوەدا شیرن
نەرم دکەنن. ئوسا بێ کۆمەکن، بێ خەم.
من ترێ ئەوانا مینا دارێ شینن،
ژ کیژانا تەزە کووڤی بوون خەون و خەو.

ویتەویتا کێ بوو، کو من بهیست نها،
ئاخ، چووکا من دەلال، سبا تە خێر،
دمرڤا دارێ سێڤا کولیلک دانە دها،
بلا کولیلکێ وان گشک ببن سێڤێ زێر.

سبە سافی دبە، چاوا عەجێب،
و تەمزە عەزمان، مینا کەنێ زارا،

ڤەدبن هەر دەرا چەعف پەنجەرێ بازێر.
باکی نەرم دمەشە ناڤا دارا.

١٩٧٧

## حوب

وە گۆت: - بێ حشە،
ئاقلسڤکە.
دە هشبن، هشبن،
دل زانە چکە.

ملک - مالێ دنێ
هوون خوەرا هلدن،
دەوسێ بدنێ
چار ستارا دل.

دلی ئاقلە،
ئیشێ خوە زانە،
بۆنا وی کولە
گلییێ نەزانا.

کەڤرێ پێشا خوە
وێدا باڤێژن
دو دلێ بێ خەم
بلا نەئێشن.

١٩٧٧

***

ڤیزا گهیشتی بوو،
لێ ئەز هەلا خشیم.

جارنا ئەز ب شوخول
دچوومە مالا وان،
و وەختێ وێ دەمێ
کەس تونە بوو مالێ
وێ ئەز پاچ دکرم
و پێرا سۆر دبوو،
وێ دەستێ من ددا
سەر سینگ و بەرێ خوە
و حەمێزا وێ دا
من خوودا.

وان سالێ دوور و خوەش،
هێ خشیم و نەزان،
هاژ پێ تونە بووم ئەز،
کو چنە ڕامووسان
و مەمکێ قیزان.

١٩٧٧

***

دەرەوا نەکە. بەختەوار نینی.
کوباری، زوودا وێ یەکێ زانم،
ئیرۆ تو بەر من کول و برینی،
خوە ڤەنەشێرە، ئەز تە ڕند زانم.

بارێ خوە گران نەکە تو بادە،
یەک یەکە، دودو کۆمەکە عەسە،
هەڤالتیا مە وا ئیزنێ ددە،
کو تەڕا بێژم: - مەگری، بەسە.

بۆنا تە توجار نەبوومە کادە،
ئەز نانێ ڕەشم بۆی ڕۆژێ گران،
پێ نانێ خوە ڕەش هاتمە بال تە،
کو تو نەبهێیی خەبەرا "دێران"...

هەڤدو نابینن ب مەها، سالا،
ئەم هەڤ بیر ناکن ڕۆژێ ئۆغرمێ،
هەڤڕا بێقەلپ بن، ئەم منا زارا،
ببن پشت و مل هەڤڕا، چاوا مێر.

١٩٧٧

## کوچکێ خوە تو دادە

من نزانبوو، کو حوب و ئەڤین
کێف و لیستکە بۆی تە عەمردا،
جاهالتییا خوە تە کرە هەڤیر،
لێ تە نانێ خوە نەپەت وەختێدا.

هەڤیر ترش بوویە، سار بوویە تەندوور،
خەونا لیستکا حوبێ بوهوری،
تەک بیرانین مان ژ وان ڕۆژێ دوور،
مالەکە ڤالا و گلییێ مری.

تەنێیی نها و سەرما دکی،
نە ئۆجاخ هەیە، نە ژی زار تێدا،
تو هێ گومانی، وەکی یەک بەلکی...
نا، کوچکێ خوە گۆتی تە دادا.

١٩٧٧

## تو فەسال هەرە

ناڤ کولیلکارا تو فەسال هەرە،
کولیلک خەبەرێ دلێ ئەڤینن،
کو ڕژییانە ڕۆکێ ڤان دەرا
و نها بۆخز و بینا خوە تینن.

هەرکە تو ڕۆکێ کولیلکا تەمکی
هنەک شیرنن، هنەک ژی تەعل،
ناڤا کولیلکا دبە تو فەعم کی،
وەکی حوب تمێ شرینە و تەعل.

دەور و زەمانا دلێ ئەڤیندار
گلیی تەعل، شرین گۆتنە هەڤدو،
ئەو گلی بوونە کولیلکێ دەلال،
ناڤ کولیلکارا فەسال هەرە تو.

١٩٧٧

## خەونێدا

و ئەز خەونێ دا کورێ پادشێ بووم...
من نە لازم بوون تەخت و پادشاتی،
من نە لازم بوون، ئمەرەت، خزنە،
منرا حوبا وێ کەچێ لازم بوو،
یا کو زانبوو گەرمایێ بدە،
وەختا سەرما بوو،
یا کو زانبوو هێنکایێ بدە،
وەختا دەرڤا ڕۆ چەم دکر حمام،
یا کو دلێ خوە دکر دلێ من

و دو دلێ مه دکر دلەکی
دو بەدمنا دا.

منرا حوبا وێ کەچێ لازم بوو،
لێ کەچ نە ڤر بوو،
کەچ ڕەڤاندبوون
و کەچ بربوون پش حەڤت چیایێ دوور،
پش حەڤت بەرێ کوور،
و من هشتبوو تەخت و پادشاتی،
و من هشتبوو ئمەرەت، خزنە
و پەی هەوارا حوبا خوە دچووم.
ڕێدا کەتبوو هەسپێ من ئامن،
لباس و مداس
کەتبوون دلقێ فەقیرێ دنێ،
لێ دلێ مندا دلێ کەچێ بوو،
ئەز شەڤ - ڕۆ دچووم،
کو دەستێ دێوێ فرندە و هار
خلازکم حوبا وێ و حوبا خوە.

لێ ئاخری چ بوو؟
وێ چبە، برا.
دێو گۆڕ ب گۆڕ کر،
سەرێ وی بەکاند پش حەڤت چیایێ دوور
و شووندا ئانی من دۆستا خوە نوور.
لێ تەخت، پادشاتی؟
ئەزێ چ ژێ کم ئمەرەت، خزنا،
وەختا کەدا من ناڤ واندا تونە،
ئەز دەولەتی مە ب دۆستا خوەڤا،

یا کو دلێ خوە کرە دلێ من،
یا کو دلێ من کرە دلێ خوە.

١٩٧٧

## شکلێ تە

تو تمایی، بەلێ،
شکلێ خوە نادی من،
لێ ئەز زوودا بوومە خودانێ شکلێ تە.
تو هێرس نەبە، گدی،
نەچوومە مالا تە،
و هەرکێ نەچوومە،
دێمەک نە دزییە تو تشتەک ل ورا.
لێ شکلێ تە بال من، تو باوەرکە، هەنە،
نیشانی تە بدم؟
لێ گەلۆ دکاری وان شکلا ببینی،
وەختا کۆری ب خوە.
دە کەرەمکە، بنهێر،
چەعفێ خوە بکوتە ڤان چەعفێ من مەلوول،
تە شکلێ خوە گەلۆ ور نەدیتن؟
هەر چەعفەکی مندا شکلەکی تە هەیە،
کێ کۆر نینە عەسە دبینە وان شکلا.
و شکلەک ژی هەیە، کو چەعفا نابینی،
من ئەو ڤەشارتییە دەفا سینگێ خوەدا،
و مینا دلێ من ئەو شکل هشییارە،
و مینا دلێ من ئەو شکل ڕانازێ.
خێێن ژ وان سێ شکلا تشتەکی من تونە،
کاری من بستینی تو وان شکلا؟ ١٩٧٧

## دەما نەبیرکری

ئەز تەنێ دمەشم،
دل بێ خەم، بێ شکە،
پاییز سەرما دکە.
دۆرا من کەر و لال
ژ دارێ بەلگەکی شل
کەت سەر سوورەتێ من،
چاوا راموو‌سانا
خاتر خاستنا دل.

تو هاتی بیرا من،
لێڤێ تە گەرم، ئاگر،
و وێ پاییزێ ژی
مێشە سەرما دکر.

لێ ئەم هەڤرا دچوون،
دەستێ مە بوون هەڤال،
لێ ئەم هەڤرا دچوون
ناڤ مێشێ کەر و لال.

و تە ترێ دنێ
ئوسا خوەشە، عەزیز،
ئوسا فرە، عەدل
ناڤ دارێ رووت تەعزی.

هەما بۆی وێ دەمێ،
وێ دەما خوەش، عەدل،

هێژا یە کو حزکن
وێ پاییزێ ب دل.

١٩٧٧

## هزرەت

و ماشینە دچە
و زارێ تە دبە،
و ژنا تە دبە
شەهەرێ دوور.
تو دمینی تەنێ،
تەنێ دنیا ڕۆندا،
و تو ناچی مالێ،
تێ هەری مالێ چ؟
لنگ نە لنگێ تە نە،
ئەو لنگ ئەوارە نە.
ڕێ بۆنا وان شا نە، -
ها بگەرن.

دمم تێ و ئەوارە
ستارێ دگەرە،
ئەوێ کودا هەرە،
تێدا حال نە مایە.

تو ڤەدگەری مالێ،
ڤەدگەری جەم لالێ،
کو هاتییە مالێ
دەوسا ژن و زارا.

حالێ تە نە حالە،
مالا تە نە مالە،
نانێ تە نە نانە
بێ ژن و زار.

گەرما هاڤینێدا ڕۆژ دەرمنگ دحەلن.

١٩٧٧

## ستوونا من

ژن ستوونا مالێ یە.
تو چوویی مالا من هەدمی،
و نها ئەز بێ مال،
سەر ڕێنگێ دنیایێ
ئیزا تە دگەرم.

تو چوویی،
ئەز بوومە هێسیرێ دلێ خوە،
دلێ من ناهێلە ئەز ڕازێم،
و شەڤا من ترێ
عەزمانێ ب ستەیرا
لێ لێ یە سەر مندا بێ خارێ،
تو ڤەگەر ستوونا من.

١٩٧٧

## خەونا ب خێر

و ئیشەڤ خومام بوو، گەرم،
و ئیشەڤ باران باری،

دەرکەتم، بارانێ نەرم
ئەز شووشتم شەڤا تاری.

و پاشێ ئەز خەورا چووم،
خەونێ دا هاتی بال من،
مەزن بوو مالا من چووک،
سۆهبەت کر مە هەڤڕا ڤر.

و بهیست خەونێدا من
دوکوتن دەرێ مالێ،
ڕابووم، من دەری ڤەکر،
تو بوویی کارخەزالێ.

خەونا من ئیشەڤ خێر بوو،
خێر هاتی، سەر چەعڤێ من،
تو سەبرا دلێ من کوور،
حسرەت و دەلالا من.

١٩٧٧

## پاییز وەفات بوو

پاییز وەفات بوو و زڤستانێ
کەفەنێ سپی ئاڤیتە سەر،
گوهێ مندا ما دەنگێ بارانێ،
بیرا مندا ما ئێڤارا سار.

شڤەرێ مرن ناڤ تارێدا،
دەوسا لنگادا گۆل دبوو ئاڤ،
ژ هەڤ خەیدین و مە سۆز نەدا
کو ڕاستی هەڤ بێن. دل مان بێ جاڤ.

پاییز وەفات بوو و زڤستانێ
کەفەنێ سپی ئاڤیتە سەر،
تو لەز نەکەڤە ئەڤ دلێ هانێ
هێ نەمرییا بۆی کەفەنێ سار.

وەرە گونێ خوە نەدنە رووێ هەڤ،
تو بۆی من دژی، ئەز بۆنا تە،
بەرف دبرقە بەر هیڤا ئیشەڤ،
بێخەوتییا من ناڤێ تە ددە.

١٩٧٨

## بهێلە ئەز مینا خوە بم

تو ژ گلیێ من باوەر بکە،
گلیێ من تە ناخاپینن.
ئەز تو جارا سۆز نادم تە،
وەختا زانم، کو نکارم
وی سۆزێ خوە بقەدینم،
تو ژ گلیێ من باوەر بکە.

حەموو رۆژ نە مینا هەڤن،
چ کو دەستێ من دوهـ دهات،
ئیرۆ نکارم ئەز بکم،
ژ پش شەهەر دوهـ رۆ هلات،
ئیرۆ خەیدییە ژ من،
حەموو رۆژ نە مینا هەڤن.

بهێلە ئەز مینا خوە بم،
زۆرێ نەدم دلێ رەبەن،

قوره نەبم بادی هەوا،
ئەز بمینم بێقەلپ، حەلال،
بهێله ئەز مینا خوە بم.

١٩٧٨

## تا تو هەیی

ڤێ رۆژا گەرم،
وەختا سی ژی خەرقیە بن دارێ دا،
من حەمێز کە ب هێنکایا بەدەنا خوە،
گورین-گرمینا شەهەردا
منرا خەبەردە ب زارێ هشبوونێ تو،
و چەعڤێ تە بلا سەر من
بن عەزمانێ سووت، سایی،
و تلیێ تە نازک، درێژ،
شڤێتا بێ،
بلا هەڤ خن پۆرێ من رەش.
تا تو هەیی،
باوەر ناکم، وەختا دبێن،
کو ڤر - دەرەوە حوب - ئێڤین.

١٩٧٨

## خەونێدا

خەونێدا بهیست، وەکی دگرین،
و ئەز نکارم بێم هەوارا تە،
خەونێدا گری ڤەی ببوو برین،
رەحەتی نە ددا دلێ رەبەن.

و ئەز نکارم ژ جی بلەقم،
چما گرانن هاقاس دەست و لنگ،
نە ژی دکارم دەڤێ خوە ڤەکم،
بێن دفەتسە ناڤا دەفا سینگ.

تو هێ دگرییی. ژ خوودانا شۆر
چەعڤ دشەوتن و کۆر دبم ئەز،
ئوسا بێتاقەت، بەلەنگاز و کۆر
ناڤ خوودانێدا هشییار دبم ئەز.

دەرڤا شەڤە و باران دبارە،
و با دکوتە پەنجەرە، دەری،
سەر بەدەنا من خوودانا سارە،
من ترێ دەرڤا تو دگرییی.

١٩٧٨

## ژ ئێر – مسکەنێ زارۆتیێ هات

ژێ دهات بینا پنجار، پیڤازا، پەنێر، شەراڤێ،
ژێ دهات بینا خوەلیێ و بێ، گیهێ و ئاڤێ،
هات و سلاڤ دا، سەردا ڕاموسا وی سەرێۆرا خوە،
و ژن ژی شا بوو بۆنا بەشەرا مێرێ خوەیی خوەش.
– ژنێ، ئەز ڕاستی زارۆتیێ هاتم، ئەو چ بوو، ژنێ،
هێسر بارییان ژ هەردو چەعڤا، چ خوەش بوو دنێ.

عەزمان چ ڕەعم بوو، ئەز شل نە کرم ڤێ ڕۆژا
عەزیز،
کانی چ سار بوو، تەیرا دستران ب دەنگەکی
زیز.

– ژنێ من چ کر، من نکاربوو وێ دەما
شیرن
زارۆتیا خوەرا دلساخ خەبەردا، بێ کول و
برین،
من بیر کربوون گلیێ بەرێە بێخەم و زەلال،
من بیر کربوو چاوا من هنگێ دکر گالەگال.

دیسا ئەو جەو بوو، دیسا ئەو چیبیا، ئەو مێرگ و
چیمان،
لێ ژ وان گشکا شەهەردا بۆی من قە تشتەک
نەما،
دووری مسکەنێ زارۆتیا خوە ئەم مانە ئێتیم،
ژنێ، چ جابێ ئیرۆ ئەز بدمە دلێ خوەیی تی.

و مێرک ڕوونشت، ژنێ سەرێ وی دا سەر دلێ خوە،
و مێرک دبهیست، چاوا دلێ وێ زوو–زوو دکوتە،
و فەعم کر مێرک، کو ژنا وی ژی، مینا وی نها
وان ڕۆژا تینە بیرا خوە، ئێد کو بوهورینە دها.

١٩٧٨

## ئوسا دخوەزی

ژ شابوونا هێشین
دار و کۆل ئیدی جنا کەتنە،
هەر سبە ڤرا تاڤەکە شرین
پۆرێ خوە زێرین چەمادا دشۆ.
پیڤۆنگ و بنەڤش
چۆلێ هاتنە
و ناڤ شەهەردا نها دگەرن،

گیها هەر دەرا
خالیچێ بەدەو، زمرووت چێ دکن.

جەم تە، شمالێ،
بەرفێ تا نها
سەرێ خوە دانیە ل بەر دەرێ تە،
خوەرا کەتییە خەوا هنگۆری،
لێ ژ وێ بەرفێ
ئیدی بین بۆخزا خوەش بهارێ تێ.
لێ هەلا سارە و بەرفە هەلا.

ئوسا دخوەزم ئەز بێمە بال تە،
بێمە شمالێ،
و ور بهارێ
ژ خەوێ ڕاکم،
حەموو پەنجەرا، دەرێ تە ڤەکم،
بکەڤم مالێ
و ب دل بێژم:
- بهارا تە خێر!

١٩٧٨

## ڕێ هیڤیا مە یە

سبە چەعڤێ خوە ئانجاخ ڤەدکە،
سبە شێلوو یە، مەلوولە سبە،
دە، عەزیزا من، تو تەشتێ چێکە،
چ کاری بکی،
ئاخر سبەکە ئوسا ژی دبە.

سەری ئەوە، کو ئیدی سبە یە،
تشتەکی ناکە، وەکی هێ شلە،
دە، ڕابە، هەرن، ڕێ هڤیا مە یە،
و ڕێدا ئەمێ
ڕاستی ڕۆیێ بێن-شابوونا دلە.

١٩٧٨

## شابوونا دەرەنگ

چما ئەم وەختێدا ڕاستی هەڤ نەهاتن،
و چما ڕێنگا مە هاقاس درێژ کشاند،
و عەمردا مە دیت هاقاس ڕۆژێ چەتن،
یازیێ ئەڤ شابوون چما ها دەرەنگ شاند.

دنێدا تو دژی و ڕوحێ تە تمێ
ڕوحێ نێزیکی خوە دگەرە هەر دەرا،
سال تێن، دەرباز دبن و سال سالا دزێن،
و سال چقاس تشتێ عەجێب تینن تەڕا.

چقاس مەرڤێ هێژا تەڕا دبن هەڤال،
و چقاس دەمێ باش ژن بۆنا تە تینن،
چقاس عەرد دبینی، چقاس چیبا و نەوال،
و دبهێیی چقاس گلیێ ب دل شیرن،

لێ سەر ڕێنگا وەعدە تمێ وێ دگەری،
کو دلێ خوە بکی تو ناڤا دلێ وێ،
کو ناڤ ڕوحێ وێڕا ڕوحێ تە ژی هەرە،
دەنگێ خوە ببهێیی سەر لێڤێ وێ.

و تو وێ دگەری و نزانی، کو ئەو
بەختێ خوە دنێدا دگەرە مینا تە،
دنێدا هوون هەنە، هاژ تونەنە ژ هەڤ،
هوون بۆنا هەڤن خووت، بەخت پارا وە نادە.

چقاس نەهەقە بەخت، چقاس بێحشە ئەو،
وەکی هەڤ دوور دخە وان ڕوح و دلێ تی،
ئێد کو خولقینە دنێدا بۆنا هەڤ،
دپەرتن بێ هەڤ چاوا ئێتیم.

بهار، هاڤینا خوە مە دمرباز کر بێ هەڤ،
نها پاییزا مە کلاما خوە دستریێ،
لێ بۆنا مە نها شرینە تەعڤ،
لێ بۆنا مە نها دها سڤکە ڕێ.

١٩٧٨

## لێ کا دخوەزی

ئەز ئارتیست نینم،
وەکی بکەڤم دقێ مەریێ ئەشق،
لێ ڕاستی شا مە،
وەختا کو جیکی ئەز تە دبینم.
ئەز هن نەبوومە،
و ئەز نکارم بکم قارەقار،
کو بێ حەد شا مە بۆی دیتنا تە.
شابوون هوندورێ دلێ مندانە،
و هەرکێ ڕۆکێ بخوەزی عەسە
دێنا خوە بدی چەعڤێ من حسرەت،

تێ وان چەعڤادا
شەوقا وێ ئەشقێ عەسە ببینی.
لێ کا دخوەزی تو من ببینی؟

١٩٧٨

## چەعڤ

قەرچمێ تەدا وەعدە دکشە،
وەعدە شۆڤ دکە سوورەتێ ژێندی،
بەر خوە نەکەڤە، هێ هەنە جۆت چەعڤ،
کو خوەیی دکن، شکلێ ڕۆژێ دین.

تا ئەو چەعڤ هەنە، هێ جاهلی تو،
حوب قەبوول ناکە، تو کالتی، پیرتی،
بلا ئەو دلێ سار بەر خوە کەڤە،
کێ کو خێنجی خوە تو عەڤدەک نەدیت.

١٩٧٨

## وەرە

"سالێ وەرە، سولتان بە،
مەها وەرە، مێڤان بە
هەڕۆ بێیی بێتەعم بە..."
وا دبێن، لێ ها نابە.

کا ئەو بەخت کێ دایە من،
کو ڕۆکێ تو، پۆری چوور،
ڤەکی دەرێ مالا من
قەستا تشتەکی بچووک.

و ئەز بێژم: - سەر سەرا،
سەر چەعفێ من تو ھاتی،
بلا مالا من تەڕا
ببە ھێلینا شادی.

و ببینی تو ڤرا
نێتا دلێ ڤیزانی،
ئەز تێر نەبم تو جارا
دیندارا تە نازانی.

"سالێ ومره، سولتان بە"...
ھەڕۆ ومره بلا دل
قوربانا وان لنگا بە،
وەکی وێ بێن مالا من.

١٩٧٨

## بۆنا بیرانینا لاڤرێنتێڤا ئێ

ئیشەڤ دیسا خەونا خوەدا من تو دیتی
جاھل و کاو، بەژنبلند مینا بەرێ،
ڕۆژە خوەش بوو، تەبیەت جنا دکەت ئیدی
ژ بین-بۆغزا، ژ ڕەنگ دەنگێ بھارێ.

عەید بوو، شایی، جماعەت دچوو ب کەن، ستران،
من تو دیتی ناڤا قەلفا کەچێ نارین،
من خوەست، وەکی ناف وێ شایێ، عەیدا گران
من ببینی، گازی من کی ب دلباری.

تە ئەز دیتم، سەر پەر-باسکێ ئەشق و شایێ
ڕەڤی ھاتی تو بەر ب من-سڤک و ژیر،

دکی گازی، لێ دەنگێ تە دوور ڤا نایێ،
وەختا ڕەڤێ دەلملە دێرێ تە چیل.

و تا نها تو دڕەڤی، ناگهێژی من،
و نکارم بێم پێشییا تە ئەز تا نها،
دەربێ یازی–مقەدەرێ چ بێ ڕەعمن،
ئەڤ چەند سالە ژ تە تونە تو جاب دها.

ئاخە سارە و بێ زارە. ئاڤ سالارا،
ئاڤ خەونارا، دلێ مەڕا تێیی ب ئەشق،
و ئەم دبهێن دیسا کەنێ تەیی زارا،
لێ ڕۆژ بێی تە نابرقە، وەک بەرێ گەش.
١٩٧٨

## بەتالن شڤەرێ

ئەز دەنگێ هشبوونێ دبهێم
ئێڤارە، چرچرک دسترێن.
تە سۆند خوەر، تە گۆت: – ئەزێ بێم...
بەتالن حەموو شڤەرێ.

فەعم ناکم ژ تە ئەز توجار،
فەعم ناکم تو چ دخوەزی،
ڕۆژەکێ دگریی بێچار،
ڕۆکێ ژی ئەز دبهێم کەنێ زیز.

ڕۆژەکێ خودێ مە بۆی تە،
ڕۆژەکێ ژ من دڕەڤی،
ستەیر و هیڤ مەلوولن بێی تە،
وەختا تو ڕەخ من ناکەڤی.

نشکێڤا تو تێیی بال من،
و بۆی من جنەتێ تینی،
سۆز ددی، سۆزێ خوە، هەمن،
داڤێژی، کی زانە، کی ئالی.

ئەز دەنگێ هشبوونێ دبهێم
ئێڤارە چرچرک دسترێن.
تە سۆند خومر، تە گۆت: – ئەزێ بێم...
بەتالن حەموو شڤەرێ.

١٩٧٨

***

زڤستان وێ سالێ ڕووت و تەعزی مابوو،
عەزمانی تما بوو، بەرف نەشاند بۆنا وێ،
لێ ڕند تێ بیرا من، هنگێ ئوسا سار بوو،
کو دەرڤا قەڕمی شرکا ئاڤێ.

ل قەراخێ باژێر، بەر بایێ سار و دین،
مەحەلەکە تەزە خوەڕا حیم دکۆلا،
و دیوارێ پێشن بلند دبوون ئیدی،
ڕێ دفەتسین ناڤ چەل و کۆلا.

تێ بیرا تە، ڕۆژا لەعدێ ئەم چوونە ور؟
تە گۆت، کو ور مالا مە چێ دکن.
سال بوهورین، سالا خوەڕا گەلەک ئاڤ بر،
و ور هاتن دنێ گەلەک زارێ ئێگن.

ئەم قەتییان ژ هەڤ و محەلا هان دا
مە ڤەنەکر دەرێ مالا بەختێ خوە نوور،

تا نها نزانم ژ کو هات ئەو قەرا.
وەکی ئیرۆ ژ هەڤ ئەم خەریبن و دوور.

لێ ئەو مەحەل دژی ناڤ خوشینا دارا،
ورا دخولقن حوبێ تەزە، ئامن.
سەر وان حوبا شابوون دبارە چا باران،
لێ وێ ئەشق-شابوونێ تشت نامینە بۆ من.

١٩٧٨

## گونێ من نینە

گونێ من نینە،
وەکی ئەز ئیرۆ بیرا تە دکم،
گونێ من نینە،
وەکی من بەر تە دلێ خوە ڤەکر.
دنێ ئالەمێ رێ گەلەک هەنە،
ئاخر تە چما ڕیا خوە نە گوهاست،
ئاخر تو چما ڕاستی من هاتی،
وەکی ئەز ئیرۆ بیرا تە بکم،
وەختا بەرێ خوە نادی من ئیدی.

١٩٧٨

***

و وەختا تەڤی وانا نینم ئەز،
هەر تەنێ بۆی خوە دارێ شین دستریێن،
مسلەعت دکن هەڤڕا دارێ شین،
ڤەی ئەز تونەمە،
و دەست نەدایە من بەدەنا وان،
حەمێز نە کرییە ئەو بەدەن توجار.

لێ ئەز نکارم شڤێتا دارا.
پاشلا تاریيا تەنێتیا خوەدا
ئەز کلامێ وێ حسرەتێ دسترێم،
کو من دگهینە هەیلۆ دلێ تە.

ئەز نە کو خوەرا،
لێ تەرا تمێ مسلەعت دکم،
تەرا دکەڤم تمێ حوجەتێ.
وان حوجەتا دا
هەر گاف و سەحەت ئەز دباخشینم،
چمکی ئەز ب تە، ب نوور، ئاڤا تە
دنێدا دژیم.

دەرڤا پاییزە،
دار دکن خشین،
تەنێتییا من وێ خشینێدا
ناڤێ تە یی دوور،
لێ ناڤێ عەزیز، هەر دەرا دبهێ.

١٩٧٦

***

گەلەک ژ شێر شووندا نەهاتن مال،
خودێ زانە ل کو سەرێ خوە چێ دانین،
لێ ئەوانا دلێ ژنێ خوەدا دەلال،
شڤێتا هەیکەلێ زییارەت مان.

نە کولێ وان هەنە، نە ژی شەڤێ بێ خەو،
و تو تشتەک رِوحێ وانا نالەقینە،

عەردێ سار بۆنا وان بوو مالا عەزەلی،
ژ کیدەرێ تو کەس بەعسا عەمر نانیە.

و شەڤێ تەنێدا، شەڤێ مەلوولدا لال،
ئێتیم مان بەدمێ ژنێ وانە دەلال،
ئێتیم بوون تەڤی وان شەڤێ درێژ، بەتال،
و کەر بوون نشکێڤا دیوارێ مالێ سار.

و تەسەلە نەبوون گلییێ ئەڤین ئیدی،
بینا مەلوول دهات ژ ڕووێ بەلگیێ نەم،
چمکی خەون-حکیاتێ شەڤێ ڕەشدا زێندی
سێوی مان بەدمێ ژنێ مەلوول، دلخەم.
١٩٧٦

## پۆشمانبوون

دوور کەتم، وەکی بیر بکم یەکجار،
لێ دوورڤا دها بیرا تە کر من،
کرە زارەزار دلێ منی ژار،
قەلپ، بێحش دەرکەت دوورکەتنا من.

کێ مە، چما ئەز ب خوە نزانم،
چ ژ خوە دخوەزم فەعم ناکم، وەڵە،
دوور کەتم، وەکی تو خوەش بی، جانم،
دەوسێ دکوژم هم تە و هم خوە.
١٩٧٨

***

هاقاس برچی بوونێ،
تی بوونێ نامرن.

چقاس سور و سەرمێ.

تو هاقاس دوور بوویی،
چقاس کو دوور نینە تاڤا شیرن،
وێ سالێ من ترێ،
سەرما زڤستانێ
بیر کرییە وەڵە، بینە تاڤێ.

گومان ڕۆژێ تەنێ مینا پلتا چرێ،
کو بزر ناستینە،
دتەمری ئیدی.

ئەز نزانم چما عەڤدێ خوەدێ جارنا
ئوسا جنوو دبن،
کو خوەڕا نابینن تو ڕێ و درب.
وێ سالێ ئەز بێ تە
خووت یەکی ئوسا بووم.

پاشێ، وەختا ئیدی تاقەت مندا نەما،
وەختا ترسا کەدەرا دلێ من
چەم قەڕمی،
لێ شەڤ ببوو هشبوونەکە سپی،
نەوێربوو کو گلیکی بێژە،
من دیت کو تو تێیی.

تو هاقاس دوور بوویی،
من ترێ پریسکی ناڤا جەهانێدا،
لێ ئەو پریسک بەس بوو،
کو سەقەم ڤەکشە،

کو ڤێنەسە چرا،
و چەمێ قەڕمی سەر خوەدا بێ.
شەڤا لال خەبەردە.

وێ سالا دوور، درێژ هاتنا تە
بوو عەیدەکە مەزن بۆی دلێ من،
ئەز نەمرم ژ وێ سور و سەرمێ،
کو بێ تە گرتبوو دۆرا دلێ ڕەبەن.

وێ سالێ دگۆتن،
کو ئەز دینم.
دە بلا ئوسا بە،
ئەز مقابل نینم،
هەر تەنێ تو هەبی
و سافیبی سەر من چاوا سبە.

١٩٧٨

ڕێداکتۆر: سەحیدێ ئیبۆ
شکلکێش: س. هامبارزوومیان
ڕێداکتۆرێ بەدەوەتیێ: گ. خ. گیولامیریان
کۆرێکتۆرێ جابدار: میکائێلێ ڕەشید

## فەرهەنگۆک

١. ب تەعن کەنیا: ب ئاوایەکە نەخوەش کەنیا
٢. باباخ: قوورە
٣. باتنی: تشتەکی ژیانا ریالدەر
٤. باج: پەنجەرە
٥. باخچەنگێ دل: باخچێ دل
٦. باخێ تۆرکری: باخێ سوور کری، دەردۆرێ سوور هاتیە چێکرن
٧. بادە: بێ واتە
٨. باژارێد تارم – تاخکری: باژارێد وێرانکری
٩. (حيى الموقورون من الإزيديين): باڤچاکێن ئێزدیان پانتەبدە:
١٠. باگەر: باهۆز
١١. بحنجرینە: بحەجقینە
١٢. برانگ: برا
١٣. برنۆتی: تتوونا تۆز
١٤. برەک: ژ بەڕین هاتیە، ژبۆ برینا تشتان
١٥. بریگاد: دەستە (رووسییە)
١٦. بزر: زێت
١٧. بلبلزەرک و قەرەچیچەک: ناڤێن کولیلکانە
١٨. بناتارا چییێ: کێلەکا چیێ
١٩. بناڤ: گیها
٢٠. بنداررووک: سەیرانا کەچ و بووکان
٢١. بنەلی: نشتەجی
٢٢. بەتا ڤەبوونە: وندابوونە، نەمانە
٢٣. بەترپێر: دو رۆژ بەرێ
٢٤. بەدرەنگی: رەنگێ خراب
٢٥. بەرات: نیشانەکە پیرۆزا نۆلا ئێزدیانە

٢٦. بەربات بوو: تێکچوو
٢٧. قرة العين: بەربین: ئاراميا دلان
٢٨. بەرپال: بەريالا چیایێ
٢٩. بەردیر: میا زکێ یەکەمین بزێ یە
٣٠. بەز: چەور
٣١. بەست: چۆل
٣٢. بەستوو: یاقە
٣٣. بەشەر: روو ل کەن
٣٤. بەکەم کرن: ب دلێ وان بوو
٣٥. بەگەمە: پێخوەشبوون
٣٦. بەلانگووشک: پشت گوهـ
٣٧. بەلگ: چلۆ
٣٨. بەلەد: زانە
٣٩. بەلەکیا: ئەو دەمێ کو ل هنەک جهان بەرف حەلیە و ل هنەکان نە حەلیە
٤٠. بەلوو: بێلی، دیار، خویاکری
٤١. بەنگی: ئەڤیندار
٤٢. بەیانییێ سەرێ چیا: هۆڤێن سەرێ چیا
٤٣. بوهور: بەشا چەم ئا نە کوور
٤٤. بۆ خەمێ وان پشتۆبری: خەمێ وان دخوە، دکشینە
٤٥. بۆبەلیسک: فزلدوومان، بابەلیسک
٤٦. بۆر: هەسپ
٤٧. بۆرج: ئەرک
٤٨. بۆرینا چێلەکێ: ئۆرینا چێلەکێ
٤٩. بێ بەراتە: تشت پەی نەمایە
٥٠. بێتابەتی: لڤین
٥١. بێجەرکرن: خزمەتکرنا زەڤی
٥٢. بێجوورە: نە خوەشک، کرێت
٥٣. بێخەبەر: ها ژ تشتی تونە
٥٤. بێخەدا خاترێ خوەژ دنیا ڕۆنک بخوەزە: بێ سەبەب خاترێ...
٥٥. بێخوەدێتی: بێ وژدانی، دژی وژدانێ

٥٦. (كسر حاجز الصوت، أنهى الهدوء): بێدەنگی تەڕباند:
٥٧. بێراتب: نە ڕێکوپێک
٥٨. بیشمێرت: جلەکی مینان ساکۆ یە
٥٩. بێڤلا بەرانی: دفنا گر
٦٠. بێقەیدە: تەڤلیهەڤ
٦١. بێکۆمەک: بێ ئالیکاری
٦٢. بێیی سرییا تەنەبم: مرۆڤەکی هێژا یە
٦٣. پاپاخەکی بووخاری: بازارێ بوخارا
٦٤. پاتاراگ: پەیڤەکە ئەرمەنی یە، مەزنترین مەراسیما ئۆلا ئەرمەنیانە
٦٥. پالاس و پوولاس: جلک ملک
٦٦. پتک: کەچا کێمی یەک سالی
٦٧. پرتک: بەشێ بچووک
٦٨. پرتی: پچەک
٦٩. شرارە: پریسک: تریسکا ئاگر، چیکا ئاگر
٧٠. لم یهدر: پست نەدچوون: بادە نەدچوون
٧١. پشتۆڤان: پشتیوان
٧٢. پشرووک: جۆرەکە خوارنێ یە
٧٣. پشمێرک: زێرەڤان، بۆدیگارد
٧٤. ڨگە، هرە، بسە: پشۆ: پشیک
٧٥. پلاو: خوارنەکە
٧٦. غیمە: پلتێ عەورا: پەرچێ هەورا
٧٧. پنگاڤ: جهێ کو ئاڤ لێ بەرهەڤ دبە
٧٨. قماش: پەرچە: قماش
٧٩. پەروازدن: دفرن
٨٠. پەز بەرۆدەنۆ کر: می و بەرخ تەڤلیهەڤ کرن
٨١. پەشمۆردە: نزانە وێ چ بکە
٨٢. پەعتاندن: پژاندن
٨٣. پەلکاند: ژێ ترسیا
٨٤. پەنیرێ ڕیچال: پەنێرێ تێل تێل
٨٥. پورچوو: مرووز

٨٦. پۆخسیدە (پۆسیدە راستە): رەوشەکە خراب، بێ دل
٨٧. پۆخین: خوارنەک ژ ئادر و روون تێ چێکرن ژبۆ ریا دوور کو زوو خەراب نابە
٨٨. پۆزک: بەشێ پێشی یێ سۆلێ
٨٩. پۆسیدە: رەوشەکە خراب، بێ دل
٩٠. پێپەس نەڤن: نەکەڤن بن پیان
٩١. درج: پێپەلینگ: قندرمە
٩٢. پێژگیر: دەستمال
٩٣. پیسۆ (بیسۆ): پاشمایا شەوتاندنا قوماش ژبۆ دەرمانکرنا برینان تێ بکار ئانین
٩٤. مهنە: پێشە: پیشە
٩٥. پیڤۆنگ و بنەڤش: جورێن کولیلکانە
٩٦. پێکەنی: سڤکپێکرن
٩٧. (قماش): پینە: پاچ
٩٨. پێورێن ستێرکان: کۆمکێن ستێرکان
٩٩. تاب: تابا خوە نایینە: ئێدی نکارە
١٠٠. تاپ ناکە: تابا خوە نایینە
١٠١. تارش: باربر وەک: کەر، هەسپ، هێستر، قانتر...
١٠٢. تاریبانا بێزار: تاری گەورک
١٠٣. تاریق: دیرۆک
١٠٤. تاریگەورک: پشتی رۆژچوونا ئاڤا لێ هن دنیا تاری نە بوویە
١٠٥. تالاش: خەم
١٠٦. تالەبەخت: مخابن
١٠٧. تامەتیسک: تشتێن خوەش ژبۆ خوارنێ
١٠٨. تخووب: سینۆر
١٠٩. تراخ: پەیڤەکە ئەرمەنی یە
١١٠. ترپینیا دل: لێدانا دل
١١١. ترمخ: ژبۆ کۆمکرنا گیها، کا، ساپ.....
١١٢. تڤدیر: تدارەک
١١٣. تەرمز: ژبۆ نازدارکرنا کەچان تێ بکارانین
١١٤. تەشی: هریێ یان پەمبوو درێسن
١١٥. تەعریبان: دەما تاری

١١٦. تەعفێ زمرقاند: تاڤێ رۆناهیا خوە ناڤێت
١١٧. تەڤرکۆل: ئەو کەسێ گۆرێ دکۆلە
١١٨. تەکەر: تایە
١١٩. تەلپ: ئەور
١٢٠. تەلیانە: خوە ڤەشارتنە
١٢١. تەلە: دەعفک
١٢٢. تەماشەگەهـ: پێشانگەهـ
١٢٣. تەمز: پاک
١٢٤. تەمژی: خەورا چوو
١٢٥. تەمەنەدان: سەریخوارکرن
١٢٦. تەنگەزارم: خەمگین
١٢٧. تەهەر: شێوە
١٢٨. تەوقێ خوە ژ من بقەتینە: هێڤیا خوە ژ من ببرە
١٢٩. تەولە: جهێ خومدیکرنا چێلەکان
١٣٠. تەومکەلی: هەما وسا
١٣١. تەیاخ کرن: تابا خوە ئانین
١٣٢. تەیاخکرن: بەرخومداین
١٣٣. تەیلان: بەژنا زراف
١٣٤. تەیەمیش کە: تابا خوە بینە
١٣٥. تەییسی: چەلمسی
١٣٦. توتار: حال
١٣٧. تووسز: خۆرت ، جوان
١٣٨. توولە: جەورکێ کووچکان
١٣٩. توونسز: تووسز
١٤٠. تۆ: قەیماق، قەیماخ
١٤١. تۆتک: بسکویت
١٤٢. تۆتۆ کرن: تونە کرن
١٤٣. تۆخاڤک: قەیماخ
١٤٤. تۆرپێ پارسێ: تووڕێ پارسێ
١٤٥. تۆک: ئێلکتریک (رووسی یە)

١٤٦. تێبەردان: ژ دەست چوون
١٤٧. تیتال: خوەشک
١٤٨. تێتراک: دەفتەر
١٤٩. تێخنیکووم: پەیمانگەهـ (رووسی یە)
١٥٠. تێر و خورج: تێرا داڤێژنە سەر پشتا تاشا
١٥١. تیرێنج: تیرێژ
١٥٢. تێلی: پەڤەکە تایبەت ژبۆ مرۆڤا (تێلی حەمزە)
١٥٣. جان دبهێن، دبێژن جان: خوەش دبێژی خوەش دبهێ
١٥٤. جانەگا: گۆلکێ سێ سالی
١٥٥. جنوو دبن: جنا دکەڤن
١٥٦. جهان: جیهان
١٥٧. جەبرخانە: جهێ سیلەها خوەی دکن
١٥٨. جەرد: کەسێن ژبۆ تالانێ
١٥٩. جەلەب: شێوە
١٦٠. جەنگ و قال: شەر
١٦١. جەو: ئەرق، جۆک
١٦٢. جوهور: هەوز (تایبەتە ب ئاڤێ)
١٦٣. جۆل: خوەدی پەز جۆلێ شڤێنە
١٦٤. جۆلان: لاندک
١٦٥. جێر: جێرێ ئاڤێ
١٦٦. جێرگە: سرە، دۆرە
١٦٧. (صف، رتل): جێرگە: رێز
١٦٨. چاپ: پیڤان
١٦٩. چارخێ خوەبێخە: پێلاڤا کو خەلکێ ب خوە ژ چەرم چێدکر
١٧٠. چارسووێ: بازار
١٧١. چارنکال: چارئالی، چار دۆر
١٧٢. چاڤگرتنۆک: چاڤ ڤەشرتۆنەک، یاریەکە زارۆکان
١٧٣. چاڤێن خوەلێ جونو دکە: ئاوران بەردیێ
١٧٤. چرپیک: جێرگەهـ
١٧٥. شلال: چرچرک: سۆلاڤ، تاڤگە

١٧٦. چڤانه: خارۆ مارۆ

١٧٧. چق: شقن، لق

١٧٨. چقل: لق، چق، شقن (بەشەکە دارێ یە)

١٧٩. چکل: قولچ، قونج

١٨٠. چلا بوو: خوون لێ چوو، سپیچۆلکی بوو

١٨١. چلک: دلۆپ

١٨٢. چەرچری: زەحمەت دیتی

١٨٣. چەرچەرمنک: وەستیانا زێدە

١٨٤. چەعفنەبار: دەخەس، هەسوود

١٨٥. چەعفێ وان بێتەلپ: چاڤێن خوە ناقرپینە

١٨٦. چەکردار: کەسێ چێدکە

١٨٧. چەگیلکرن: بەرەڤکرنا کەڤران ژ ناڤ زەڤی

١٨٨. چەلتە: جەنتە

١٨٩. چەمل: قولپ (قەلپا کاسێ)

١٩٠. خرمشە: چەنجک: نەعیرچەک، خرمشاندن

١٩١. چووکتیێ: زارۆکیێ

١٩٢. چوومکەر: تەرزی

١٩٣. چیدار: قەید، ژبۆ گرێدانا لنگان

١٩٤. چیل: سپی

١٩٥. حزێمەت: گەلەک، پر

١٩٦. حژمەتکار: حەیری

١٩٧. حەزنگ ڕاهشت ب دلێ کوور: کەسەر کشاند

١٩٨. حەڤەک: هەنک

١٩٩. حەواس: کێف،

٢٠٠. حەیر: حژمەتکار

٢٠١. حیت: کەڤرێ مەزن

٢٠٢. خاس: باش

٢٠٣. خاس باخ: پارک

٢٠٤. خاشخاشک: شێوەیەکە کولیلکانە

٢٠٥. خالیچە: خالی

٢٠٦. خريال: جلێن کەڤن
٢٠٧. خزین کەتە دەنگێ وی: دەنگێ وی هاتە برین
٢٠٨. خشمشک: تشتێ بەدەوە رەنگ رەنگی
٢٠٩. خک و خالی: تشت لێ نەمایە، ڤالا یە
٢١٠. خلمەت: کەڤن
٢١١. خنێ: رازیبوون
٢١٢. خەپەخەپ سەر خەزالێدا بگرە: ب دزی خەزالێ بگەر
٢١٣. خەرقەو کولک: نیشانێن ئۆلا ئێزدیان
٢١٤. خەرقی: هەشێ وی چوو
٢١٥. خەڤخەڤک: (بەرغەبەبە)، چەرمێ قرتکێ مەریان کو دادلقە
٢١٦. خەلات: جۆرەیەکە جلانە، د مالێ دە ل خوە دکن
٢١٧. خەلکێ ئاسێ پێ متاکی: خەلکێ کو کەتنە جهێ اسێ تو دێ رزگار بکی
٢١٨. خەنیم: دژمن
٢١٩. خەوا هنگۆرێ: خەوا بەری بەربانگێ
٢٢٠. خەوخی: تێر خەو نەکی، خەو پێرە مایە
٢٢١. خەولەبوون: دوورکەتنا ژبۆ تشتەکی ڤەشارتی
٢٢٢. خەونەرۆژک: تشتێن بەر چاڤان
٢٢٣. خەیسەت: تایبەتمەندی
٢٢٤. خەییرین: بەدرەنگ بوو
٢٢٥. خودیکێ: نەخوەشیا دەروونی (دپرێسیۆن)
٢٢٦. خوششین: شێوەیەکی دەنگانە (خوشینا ئاڤێ)
٢٢٧. خومام: مژا سڤک
٢٢٨. خوە قنجلاند بوو: خوە کوڤاشتبوو سەر هەڤ، خوە کۆمە سەر هەڤ کربوو
٢٢٩. نقی، صافی: خوەروو:
٢٣٠. خووت: راست، هەما وسا
٢٣١. خۆزان: عەردێ پشتی چنینێ
٢٣٢. خیزگە: قووم، چەولم
٢٣٣. خێلەک: دەمەکە کورت
٢٣٤. خێلەوەعدە: بەشەکی دەمێ
٢٣٥. خێلی: هێزال، پۆشیە سەر چاڤێ بووکێ

٢٣٦. خەزمڤ: خەزمب
٢٣٧. د بەژنێ دەنیڤچەبوو: ئەو کن بوو
٢٣٨. دادان: دەری دادان، دەری کلیت کرن
٢٣٩. دارێ باخا تەزە نکاندنە: دارێ باخا تەزە چاندنە
٢٤٠. دارێ چام: جۆرەکا دارانە
٢٤١. دارێ ئالووچە: دارێ هلووکێ
٢٤٢. داشناک: ئەندامێ پارتەکا ئەرمەنی
٢٤٣. داکوتا: دەڤەرەک
٢٤٤. دپۆنژە: ڤەمراند، تەمراند
٢٤٥. دتەلییان: دەمەلسیان
٢٤٦. دجەداند و دچوو پر مەزیل: خوە دێشاند و رێەکە درێژ دچوو
٢٤٧. دخەشبینە: ژ هەڤ دخینە، هلدوەشینە
٢٤٨. درۆزە: قەولەکە ئۆلا ئێزدیان
٢٤٩. دسەقرە: بێ دەنگ و لڤین دبە
٢٥٠. دشوولکن: دشمتن
٢٥١. دلڤەرۆت: دل ئێشاند
٢٥٢. دلق: رەنگ ، شێوە
٢٥٣. دلنیایی: دلێ ڤەکری
٢٥٤. دلهاڤێژی: داخوازا قەنج
٢٥٥. دلەمە: لەمەلەمە
٢٥٦. دنچینەوێ: دقومینە وێ
٢٥٧. دنکسی: ڤەدلکومی
٢٥٨. دها: ئێدی
٢٥٩. دەخمە: داغمە
٢٦٠. دەخەسی: چەڤنەباری
٢٦١. دەردان: هەست
٢٦٢. دەرسخانە: ژۆرا خواندنێ
٢٦٣. دەرگەڤان: کەسێ بەر دەری پاقژ دکە.
٢٦٤. دەرگیلک: قاپاق، ژبۆ داخستنا دەڤێ برۆشان
٢٦٥. دەعن: دەمەکە دیار نموونە (دانێ سفێ، دانێ ئێڤارێ)

٢٦٦. دەفین: مەزن

٢٦٧. دەڤرا: دەرڤا

٢٦٨. دەڤنانۆس: بێ سەدسالا

٢٦٩. دەکەک کرییە: فێلەک کریە

٢٧٠. دەگمە: دەگمەن

٢٧١. دەلغ: چەکمەجە

٢٧٢. دەنگ گشک د ناڤ خودە بشکاڤتن: .... خوە دە ونداکرن

٢٧٣. خرمش حتی النزف: دەرشاند: دخەرمشاند خوون ژێ دانی

٢٧٤. دەوس: جی

٢٧٥. دەی لێ دکن: گازی دکنێ، هشیار دکنێ

٢٧٦. دهێڤشاند: سێڤکرن بـ (ئنگلیزی)، بکار نە ئانین، دەربا هێڤشاندی نە یا خوە یە

٢٧٧. دهێڤشینن: دکارن بکن لێ ناکن

٢٧٨. دوشورمیش بوون: فکراندن

٢٧٩. دومەقەسک: بالدارەکە

٢٨٠. دوناڤ: شێخ و پیر

٢٨١. دومکلاندن: دوبارەدکرن

٢٨٢. دووزان: شەفرە (ژبۆ ریش تاشینێ)

٢٨٣. دۆرگەر: هەڤێ دەستکر، سەتەلایت

٢٨٤. دۆشەکا خاستووکی: دۆشەکا روویێ وێ مەخمەر

٢٨٥. مشهد: دیدەم: دیمەن

٢٨٦. دێران: رەبەن

٢٨٧. دێم: روو

٢٨٨. دینج: ئاشت

٢٨٩. دیهار: دیار، ئاشکەرە

٢٩٠. دەبر دولک: خوارنا مرۆڤ و لاوران

٢٩١. ڕابەر بکە: بدە ناسکرن

٢٩٢. ڕاقەتاندن: بەری دایێ، قەتاند

٢٩٣. ڕاکێت: مووشەک

٢٩٤. ڕساس: بێ لڤین لبات

٢٩٥. ڕەعور: شێومیەکە روحبەران

٢٩٦. ڕەملدار: کۆچەک
٢٩٧. ملون: ڕەنگ-رەنگی:
٢٩٨. ڕەوش: خەمل، حال
٢٩٩. ڕوساس: جی دە ساربوون
٣٠٠. ڕوکونبا (رکنڤا): ژ بنی ڤە
٣٠١. ڕوونشتووک (ڕوونشتۆک): کورسی
٣٠٢. ڕۆبەت: تشتەکی شەرم
٣٠٣. ڕۆزگەر: وەرز
٣٠٤. ڕۆژ نەدیر ددە: رۆژ دەردکەڤە
٣٠٥. ڕۆژا لەعدێ: رۆژا یەکشەمێ
٣٠٦. ڕێڤۆلیووسیا: شۆرش
٣٠٧. ڕێنجبەر: شڤان، گاڤان، بەرخڤان.....
٣٠٨. زار و زێچ: زار
٣٠٩. زارین: زارە زار
٣١٠. زاڤۆد: کارخانە (رووسی یە)
٣١١. جرف: زانگ: کەڤرێن مەزن ل بەرپالا چیێ
٣١٢. زانگوو: ناڤێ چەمکی یە
٣١٣. زبارە: کەسێ کو تێن الیکاریێ
٣١٤. زڤێر: ژێ ئاجزبوون
٣١٥. زلک: دەرکێ زراڤی بچووک
٣١٦. زەرا: شکەفت
٣١٧. زەغل (زەخم): خورت، بهێز
٣١٨. زوور: قاندرمە، دەرمجە
٣١٩. زۆق: بایێ هێنک
٣٢٠. زۆمە: کۆما رەش کۆنان
٣٢١. زیپک: گژلۆک، تەیرۆک
٣٢٢. زیتۆلەک: بەشەکی کێمبەر ژ قوماش، ئەرد، چەرم.....
٣٢٣. زێراندن: زولم لێکرن
٣٢٤. زێن: زیرەکی
٣٢٥. ژ خافل دە: ژ نشکا ڤە

٣٢٦. ژ زەڤتا من دمرە: ژ شیانا من مەزنترە

٣٢٧. ژار: زعیف

٣٢٨. ژبارتن: هلبژارتن

٣٢٩. ژەعردادایی: ب ژمحرێ کەتی

٣٣٠. ژیان خوین بوو: ژیان گەلەکی دژوار بوو

٣٣١. سالخ: بەحس، نووچە

٣٣٢. سالدات: سەرباز

٣٣٣. ساو: ترس

٣٣٤. ساو: ترس

٣٣٥. سپ-سلامەت: نە نەخوەش

٣٣٦. سپیچال: قوماشێ دافێژنە سەر دۆشەکێ

٣٣٧. سپیچۆلکی: بەنگز لێ قەتیە، رەنگ لێ نەمایە

٣٣٨. أستغفر الله: ستاخولا:

٣٣٩. سرافەت: زانەبوون، زیرەکی

٣٤٠. سرنیک: بەشەکا عەرەبێ یە

٣٤١. ممر: سڤدەر: کۆریدۆر

٣٤٢. سڤەترێ: بزۆر کەتنا هوندور

٣٤٣. السنبل المقطوع حديثاً: سملا درووتی:

٣٤٤. سمێلێ تەنکە پالک: سمێلێن زراڤ و نەرم

٣٤٥. سنجری: گەلەکی گەرمبووی

٣٤٦. سندرووک: تابووت (کو پێ مریا رادکن)

٣٤٧. سەرفنیاز: سەرفراز

٣٤٨. سەرقۆت: سەرێ ڤەکری

٣٤٩. سەرگدان: سەرگەردمن (شاشیا چاپێ یە)

٣٥٠. سەرمدەری ژێ دمرناخم: ژێ فام ناکم

٣٥١. سەریک هەیە، ئەڤ ئۆغرە: چ دبە بلا ببە

٣٥٢. سەفا: تشتێ ب مرۆڤان خوەش بێت

٣٥٣. سەمتەکە بلنجی: جهەکی بلند

٣٥٤. سەوس بوویە: گێژ بوویە

٣٥٥. سەیرامیش: سەیران، گەر

٢٥٦. سور: سبا، سەر لە بەیانی
٢٥٧. سونەتخان: جهەکی ئۆلی یە
٢٥٨. سوودیا: دادپەروەر (رووسییە)
٢٥٩. سووراڤێلک: بالدارەکە
٣٦٠. سۆسرەت: پیس، عەجێب
٣٦١. سۆڤەکاری: مەلەڤانی، ئاڤجانی
٣٦٢. سۆمەر: ژمار
٣٦٣. سێڤان: ناڤی گۆلێ
٣٦٤. سیمر: بالندەیەکە
٣٦٥. سێوراندن: ئەراندن
٣٦٦. شاییشا نەکشینە: خەما نەخوە
٣٦٧. شپووک: درندە
٣٦٨. شپییا: لسەر پیا
٣٦٩. شرق: شرۆڤە
٣٧٠. شڤدار و بەرشڤک: چۆ و شڤک
٣٧١. شڤێت: وەک، نۆلی، مینان
٣٧٢. شکاف: سەکرەتۆن
٣٧٣. شکلکێش: شێوەکار
٣٧٤. شلعەت: فلە، مەسیحی
٣٧٥. شلی شۆیی: باران
٣٧٦. شنگین: دەنگێ تشتەکی دکە شنگین
٣٧٧. شەلبک: قەدەحا ئاڤا ڤەخوارنێ
٣٧٨. شەمال: مەشخەل
٣٧٩. شورەت: زانە
٣٨٠. شووتک: گلێزێ دەڤێ زارۆکان
٣٨١. شۆڤ دکە: ئەردێ شۆڤ دکە، دکۆلە
٣٨٢. شیرقین: دەنگێ خورت
٣٨٣. شێرێ چارگورچکی: مرۆڤێ بێ ترس
٣٨٤. شێلوو: ئاڤا گەمار، نە زەلال
٣٨٥. شێمیک: شیمیکا دەری

٣٨٦. عەبوور: ئابوور
٣٨٧. عەفات: مێرخاس
٣٨٨. عەوتەر: سەودەسەر
٣٨٩. فاتەرەشک: کەزەبا رەش
٣٩٠. فردن: بفرن
٣٩١. فرقاز کر: بانزددا
٣٩٢. فرقی: جهێتی
٣٩٣. فرناخ: قورەبوون، قورناسبوون
٣٩٤. فرندە: بالەفر
٣٩٥. فرندەچی: پیلۆت، کەسێ بالەفرێ داژۆ
٣٩٦. فرێقەت: ئازا
٣٩٧. فند: چرا
٣٩٨. فەروار: فەلەک
٣٩٩. فەند: فەن
٤٠٠. فێرزی: مێرخاسی
٤٠١. فیق: پیک
٤٠٢: فینا: فەنان
٤٠٣. ڤکڤالا: جهێ بۆش
٤٠٤. ڤەدروت: چنینا ب دەستا
٤٠٥. ڤەرێ کرن: ئەو قوماشێ کو دادنن سەر دۆشەکێ ژبۆ لسەر خەو بکن و
٤٠٦. ڤەژاندن: ڤەکۆلین
٤٠٧. ڤەلەزاندن: پالدان
٤٠٨. ڤێدرۆ: ساتل
٤٠٩. ڤێساند: ڤەمراند
٤١٠. قاتخ: ماست
٤١١. قاخ: چالا سەر کەڤرا کو ئاڤ تێدە بەرەڤ دبە
٤١٢: قارا: شەرم
٤١٣. قاس: دەم
٤١٤. قاف: قاب
٤١٥. قالم: ستوور، قالنگ،

٤١٦. قام و قاناته: بەژن و بال، سەربلندی، کوباری
٤١٧. قان و قیپ-سیپ: تشتێ هەری خراب
٤١٨. قر: شوونا کەڤر لێ پر
٤١٩. قراڤ: خوناڤ
٤٢٠. قرمه: دامانجه
٤٢١. ڨل: قلافەت: سی
٤٢٢. قلێر: گەمار
٤٢٣. قنێت: ماتێریا
٤٢٤. قەپەچە: حەمێزکرنا توند
٤٢٥. قەراتوو: قەرانتی
٤٢٦. قەریال: جلێن کەڤن
٤٢٧. قەرفیسکا ڕوونشتی بوو: ئاوایەکە ڕوونشتنێ یه، چنچکان
٤٢٨. قەرقاش: سپی، گەور
٤٢٩. قەرەفات: بەژن و بال
٤٣٠. قەرەفیسک: شێویەکە ڕوونشتنێ
٤٣١. قەرەول: نۆبەدار
٤٣٢. قەشەنگ: چەلەنج
٤٣٣. قەلاخێ: کۆمێ ژ سەرگینان هلژمنی
٤٣٤. قەلپێ: دل، (ب واتەیا نه ڕاست ژی تێ)
٤٣٥. قەلسی: جرفی
٤٣٦. قەلف: کۆم، ڕەف
٤٣٧. قەلن: قەلوون
٤٣٨. قەلن: قەلوون
٤٣٩. قەمەر: ڕەش
٤٤٠. قەمە: وەک خەنجەرێ یه لێ هنەکی مەزنتره
٤٤١. قەنترما: هەژمارا قانتران
٤٤٢. قەواز: خزمەتکار
٤٤٣. قەوخە: شەرێ گران
٤٤٤. قەوزەک گول: دەستە گول
٤٤٥. قەیدێ گیزمێ: قەیدەکە گۆڤەندێ یه

٤٤٦. قودووم کەت: بێزار بوو
٤٤٧. قرص: قورچماندن: قورچاندن
٤٤٨. قورلخیێ: تەنگاسی
٤٤٩. قورن: سەدسال
٤٥٠. قورە: ژ خوە رازی یە، خوە دبینە
٤٥١. قولاپ: دوویێ جفارێ دکشینن هوندورێ خوە
٤٥٢. قولبە: هەر چار قولبێن دنێ
٤٥٣. قولچەک: کونجک، قونجک، قوززیک
٤٥٤. قولخ: خزمەت
٤٥٥. قولخکرن: خزمەتکرن
٤٥٦. قولنگ: بالدارمکە
٤٥٧. قومسی نەمام: کەسێ بوخدان بێژ
٤٥٨. قۆت: سەری، جهێ هەری بلند
٤٥٩. قۆچاخ: ژیر
٤٦٠. قۆرخ: جهێ پاراستی
٤٦١. قۆلیتک: جهەکی بچووک
٤٦٢. قیزێ کەزی: کەچا گهیشتی
٤٦٣. قیمەتلوو: بنرخ
٤٦٤. کاپێک: (کۆپێک) پەرێ هوور یێ رووسا
٤٦٥. کاتۆشکە ئاڤێ: ساتلا ئاڤێ
٤٦٦. کادە: گەتۆ
٤٦٧. کارڤانسەرە: جهێ کو کاروان لێ دهێورن
٤٦٨. کالان: قابا شوور
٤٦٩. کالێ زماندمر: کالێ تەمەن درێژ
٤٧٠. کام: ئاموورمکە پێ ساپ دکوتن
٤٧١. کانجیلەر: ئۆفیس، دایرە
٤٧٢. کانفێت: شیرنایی
٤٧٣. کانڤێرت: زەرف (رووسی یە)
٤٧٤. کاو: خوەشک، جوان
٤٧٥. کبیر: هەتا هەتایی، پیرۆز، مەزن

٤٧٦. كراسگوهێرین: مرن
٤٧٧. كركاش: بع ئەردێ ڤە كشاندن
٤٧٨. كركووت: مادەیەكە كیمیایی یە S
٤٧٩: كرێ قاهوێ دهاتنێ: دخوازە قاهوێ ڤەخوە، پێلێ قاهوێ ددایێ
٤٨٠. كزین: كزین ژ دل تێ
٤٨١. كمكمی بوو: تژی بوو
٤٨٢. كنێز و ئۆمد: كەچێن خزم
٤٨٣. كەدەر: دەرد ، كول
٤٨٤. كەرد: كێرت
٤٨٥. كەرەنگ، سپنگ، گزێر: جورەیێن گیهایێ نە
٤٨٦. كەسری: وەستیایی، ماندووبوویی
٤٨٧. كەڤتار: گەلەك پیر
٤٨٨. كەڤرێد هەستەئاگر: چەقماق
٤٨٩. كەڤەر: سپی، گەور
٤٩٠. كەڤۆتك: كەڤۆك، كۆتر
٤٩١. كەلەك: دەرد و بەلا
٤٩٢. كەوشەن: زەڤی
٤٩٣. كەوكی: ئاوای ئاڤێتنێ
٤٩٤. كەوگری: گری هێدیكا، گریا د هوندور خوە دە
٤٩٥. كوتاسی: داوی
٤٩٦. كورن: ژ كەڤرە، جهێ ئاڤێ یە
٤٩٧. كولفك: كونێ تەندووریٚ ژبۆ كو بابلیزە
٤٩٨. كولهاجەت: شەروود
٤٩٩. كولەشا زل: كۆما زلكان
٥٠٠. كولەك: كونەك بانێ خانی دە ژبۆ رۆناهیێ
٥٠١. كولین: جهێ روون، پەنێر و ماست داتینن د بن كۆن ' د
٥٠٢. كووچە: كۆلان
٥٠٣. كوورم: كوورا ئاگر
٥٠٤. كووڤی: بەژی
٥٠٥. كوولاك: گوندێن دەولەمەند دەما سۆڤێتێ

٥٠٦. کۆتەل: ڕێورەسمەکە شینێ یە
٥٠٧. کۆتی-شندۆکێ: مێرێ نە تشت
٥٠٨. کۆچەک: ڕەملدار، فەعلچی
٥٠٩. کۆخ: کۆخێ بچووک
٥١٠. کۆرایی سەڤا دلێ تە: پەیڤا کو ژبۆ سەرخوەشیێ تێ گۆتن
٥١١. کۆلۆز: کولاڤێ سەرێ مێران، کومێ سەرێ مێران
٥١٢. کیلەر: عەمبار
٥١٣. کێلەندی: تریان
٥١٤. گاستین: کادین، جهێ مێڤانان
٥١٥. گالەگال: پەیڤاندن، سوهبەت، ئاخافتن
٥١٦. گرە گرێ گوندن: مەزنێن گوند
٥١٧. گەردوون: سروشت
٥١٨. گەڤەز: سۆرێ ڤەکری
٥١٩. گەم: هەڤسار
٥٢٠. گەنمێکرک: شێومیەکە گەنمە
٥٢١. گەورەسیسە: سپی
٥٢٢. گەولەز: پنجارا خوارنێ یا هوونایی
٥٢٣. گورێخ: کووچکێ کو دکارە گوران بخەنقینە
٥٢٤. گوڤە: یانێ
٥٢٥. گوڤە: یانێ
٥٢٦. گوکەرچین: بالدارەکە
٥٢٧. گولۆل بووم: هۆل بووم
٥٢٨. گوهێر: جهێ کو پەز ب شەڤ لێ دهێورە
٥٢٩. گۆر ب گۆر کر: ژ گۆرەکێ دەرخستن برن گۆرەکێ دنێ
٥٣٠. گۆرز: گورزێ گیهایێ
٥٣١. گۆشە: کۆشە
٥٣٢. گۆڤەک: شوونەکی فەرەهـ،
٥٣٣. گۆم: جهێ خوەدیکرنا پێز
٥٣٤. گیرۆ: مژوول
٥٣٥. گێزی: سبرگەهـ، کسک

٥٣٦. کێژگەرینگ: جهێ کو ئاڤ لێ لهەڤدزێڤره
٥٣٧. گیگانت: ئەژدها
٥٣٨. گیهادروون: ژبۆ چنینا گیها
٥٣٩. لَ قەراخێ بازێر: ل پەرێ بازێر
٥٤٠. لاپ: هەری، گەلەک، زێدە
٥٤١. لاقردی: حەنەک
٥٤٢. لال-دور: کەڤرێ گران بها
٥٤٣. لباس و مداس: جل و پێلاڤ
٥٤٤. لپات: لڤین
٥٤٥. لەتان و زمندە: بەشێن لاشێ مرۆڤێ
٥٤٦. لەج: پێشبرکێ
٥٤٧. لەعزەک: دممەکە کورت
٥٤٨. لەلێ: قەید
٥٤٩. لەوز: زار، زمان
٥٥٠. لەیلان: شێوەیەکی داران
٥٥١. لوبوودچی: ئەوێ ژ لڤاییێ کولاڤێ چێدکە
٥٥٢. لووباندن: لۆرین
٥٥٣. لۆدکە: کەلەک
٥٥٤. لێکسیا: گۆتارا مامۆستاییێ زانکۆ (رووسی یە)
٥٥٥. لێ-لێ بوون: دخواستن
٥٥٦. ماشین: ترێن
٥٥٧. مالا خەزێنێ من: مالا کو من تێدا کار کریە
٥٥٨. مخ: میخ، بزمار
٥٥٩. مداس: پێلاڤ
٥٦٠. مرۆڤێن تاوی، باوی: نەخوەشیێ رۆماتیزم، (با)
٥٦١. ملاهیم: نەرم
٥٦٢. من بادەژی ژ تەپرسی: گەرمکە من ژ تە نە پرسیا
٥٦٣. منترێ: ژ منە
٥٦٤. منمنیک: پەپوولە
٥٦٥. مەتەل: شاش مای

٥٦٦. مەخسووس: بزانەبوون

٥٦٧. مەرەک: کادین

٥٦٨. مەسلهەت دکرن: دپەڤین

٥٦٩. مفر: مەفەر:

٥٧٠. مۆرگێ: لاتینی یە، جهێ کو مریان لێ داتینن

٥٧١. میاسەرکرن: پێک ئانین

٥٧٢. مێشە: دارستان

٥٧٣. مێلادێن گەش: شەمدان

٥٧٤. میلیسیا: پۆلیس

٥٧٥. میياسەر: پێک ئانین

٥٧٦. ناڤسەرە: کال و پیر، تەمەن مەزن

٥٧٧. ناڤکێلکا زراڤ: ناڤا زراڤ

٥٧٨. ناڤێ هاینێ جار-جارا هلددن:

٥٧٩. نامل: ناڤ ملا

٥٨٠. ناندروون: چنینا ئەکن

٥٨١. نانێ لاڤاش: نانێ تەنک

٥٨٢. نتری: خەملی

٥٨٣. نچ: ئالی

٥٨٤. نخامتن: ڤەشارتن

٥٨٥. نڤات: لۆرین

٥٨٦. نقۆدبوون: دکەڤە بن ئاڤێ

٥٨٧. غرز: نک کر:

٥٨٨. نمز: نزم

٥٨٩. نمز: نزم

٥٩٠. نمووش: نموونە

٥٩١. نەبان: میا نەبان: میا کو بەرخا خوە ناپەژرینە

٥٩٢. نەدمر: بێمێ خوەش

٥٩٣. نەردەوان: پێپەلینگا داری یان هەسن

٥٩٤. نەعتک: ئەنی

٥٩٥. نەلەت: نەعلەت

٥٩٦. نەنەرە دکرن: تشتێن خراب دکرن
٥٩٧. نەیسەیی: هنەکی
٥٩٨. نوخوری: زارا یەکەمین
٥٩٩. هاتە ڕایێ: دەست دا
٦٠٠. هاسلەت: داهاتا مادی (نە پەرە، وەک گەنم ، نیسک ، پەنێر
٦٠١. هاسێگەهـ: ئاستەنگ
٦٠٢. هاهانگا: زوو زوو
٦٠٣. هرچکا کەلەما: خوارنەکە ژ کەلەما تێ چێکرن
٦٠٤. هزنگەک دا خوە: بگرانی ژ جهێ خوە رابوو
٦٠٥. هشبوون: بێ دەنگی
٦٠٦. هلبری: بلند کر
٦٠٧. هلپارکی: بەر ب ژۆر چوو
٦٠٨. هلدبرین: هلدان ژۆر
٦٠٩. هلدقۆشینن ژۆر: داڤێژن ژۆر
٦١٠. هلگەرن: هەرن ژۆر
٦١١. هنگاڤت: کەلەک باندۆر کر
٦١٢. هنگێ: وێ دەمێ
٦١٣. هەچە: نچک
٦١٤. هەداد: هەسنکر
٦١٥. هەرڤاز: هەڤراز
٦١٦. هەرەم کرییە: حەرام کریە
٦١٧. هەستوونگ: ئەستوو
٦١٨. هەسنی: عەشیرەتەکە
٦١٩. هەسین: د خەمێ تشتەکی دە
٦٢٠. هەڤراز: کاش، بەر ب ژۆر
٦٢١. هەڤسوودی: چەعڤنەباری
٦٢٢. هەلا: ڤێ کاڤێ
٦٢٣. تحریچ: هەلاندایین: هاندان
٦٢٤. هەمانگی: هندکی
٦٢٥. هەمین: بێ گومان

٦٢٦. هەی: جارنان
٦٢٧. هەیدادە: هێورزە
٦٢٨. هەینەسە: چاوا بوو
٦٢٩. هولکومی: هێرس بوو
٦٣٠. هونور(هنر): شیان، توانە
٦٣١. هووردەم: خولەک، چرکە
٦٣٢. هۆتاخ: پەیڤەکە ئەرمەنی یە
٦٣٣. هۆری: پەری، پێری، فریشتە
٦٣٤. هێت: رەن
٦٣٥. هێچ: نە تشت
٦٣٦. هێژە: هێژا
٦٣٧. هێسا: بێ جەفا
٦٣٨. هێسابوون: رحەتبوون
٦٣٩. هێکەل: بەشەکی رەختێ ژنان
٦٤٠. هیملی: بنگەهێن
٦٤١. هێن: دەوران
٦٤٢. هێورگەهـ: راوێستگەهـ، جهێ سەکناندنێ
٦٤٣. هێوەرزە: قارەقار، دەنگێ بلند
٦٤٤. هەرکێ: هەگەر
٦٤٥. وەکی: ئەگەر
٦٤٦. ئابۆز: کاروانا کامیۆنێن مەزن، ترێن (رووسی یە)
٦٤٧. ئاپنجییێ: شێومیەکە جلانە
٦٤٨. ئاچخی: سەرکەفتن
٦٤٩. ئاخل: جهێ پێزە، ژ کەڤران هلدژمنن
٦٥٠. ئاخلێقە: دەستپێکا بهارێ
٦٥١. ئادانی: زێدە
٦٥٢. ئاران: گەرمیان
٦٥٣. ئارتیست: هونەرمەند
٦٥٤. ئارخاین: بێ منەت
٦٥٥. ئاریک: سەقف، بن میچ

٦٥٦. ئاسپیرانتوور: خواندنا دکتۆرییێ
٦٥٧. ئاسپێژخانە: مەتبەخ، خوارنگەهـ. چیشتخانە
٦٥٨. یاش: تەمەن
٦٥٩. ئاشپێژخانە: مەتبەخ
٦٦٠. ئاڤتۆ: ئۆتۆمۆبێل، سەیارە
٦٦١. ئاقا: ئەوقاس
٦٦٢. ئال: سۆر
٦٦٣. ئالتبوون: شکەستن
٦٦٤. ئالتندار: سەرکەفتی
٦٦٥. وضع مقبض السیف علی صخرة مستویة: ئالێ قەڤزێ دا سەر سطەکی:
٦٦٦. ئام و تام: ئەو کەسێ بێ گونەهـ
٦٦٧. یانگا وی: یا وی
٦٦٨. ئانەگۆر: لگۆر وێ
٦٦٩. ئانووشاڤان: ناڤەکی ئەرمەنی یە
٦٧٠. ئاهل: کال (بەرووڤاجی جاهل)
٦٧١. ئایلخ: مووچە
٦٧٢. ئرنەکی ئوسا هاتێ: هێرس سەر دێمێ وی دیار دبە
٦٧٣. ئنێ: دایک
٦٧٤. ئەتب: شەرم
٦٧٥. ئەختەر: ماف
٦٧٦. یەکشڤێتی: یەک جورەی، مینان هەڤ
٦٧٧. موسم: ئەکن: هەسلەت
٦٧٨. ئەلەک دکن: هێلەک دکن
٦٧٩. ئەم شاییشا ناکشینن ژ تو کەسا: منەتا مە ژ کەسی تونە
٦٨٠. ئەم گوجلینە: مە جهێ خوە گرتیە
٦٨١. ئەمێ بچرپینن: ئەمێ بچنن
٦٨٢. ئەو لنگ عەوارمنە: ئەو لنگ گەرۆکن
٦٨٣. ئەوی خومدانەدانی: ل خوە مکور نە دهات
٦٨٤. ئوورس: رووس
٦٨٥. (غرفة): ئۆتاخ: ژوور

٦٨٦. ئۆچێرک: گۆتار (رووسییه)
٦٨٧. المقصود به النبي أيوب الذي ورد ذكره في القرآن الكريم: ئیبۆیێ کورماخواریٚ: ئەیوویێ کورمان خواری
٦٨٨. ئیپیٚجه: هن مایه، کێم نینه، ئێپیٚ
٦٨٩. ئیتباری: باوەری
٦٩٠. ئیز و تۆز: رێچ، شۆپ
٦٩١. ئیزا ته: شۆپا ته
٦٩٢. ئیژا: ڤێ جاریٚ
٦٩٣. ئیساف: وژدان
٦٩٤. ئیسپهی: سپەهی
٦٩٥. الشهية: ئیشته: خواستنا خوارنێ یا مەزن
٦٩٦. ئێکران: بیانی یه، ژبۆ قوماشێ سینەما، شاشەیا تەلەڤزیۆن و کۆمپیوتەریٚ تێ گۆتن
٦٩٧. ئێگن: ئاکتیڤ
٦٩٨. ئێم: دەمەکە
٦٩٩. ئەگله کر: دەرهنگی خست
٧٠٠. خەزێن - (بنگەها پەیڤێ رووسی یه، ژ پەڤا خازیایین تێ) خوەدیمال، کەسێ کو ئووسڤێ بەکۆ د مالا وی ده کار کرییه.
٧٠١. سوود - دادگەه، مەهکەمه
٧٠٢. عەفراندن - بەرهەم
٧٠٣. ئوورسی - رووسی
٧٠٤. فۆرم - شێوه
٧٠٥. دۆرگەر - ساتێلاییت
٧٠٦. ئابۆز (گۆتنەکه رووسییه) - خوارن، چەک و سیلحێ ژ بۆ ئارتێشێ
٧٠٧. سالدات (رووسی یه) - سەرباز
٧٠٨. کەمیا ئاتۆمە-بووزبر- کەشتییەکه، کو ب هێزا ئاتۆمێ کار دکه. ب وێ جەمەدێ دشکێنن ئو ژ کەسشتیان رە رێئه ڤەدکن
٧٠٩. زانگوو - ناڤێ رووبار ئه ل ئەرمەنستانێ
٧١٠. کاناکێر گێس - ستانسیۆنا کو پ ئاڤێ ئێلەکتریکێ دستێن.
٧١١. یەکەختیار- خوەدییێ مافێ وەک هەڤ
٧١٢. کێنلوو- کەسێ کینه دکشینه
٧١٣. حەیفدار- کەسێ دخومزه حەیفه هلده، تۆله هلده

## سەرەجەم

### ئەم بەرهەمە تەنیا بۆ زمانە

ئەوەی لە نێوان توێیەلی ئەم بەرگەدا دێتە دیتن، کتێبێکی سەربەخۆ یان بابەتێکی سەربەخۆ نییە. کۆمەلێك بابەتی لەیەکتر جودا و لەیەکترەوە دوور، لەلایەن بنووسی جیاجیا و لە سالەیلی جیادا هاتوونەتە نووسین، کەواتە چییە گەلۆ؟

لە سەردەمی دەولەتی سۆڤیەتیدا، کورد پشکێکی بچووکی لە ماف بەرکەوت، ئەویش لە بواری زمان و ئەدەب و کۆوەکردنی کەلەپووردا. کەس نازانێ لە بیستەیلی سەتەی رابردووەوە تا کۆتای هەشتایەل چەند کتێب بە کوردی لەوێ دەرچووە، بەلام بە مەزەندە ٣٠٠ تا ٤٠٠ دەبێ. کوردی گشت پارچەیلی کوردستان، سوودێکی ئەوتۆیان لەو بەرهەمەیلە وەرنەگرتووە، بە تایبەتیش لەبەرئەوەی بە تیپی کیریلی هاتوونەتە نووسین. بە بۆچوونی ئێمە، ئەو گشت بەرهەمەیلە قۆناغێکی گرینگ لە نووسین بە زوانی کوردی پێك دەهێنن، رەنگە لە بەرهەمەیلی ناو توێی ئەم زنجیرەیەدا، زۆر کتێب و پەلکە هەبن نرخێکیان نەبێ جگە لە زوان. ئێمەش هەر زوانمان مەبەستە.


چاپخانەی ئاراس
هەولێر - کوردستان
Aras Press
Kurdistan - Erbil



